# له ڕەوت و ئایدۆلۆژیای ئیسلامییەوە بەرەو ئیسلامییە نوێیەکان

.......................................................................................

لەبڵاوکراوەکانی ناوەندی هزیی و ڕۆشنبیریی خاڵ و ئەنیستیتۆی نەتەوە بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری و سیاسی

- نووسینی: ئەبوبەکر عەلی
- بابەت: لێکۆڵینەوە
- دیزاین: ڕەوشت محەمەد
- نۆبەی چاپ: یەکەم
- چاپ: ناوەندی ڕێنوێن

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (١٦٦٣)ی ساڵی ٢٠١٧ پێدراوە

# ناوەرۆك

# پێشەكی:

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

رەوتی ئیسلامی كە لە بیستەكانی سەدەی رابردووەوە، وەك كاردانەوەیەك بەرامبەر بارودۆخی ئەو كاتە بە ڕوخانی سەڵتەنەتی عوسمانی سەریهەڵدا، بوو بە یەكێ لە تەوژمە فیكری و سیاسییەكانی ناوچەكە، قورسایی ئەم رەوتەش خرابووە سەر دووبارە گێڕانەوە پێگەی ئیسلام لە ژیانی موسڵماناندا، بەتایبەتیش لە كایەی سیاسییدا، سەرهەڵدانەكەشی هاوكات بوو لەگەڵ بڵاوبوونەوە و سەرهەڵدانی كۆمەڵێ ئایدۆلۆژیای گەورە و جەنگی جیهانی دووەم و ململانێ جیهانی و ناوچەییەكان و داگیركاری راستەوخۆی ئیستیعماری خۆرئاوا بۆ چەندین وڵاتی ئیسلامی.

هەموو ئەمانەش كەم تازۆر رەنگدانەوەیان بەسەر ئاراستە فیكری و سیاسییەكانی ئەم رەوتەوە هەبووە، بەڵام كۆپی هیچیشیان نەبووە، چونكە ویستوویەتی خۆی شتێكی جیاواز بێت، بەڵكو جیاوازێكی رەها بێت!! بە حوكمی خۆتێكەڵكردنی بە خودی ئیسلام و پێناسەكردنەوەی ئیسلامیش بە سیفەتی ئاینێكی هەمەلایەنە. پرۆسەی پێناسەكردنەوە و تێكەڵكردنی بە ڕێكخستن و ململانێ

سیاسییەکانیش، سەرەنجام سەری لـە بـە ئایـدۆلۆژیکردنی ئیـسلامەوە دەرچوو، ئایدۆلۆژیایەك كە لە ڕوانگەی داڕێژەرانییەوە نەك هەر وەڵامی هـەموو پرسـیارەكان دەداتـەوە، بـەڵكو خـۆی بـە تاكـە رزگاركـەری مرۆڤایـەتی دەزانـێ لـەو ئـازارو ناڕەحـەتی و رووخاویـەی بـەهۆی ماددەگـەرایی شارسـتانێتی نوێـوە تووشـی بـووە. بەمانایـەكی تـر، ئایدۆلۆژیاكەش بە حوكمی تەماهییكردنی لەگـەڵ ئیـسلامدا هەمەلایەنـە بوو. لە ڕوویەكی ترەوە داڕووخـانی واقیعـی موسـڵمانانیش هەمەلایەنـە بوو.

بـەگوێرەی جیهـانبینی هـەڵگرانی ئایدۆلۆژیاكـەش وەك دواتـر لـە كتێبەكـــەدا دەیخوێنینـــەوە، كێـــشە و قەیرانـــەكانی شارســـتانێتی ماددیگەرایی نوێش، بەهۆی دووركەوتنەوەی لە رێنوماییەكانی ئاسمانو رۆچـوون لـە چـێژو هێـزو بەرژەوەنـدی پەرسـتیدا هەمەلایەنـە، هـەموو ئەوانەش ئایدۆلۆژیایەكی رزگاركەری دیسانەوە هەمەلایەنە، دەخوازێت، كە تەنها و تەنها لە ئایـدۆلۆژیای ئیـسلامی نـوێو ئیـسلامدا بەرجەسـتە دەبێـت، لەكاتێكـدا نوخبـە نوێكـان لـە چوارچـێوەی قـەوارە نوێكـانی ناوچەكەدا، بە لاسـاییكردنەوەی ئـەو شارسـتانێتییە و خۆرئـاوا، داوای لەیەكجیاكردنەوەی هەمەلایەنەی (ئاین) و (سیاسـەت) و (دەوڵـەت)یـان دەكرد.

وەڵامی ئەم دروشمو تێزەش لەلایەن رابـەرانو تێكۆشـەرانی رەوتـی ئیسلامی نوێوە، تێكەڵكردنی هەمەلایەنەی (ئاین) و (سیاسەت) و وەعز و كاری حیزبیو سۆفیگەری و وەرزش و كاروكاسبی و چـالاكی فیكـری

بوو لەچوارچێوەی ڕێکخراوێکی هەمەلایەنەدا؟! ڕێکخراوێك کە هیچ لە دەرەوەی خۆیدا بۆ هیچ کەس و هێزو بیروباوەڕێك بەجێ نەهێڵێت کاری لەسەر بکات و مانای پێ بدات و ئاڕاستەی بکات. دیارە ئەوەش ململانێی هەمەلایەنە بەدوای خۆیدا دەهێنێت، ئەم هەوڵەش لەکاتێکدا بۆ ئەوە بوو کە بیرۆکەی تایبەتمەندێتی (الخصوصیە) و ناسنامە هەموو کون و قوژبن و کایەیەکی ژیان و چالاکییەکی کۆمەڵایەتی بگرێتەوە، وە توانا و وزەو هێزێکی گەورە بە ڕێکخراوو ڕەوتەکە ببەخشێت، بە پێچەوانەی ئەم خواستەوە، سەری لە دووبارە بەرهەمهێنانەوەی هەمان سیستم بە هەندێ دەستکاری ڕواڵەتی و کەوتنە ناو ململانێیەکی قووڵ و دوورخستنەوەی ڕێگا و نامۆبوون لە هەندێ ڕووی دنیای سەردەم و نەگەیشتن بە ئامانجەکانەوە دەرچوو. درەنگکەوتنی بەخۆداچوونەوە و تێپەڕاندنی سەرەتا فیکرییەکانی ڕەوتی ئیسلامی و دووبارە پێناسەکردنەوەی چەمك و ڕۆڵەکان و خودی ئاماژەکانی ئیسلامی بوون، لەپاڵ درێژەکێشانی سایەی ڕەشی ڕژێمە نادیموکرات و سەرکوتکەرەکان لە زۆربەی جیهانی ئیسلامیدا، کارێکیان کرد کە وزەو توانایەکی زۆری گەلانی ناوچەکە بەفیڕۆبچێت، بەڵام ئێستا بە حوکمی کۆمەڵێ هۆکارو گۆڕانکاری لەبەردەم قۆناغێکی نوێداین، قۆناغێ کە مەسەلەی چاکسازی فیکری حەرەکیی نوێی تێپەڕاندووەو داوای دووبارە بیناکردنەوەی ئەو فیکرەو مژدە دەدات بە فیکرێکی نوێی سیاسی و دەعەوی، بە مانایەکی تر لەو سۆنگەوە کە ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ هەمەلایەنە بووە، دەبێت دووبارە بیناکردنەوەی

فیکرەکەش هەمەلایەنە بێت، لەپێناو تێپەڕاندنی گوتاری هەمەلایەنە خوازی لە فۆرمە کۆنەکەیداو گەیشتن بە ساتەوەختی لێکجیاکردنەوەی گوتارو چالاکییەکان و ڕێزگرتن لە سەربەخۆیی لۆژیکی کارکردنو سەرمەشقی کایە جیاوازەکان، لەوانەش کایەی (سیاسەت) و (بانگەوان)، کە تێکەڵکردنیان بەو شێوە هەمەلایەنە و وەك پێداویستییەکی خەملاندنی ئایدۆلۆژیایەکی ئیسلامی هەمەلایەنەی نوێ، بەیەکێ لە کێشە جەوهەرییەکانی ڕەوتی ئیسلامی لە قەڵەم دەدرێت.

هەربۆیە ئێمەش لەم کتێبەماندا هەوڵی ڕەخنەلێگرتنو شیکاری فیکری حەرەکی و ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ و دووبارە بیبیناکردنەوەی فیکریمان بە مەسەلەی دووبارە پێناسەکردنەوەی چەمکی (بانگەوان) و (سیاسەت) و سەربەخۆکردنیان لە یەکترو یەکتر تەواوکردنیان لە ئاستی کۆمەڵگەدا بەستۆتەوە، بەڵام مەسەلەکەشمان لەو چوارچێوەدا قەتیس نەداوە و کردوومانە بە بەشێك لە هەوڵێکی هەمەلایەنەتر بۆ نوێبوونەوەی فیکریو تێپەڕاندنی قۆناغی ئیسلامی سیاسی، چونکە ((ڕەوتی ئیسلامی لە بەشێ لە وڵاتانی ناوچەکەدا گەیشتونەتە بنبەستێکی فیکریو سیاسی، ئەوەش شۆڕشێکی فیکری دەخوازێت، ئەم دیدەش لە مەسەلەی جیاکردنەوەی بانگەوازو سیاسەت گەورەترە کە لە ئێستادا باسو خواسێکی زۆری لە بارەوە دەکرێت، دەبێت دیدێکی نوێکردەوە بێت کە چارەی کێشە ڕێکخستنە ناوخۆییەکان، تازەکردنەوەی فیکری، هەروەها پرۆژەیەکی خولقێنەر بۆ دەستو پەنجە نەرمکردن لەگەڵ واقیعو ڕوانگەیەکی جیاواز، وە تێپەڕاندنی

**هەموو ئەو هێڵە سورانەش بگرێتەوە کە لە رابردوودا کۆتو بەندیان بۆ دروستکردووە))[1].**

**لە کۆتاییدا هیوادارین کە ئەم کتێبەش بتوانێت ببێت بە بەشێ لەو تیۆریزەکردن (تنظیر) کردنەی تەوژمی ئیسلامی لە کوردستانو ناوچەکەدا پێویستی پێیەتی. بۆ ئەوەی هەر هێزێك هەنگاوی خۆبیناکردنەوەو سەربەخۆکردنی کایەکانی نەناوە بیهاوێتو ئەوەی ناویشیەتی، زیاتر بیچەسپێنێتو پاڵپشتی فیکری زیاترو قوڵتری بۆ پەیدا بکاتو تەنها بە دەستکەوتە مەیدانی و بڕیارە حیزبییەکان وازنەهێنێت.**

**٢٠١٦/١١/١٣**

**سلێمانی**

---

[1] اخوان سوريا (( أربع استراتيجيات لأعادة التموضع)) جزيرة نت، ٢٠١٦/١٢/٦

# فەسڵی یەکەم
# پەیوەندی نێوان بانگەواز و سیاسەت
# لە سەردەمی ( راشیدین )ەوە تاکو رەوتی ئیسلامی نوێ

بەیەکەوە گرێدانی مەسەلەی وەعزیو دەعەوی و دینییەکان، لە چوارچێوەی رێکخستنو قەوارەیەکی رێکخراوەیی حەرەکی ئیسلامیدا، مەسەلەیەکی (ئیجتیهادی)یە و پەیوەستە بە واقیعێکی مێژوویی‌و ژینگە و زەمانێکی دیاریکراوەوە. واتە شتێ نییە پیرۆز بێتو لە ئاسمانەوە دابەزیبێتو مرۆڤەکان لەبەردەمیدا تەنها ملکەچیان لەسەر بێت گەرچی بەداخەوە هەندێ جار مەسەلەکە بەو جۆرە وێناکراوە و دەکرێت.

ئەگەر چاوێ بە مێژووی موسڵماناندا بخشێنین، دەبینین پرسی ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان ئوممەتو دەسەڵاتو دەوڵەتو دینو سیاسەت، لەگەڵ ئەو سیستمە سیاسییەی پێویستە موسڵمانان شوێنی بکەون، جگە لە بەهاو بنەما گشتییە ڕێنیشاندەرەکان، بۆ موسڵمانان وەك کۆمەڵگەو کۆمەڵو دەستەبژێری دینی و سیاسی بەجێ هێڵراوە، واتە مەسەلەیەکی ئیجتیهادی بوو، ملکەچ بوو بۆ راوێژو مشتومڕو ڕێککەوتنی نێوانیان، بە حوکمی ئەوەی سەرجەم ئەم پرسانە بە گوزارشتدانەوەی قورئان سەر بە دنیای (أمر)ن، (أمر)یش، کە وشەیەکە لە قورئاندا بۆ ئاماژەکردن و گوزارشتدانەوە لە مەسەلە سیاسی و دەسەڵاتدارییەکانو پرسەکانی پەیوەست بە پەیوەندییەکانی هێز بەکارهاتووە، بەگوێرەی بنەماو لۆژیكو ئاراستەی قورئان خۆی، ملکەچی گۆڕینەوەی بیروڕاو شورایە: ﴿وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ﴾[1]. بە گوێرەی ئەم پێوەرو دیدگا قورئانییەش سیاسەتو کاروبارە سیاسییەکان، بە حوکمی گۆڕاو بوونو ناجێگیریو ڕێژەییبوونیان و تێکەڵاوبوونیان بە بەرژەوەندیو لایەنگیری پێکهاتەو گروپو هێزەکانەوەو پەیوەستبوونیان بە بەکارهێنانی هێزو بڕیاردانەوە، دەبێت لە فەزای گشتییدا بخرێنە ڕوو و گفتوگۆیان لەبارەوە بکرێتو ڕێککەوتنیان لەسەر بکرێت. بەدەر لەوە قۆرخکاریو پەراوێزخستنی خەڵكو سەرکوتو

---

[1] الشورى/٣٨.

ستەمیان لێ دەکەوێتەوە. هەموو دۆخێکی لەو جۆرەش پێچەوانەی ئامانجە فەلسەفییە گەورە و ئیلاهییەکانی سیاسەتن لە قورئاندا کە لە (دادپەروەری) و (اصلاح) و (گەندەڵیو ستەم دژی) و (کەرامەتپارێزی) و (شورا) و لایەنگیری بۆ توێژە نەدارو لاوازەکانی کۆمەڵگەدا خۆی دەبینێتەوە. ئەم تێگەیشتنە بۆ سروشتی سیاسەتو مەسەلەی (أمر) لای موسڵمانانی سەرەتای ئیسلام لە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەرەوە (ﷺ) ئامادەبوو، بۆیە وەك مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە پرسی ئەوەی کێ دەسەڵات لە قۆناغی نوێدا بگرێتە دەستو بۆشایی کۆچی دوایی پێغەمبەر (ﷺ) لەڕووی سیاسییەوە پڕ بکاتەوەو، چۆن بیگرێتە دەستو رەوایەتی لە کوێوە وەربگرێت، بووە بابەتی مشتومڕێکی گەرمی نێوان ئاراستە جیاوازەکانی نێوانیان، لەوانەش (کۆچکەران) و (پشتیوانان)ن. گەر سەیری مشتومڕەکانیان بکەین، دەبینین هەریەکەی یان بەڵگەی لۆژیکیو سیاسی بۆ سەلماندنی هەڵوێستی خۆی دەهێنێتەوە، (دەق) (تحکم) بەسەر هەڵوێستەکەدا ناکات. بە حوکمی ئەوەی (دەق) واتە قورئان وێنامان لەسەر جۆرێکی دیاریکراو لە سیستمی سیاسی نادات بە دەستەوە، چونکە جگە لە ئاستی بەها ڕێنیشاندەرەکانو ئەخلاقی سیاسی، خودا خواستی وابووە ناوچەی (أمر)، واتە کاروباری پەیوەست بە سیاسەت، ناوچەی چاولێپۆشراو (عفو)ی تەشریعی بێتو ملکەچی شوراو رێکەوتن بێت. هەر لەچوارچێوەی ئەم دیدەدا، بەردی بناغەی دەسەڵاتی (راشیدین) داڕێژرا. هەر لەوێشەوە سەرەتایەکی نوێ بۆ چۆنیەتی حوکمڕانی

موسڵمانان لەنێوان خۆیاندا پێشنیار کرا، کە دیارە بەو پێچەوانەی ئەوەی لە دواتردا ئەزموونی (راشیدین) کرا بە پێوەرێکی مەرجەعی نیمچە پیرۆزو لە هەندێ کاتیشدا بە شێوەیەکی خراپ بۆ ئامانجی پێچەوانەی حوکمڕانی خەلیفە راشیدەکان، بەکارهێنرا، میکانیزم و پێوەرەکانی ئەم قۆناغە و هاوەڵان و جێنشینەکان، سەرجەمیان دەچنە چوارچێوەی (اجتهاد)ی ئەو زانایانەی بۆ جۆری خۆڕێکخستنی سیاسیو بەدیهێنانی مەبەستەکانی (شەریعەت) و بەرژەوەندییەکانەوە بیریان کردۆتەوە، ئەزموونی (راشیدین) لەڕووی میکانیزمی شوراو قەوارەو بەشداریشەوە، لە مۆدێلی ئەو کاتەی کولتوری عەرەبیو ژینگە مێژووییەکە دەرنەچووە، بەڵکو هەمان میکانیزم بۆ ئامانجی جیاوازترو لە چوارچێوەی فەزای ئوممەتێکی لە حاڵی شکڵ گرتندا بەکارهاتووە[1].

لە بەشی یەکەمی ئەم ئەزموونەدا، واتە ئەزموونی راشیدین، واتە جێنشینی پێشەوایان (ابوبکر) (عمر)دا (ﷺ) بە کاریگەری گەرمی پاشماوەی هەناسەکانی پێغەمبەرێتیو بە گەرمی و سادەیی مانەوەی پەیام، سەرقاڵی بە جیهادو فەتحو فراوانکردنی قەڵەمڕەوی جیهانی ئیسلام و سادەیی کۆمەڵگەو پێکهاتەی دەسەڵات، ئەم پرسە نەبوو بە کێشە بەڵکو بە بەراورد بە مێژووی قۆناغەکەو تەنانەت قۆناغی دوای خۆشی لە جیهانی ئیسلامیدا، دەسەڵات بەڕادەیەکی زۆر بەشێوەیەکی ئەخلاقی بەڕێوە دەچوو، بۆیە هەر لەبەر ئەمەشە هەندێ ناوی دەوڵەت

---

[1] لەم رووەوە بگەڕێرەوە بۆ، لؤي صافي. العقيدة و السياسة، المعهد العالمي للفكر الأسلامي، الطبعة الأولى،١٩٩٦، ل١٨٨-١٩٩.

بەسەر ئەم قۆناغەدا نابڕن‌و پێیان وایە دەوڵەتی راستەقینە لە مێژووی ئیسلامیدا (هەڵبەت بە ئاماژە مێژووییەکانی دەوڵەت نەك دەوڵەتی نوێ) لە موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان و دەوڵەتی ئەمەوییەوە دەستپێدەکات.

بەڵام ئەم بە یەکداچوونەی کاری سیاسی‌و دەعەوییە لە سەردەمی (راشیدین)دا زۆری نەخایاندو لە سۆنگەی پەرەسەندنی رووداوەکان و دەرکەوتنی سیمای دابەشبوونە چینایەتییەکان و دووبارە خۆڕێکخستنەوەی خێڵ و پێوەرەکانی‌و دیارە لەوانەش (بنی أميّة) بە بەرگێکی ئیسلامییەوە، وە تێکەڵاوبوونی پرسی دەعوەو ئیسلام بە کەڵەکەبوونی ماڵ‌و دەسەڵات‌و شێوازی بەڕێوەبردنی حوکم‌و ئاستی بەشداری و دیاریکردنی پێوەرەکان لەم رووەوە، ئەزموونی (راشیدین) لەنیوەی دووەمی حوکمڕانی خەلیفەی سێهەمەوە، واتە (عوسمانی کوڕی عەففان) دووچاری قەیران بوو، لاوازی خەلیفەی چوارەم لە بەڕێوەبردنی حوکمڕانی و وەڵامدانەوەی بۆ فشارو تەکتیکەکانی (بني أمية)و ماف بەخۆدان بۆ گرتنە پێشی هەندێ ڕێ‌و شوێن لە پەیوەندی بە دابەشکردنی دەسەڵات‌و پلەو پایەکان‌و پارەو سامانی (بيت المال)دا، سەری لە سەرهەڵدانی نارەزایی و پشێوی و دەنگ بەرزکردنەوەی هەندێ توێژو ناوچەوە دەرچوو[1]، کە بە داخەوە سەرەنجام بە تیرۆری خۆی‌و چوونە نێو قۆناغێکی نوێی پڕ

---

[1] لەم ڕووەوە بگەڕێرەوە بۆ ابو الأعلى المودودي. خلافت و ملوكيت، مطبعة دار العروبة، لاهور– منصورة، ١٩٨٣.

کێشمەکێش‌و ململانێوە کۆتایی پێهات، بە جۆرێك کە جۆری تیرۆرکردنی ئەوو دۆخی خەلیفەی چوارەمیش، واتە (عەلی کوڕی ئەبی تالیب) کە لە کەسێتی خۆیدا رەمزی دنیا نەویستی‌و عەدالەتخوازی هەڵگرتبوو، بەڵام لە سۆنگەی بەهۆی زاڵبوونی لۆژیکی دەعوە لە جۆری ئیدارەکردن (شأن)ێکی سیاسیدا، وە هۆکارە بابەتییەکانی دەرەوەی دەسەڵاتی خۆی‌و قوڵبونەوەی ناکۆکییەکان، بەجۆرێك لە جۆرەکان درێژەپێدەری دۆخی پێش خۆی بووە، بەم جۆرەش سەرەتایەکی یەکجار ئومێدبەخش لە مێژووی حوکمڕانی موسڵمانانندا، دووچاری شکست‌و پاشەکشە هات، نەیتوانی رۆح‌و پێوەرەکانی بگۆڕێت بە (قاڵب) و (میکانیزم) و (دەستەبەری)ی سیاسی و سیستم و (قانون) لەبەردەم شاڵاوی رۆحی پادشاخوازانەی بەرەنگی ئیسلام رووپۆشکراوی موعاویە و (بني أمية)و هاوپەیمانە خێڵەکانیان، خۆی نەگرت و پاشەکشەی کرد.

**ئەوەی لەم ئەزموونەشدا لێرەدا بۆ ئێمە گرنگە ئاماژەکردنە بەم خاڵانەی خوارەوە:**

١. شەپۆلە بانگەوازو دەعەوییەکان، بە خودی ئیسلامیشەوە وەك ئاین، لەدوای قۆناغی هەڵکشانی سەرەتایەوە، بە رۆحە عەفەوی و خاوێنەکەیەوە، دووچاری داکشانو سنووردداربوونو دووبارە پێناسەکردنەوەو تەوزیف کردنەوەی سیاسیو کۆمەڵایەتی دەبێت. بۆیە ئەگەر جگە لەو سەرەتایە (کە لە ئەزموونی سەرەتای ئیسلامدا تا سەردەمی عومەری کوڕی خەتتابو نیوەی ماوەی حوکمڕانی عوسمان بەرگەی گرت) میکانیزمو دەستەبەری سیاسی بۆ رێکخستنی کاروبارەکان نەدۆزرێتەوە، وە دووبارە گوتارو شێوازی ئیشکردن دەستکاری نەکرێتو چەمكو رۆڵو ئامرازەکان پێناسە نەکرێنەوە، دۆخو دەسەڵاتو هێزو رێکخراوەکان، لە ڕوویەکەوە دووچاری جۆرێ لە لەرێ لادانو چەقبەستویی دەبن، لەڕوویەکی تریشەوە، توانای گەشەکردنێکی پەیامدارانەیان نامێنێ، بە جۆرێك گەر گەشەیەکیش بکەن، لە هەندێ رووەوە لەسەر حسابی (پەیام) دەبێتو لە رێی میکانیزم و شێوازە تەقلیدییەکانەوە ئەنجام نادرێن. مەترسی پێداگرتن لەسەر بەڕێوەبردنی هێزەکانی تەوژمی ئیسلامیش لە ئێستادا (لەوانەش هێزە ئیسلامییە کوردستانییەکان) بە لۆژیكو پێوەری ئەو قۆناعە سەرەتاییە هەمان بەرەنجامی دەبێتو دووچاری هەمان هەڕەشە دەبێتەوە.

٢. بانگەواز بە حوکمی سەرچاوەگرتن لە هەستێکی سۆزدارانەی جۆشخواردو و ئینتمایەکی تێکەڵ بە نموونەیەکی ئایدیاڵ و نموونەیی، با بشگاتە دەسەڵات، پێشەواکان تیایدا تەوەرە دەبن، بە جۆرێك بە گۆڕینی کەسەکان بەتایبەتیش دامەزرێنەرەکان، دەکەوێتە بەردەم هەڕەشەی شێوانو دروستبوونی پشێویو کەرتبوونەوە.

٣. لە ئەزموونی یەکەمی (راشیدین)دا هێشتا دەسەڵات تا کۆن نەبووبوو، هێڵەکانی نێوان سیاسەتو بانگەواز بەو جۆرەی هاتە پێشەوە دەرنەکەوتبوون، تا ڕادەیەك بەها ئەخلاقییەکان ئاراستەی سیاسەتی دەکرد. دەمارەکانی (خێڵ)و فۆرمە دواکەوتووەکانی پێشوو بۆ پیادەکردنی دەسەڵاتە لۆکاڵییەکان بەسەرکراوی مابوونەوە. کەسێتییەکی بەهێزی وەکو پێشەوا (عومەری کوڕی خەتاب) جڵەوی بەدەستەوە بوو، کە نمونەی لە مێژووی ئیسلامدا کەمەو لە هەمانکاتدا کەسێتییەکی سیاسی حوکمڕانی سەرمەشقیشە لە ئاستی جیهاندا.

٤. مەسەلەی ئەزموونی راشیدین سەرەتایەکی پاكو بێ هەندێ کێشەی (فقهی) و (کەلامی) و مەزهەبیو دەرهاویشتەی خراپ بەکارهێنانی سیاسیانەی (ئاین) بوو. کە دواتر سەریان هەڵدا. کەشو هەوای زاڵ عەفەویو کراوەو سادە بوو، هێندەی خۆیان ئەزموونیان دەخولقاندو سودیان لە ئەزموون وەردەگرت، ئەسیری فۆرمو پێناسەو ئەزموونەکانی پێش خۆیان نەبوون. لە کاتێکدا لەدوای ئەوانو بەهۆی گۆڕانکاریو ململانێ خوێناوییەکانو دەستکاریکردنی سروشتی دەسەڵات، هەموو ئەو مەسەلانەیان هێنایە کایەوە.

٥. كۆبوونــەوەی مەرجەعیــەتی دینــیو سیاســی لــە ئــەزموونی حوكمڕانی راشـیدیندا، بەتایبـەتیش لـە ئـەزموونی حـوكمڕانی عومـەری كوڕی خەتابدا، بە پێچەوانەی واقیعی دوای خۆیو دەرهاویشتەكانی ئەم تێكەڵبوونـــە لـــە ئێـــستاشدا، بـــووە سەرچـــاوەی مامەڵەیـــەكی مەبەستگەرایانەی گەورەی مەنهەجی لەگەڵ دەقـی قورئـانو سـوننەتو ژياننامـەی پێغەمبـەردا (ﷺ). بـە جۆرێـك گـەورەیی ئـەم حوكمڕانـە موسڵمانە تەنها لە دادپەروەریەكەیدا نییە، بـەڵكو بـە پلـەی یەكـەم لـە عەقڵە كراوەو بوێرییـە مەنهەجییەكەیدایـە. لـە چـۆنیەتی گەڕانـەوە بـۆ (دەق)و پەیوەندی بە ژیانو گۆڕانكاریەكانـەوە. بـەجۆرێك لـە دیـدگای ئەوەوە (ئاین) ئامراز بوو بۆ خۆشبەختی ئەم دنیـاو ئـەو دنیـای مـرۆڤ، نەك (ئامانج) كە دواتـر مەنزومـەی چەقبەسـتووی سـەلەفی و ئیـسلامی (تدوین)كراوی فقهیو كەلامی بەم جـۆرەی لێ كـرد.. واتـە (ئـاین) رۆڵـی رێنماییكـارو رێنیـشاندەر دەبینـێ لـە ژیـانی سیاسـیو كۆمەڵایـەتیو ئابووریـــدا، نـــەك لەقاڵبـــدانو رێگریكـــردن لـــە گەشـــەكردنو بـــە عەقیدەییكردنی سیاسەتو قەتیسدانی رەوتی گەشەكردنی ژیانو مێژوو لە هەندێ پێناسەو لێكدانەوەی ئاینیدا. مەنهەجی ئەم حوكمڕانە لەگەڵ دەقـــی قورئانیـــداو بـــە پێـــوەركردنی (بەرژەوەنـــدی) لـــە كاروبـــاری حوكمڕانییەكەیو لەپاڵ چەسپاندنی (دادپەروەری) بە جۆرێك بـوو، كـە بناغەیەكی زۆر دروستی بۆ رێكخستنی پەیوەندی نێوان دینو دەسەڵات لـە قۆنـاغی خۆیـدا دانـا، ئەمـەش پێمـان دەڵێـت ئـەم پێكەوەبوونـەی دەعـوەو سیاسـەتە لـە چوارچـێوەی ئـەم ئەزموونـە لـە حوكمڕانیـدا،

پێکەوەبوونێکی ئایدۆلۆژیانەو (فقهی) نەبووە، هێندەی پێکەوەبوونێکی ئـەخلاقیو بـەهایی بـووە. بـەجۆرێك کـە بـواری هـەردووکیان ڕێـزی لێ گیراوەو لە مەسەلەیەکدا کە عەقیدەو عیبادەتو چەسپاوەکانی (ئـاین) بووە، (ئاین) بنەڕەتو پێوەر بووە، لە شتێکیشدا کـە سـەر بـە دنیـای (أمر) و بـاس لـە سیاسـەتو پێویـستیەکانی بـەڕێوەبردنی حـوکمڕانیو بەدیهێنانی بەرژەوەندییەکان بووە بە کردەوە، لۆژیکی (أمر)و سیاسەت بنەڕەت بووەو (دەق)ەکـان لـەو ڕوانگـەوە خوێنراونەتـەوەو خراونەتـە خزمەت بەهاکانەوە، لەوانەش بەهای دادپەروەری. واتە لای ئەم عەقڵـە ئیسلامییە مەنهەجیو کراوە موسڵمانە، (ثوابت)ی ئاین یەکسان نەبووە بە (قطعي الدلالة) وەك لە ئێستادا لەژێر کاریگەری مەنزومەی سـەلەفیدا بەشـێکی گرنگـی ناوەنـدە ئیـسلامییەکە بـەو جـۆرە لـە مەسـەلەکە گەیشتووە !.

٦. ئـەزموونی (راشـیدین) بـە هـۆی تایبەتمەنـدی و زەرفو قۆنـاغی مێژوویی و فۆرمی دەسەڵاتدارێتیو گۆڕانکارییەکان لە چوارچێوەی دۆخـی لە ئارادابوونی دنیادا، قابیلی دووبارەکردنەوەو لەبەرگرتنـەوە نییـە. بۆیـە دەبێت سوودوەرگرتنی ئێمە لەو ئەزموونە بە گەڕانەوە دەبێت، بـۆ ڕۆحـی عەدالـەتخوازیو سـادەییو پـاکی حـوکمڕان، نـا بنەماڵـەییو پشتاوپـشتی ڕەوایـەتی سیاسـیو گواسـتنەوەی دەسـەڵات، نـەبوونی گەنـدەڵیو کـەمی مەحسوبیەتو چاودێرییکردنی کاربەدەستانو بەکارنەهێنانی پلەو پایە بۆ دەوڵەمەندبوونی ناڕەواو بەئامانجکردنی دادپەروەریو بەرژەوەندی خـەڵك لـە سیاسـەتکردن و تێگەیـشتن لـە دەقـەکانی ئـاین لـە هـەمان ڕوانگـەو

**ئامانجەوە. هەر بۆیە بەبڕوای ئێمە یەکێ لە هەڵە مەنهەجیو بنەڕەتییەکانی فیکرو بزاڤی ئیسلامی نوێ لەوەدا خۆی دەبینێتەوە، کە نەك هەر دەیەوێت، هەوڵی دووبارە زیندووکردنەوەی خەلافەتی مێژوویی و لەوانەش (راشیدین) بدات، بەڵکو تەنانەت خۆی وا وێناکردووە کە رۆڵی دووبارە لەدایکبوونەوەی ئیسلام لەم سەردەمەداو دووپاتکردنەوەی قۆناغەکانی بانگەوازەکەی دەگێڕێت!**

**هەروەها پێشموایە کە یەکێ لەو دەقانەی زیانی لە عەقڵی سیاسی ئیسلامی داوە، ئەو فەرمودەیە کە باس لە دابەشکردنی قۆناغو فۆرمەکانی حوکمڕانی موسڵمانان لە مێژوودا دەکاتو لە کۆتاییدا مژدەی دووبارە گەڕانەوەی خەلافەتی راشیدین[1] بە گوێی موسڵماناندا دەدات. کە (١٤٠٠) ساڵ رۆیشتوو ئەو مژدەیە نەهاتە دی، لە ئێستاشدا دانیشتن بە دیار دووبارە گەڕاندنەوەی فۆرمی مێژوویی خەلافەتی (راشیدین) و خودی سیستمی (خەلافەت)ەوە وەك فۆرمێکی ئەزموونکراوو ئەزموونێکی مێژوویی حوکمڕانی موسڵمانان، یەکسانە بە چاوبڕینە (المدینة الفاضلة) و یۆتۆپیایەکی سیاسیو نامۆبوون لە واقیعی سیاسی نویو فۆرمە نوێکانی خۆڕێکخستنی سیاسی.**

[1] قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): " إِنَّكُمْ فِي النُّبُوَّة مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ تَكُونَ، ثُمَّ يَرْفَعُهَا إِذَا شَاءَ أَنْ يَرْفَعَهَا، ثُمَّ تَكُونُ خِلافَةٌ عَلَى مِنْهَاجِ النُّبُوَّةِ، فَتَكُونُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ تَكُونَ، ثُمَّ يَرْفَعُهَا إِذَا شَاءَ أَنْ يَرْفَعَهَا، ثُمَّ تَكُونُ مُلْكًا عَاضًّا، فَيَكُونُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَكُونَ، ثُمَّ يَرْفَعُهَا إِذَا شَاءَ أَنْ يَرْفَعَهَا، ثُمَّ تَكُونُ جَبْرِيَّةً، فَتَكُونُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ تَكُونَ، ثُمَّ يَرْفَعُهَا إِذَا شَاءَ أَنْ يَرْفَعَهَا، ثُمَّ تَكُونُ خِلافَةٌ عَلَى مِنْهَاجِ النُّبُوَّةِ "، ثُمَّ سَكَتَ.. مسند الإمام أحمد

## پەیوەندی نێوان دەعوە و سیاسەت دوای قۆناغی راشیدین

قۆنـاغی دوای راشـیدین بەسـەرەتای قۆنـاغێکی نـوێی دیـاریکردنی پەیوەندی نێوان ئاینو سیاسەت دادەنرێت، چونکە فۆرمی حـوکمڕانیو سەرچاوەی رەوایەتی سیاسیو جۆری پیادەکردنی دەسەڵات، گۆڕانیان بەســەردا هــات، بــە کــردەوە جیهــانی ئیــسلامی چــووە قۆنــاغی دەســەڵاتدارێتی پاشانــشینییەوە، موعاویــەش نکــوڵی لەمــە ناکــات و دەڵێت: (أنا أول الملوك في الأسلام).

بە حوکمی ئـەوەی فـۆرمێکی چەسـپاوی پەیوەنـدی نێـوان (دیـن) و (سیاســەت) لەســەر ئاســتی کــاتو شــوێنو قۆناغــە جیاوازەکــانی گەشەکردنی مرۆڤایەتی و لەوانەش موسڵمانانو فۆرمـەکانی دەوڵـەتو دەســەڵاتو خۆڕێکخــستنی سیاســی، بــوونی نییــە، بــەڵکو بــە گــۆڕانی سیــستمو فــۆرمو دەرکەوتــە نوێکــانو نوێبونــەوە فیکــریو سیاســیو دەزگاییەکان، دەستکاری ئەو پەیوەندییـەش دەکرێـت، ئەمـەش ئـەوە دەردەخـات، کـە ئەگـەر جیاکردنـەوەی (دیـن) و (دەوڵـەت) خـەمێکی فیکری ئیسلامی نەبێت، دەبێت هەمیـشە سروشـتو جـۆری پەیوەنـدی نێوان (دین) و (سیاسەت) و (دەوڵەت) بابـەتێکی جێگـای بایـەخی ئـەو فیکرە بێت، بە حوکمی ئەوەی کە ئەگەر خراپ بەکارهێنانی (ئـاین) بـۆ سیاسەتو شێواندنی ناوەرۆکی سروشتی هەردووکیان، بە بەردەوامی لە ئارادایە، هەر بۆیە خوازیاری پشکنینو چاودێری بەردەوامە.

لە سایەی حوکمی ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی ئەمەوی‌و عەباسی‌و دواتر عوسمانیشدا، ئاین لە هەندێ رووەوە رۆڵی کرایە پاساودەری سیاسەتی ئیمپراتۆرو سولّتانەکان. واقیعی لەرێ ترازانی رەوتی دەسەلاّتی شوراییو خۆسەپاندن‌و کەنارخستنی بەها ئیسلامییەکان لە بواری دەستووری‌و ئاستی ئاراستەکردنی رەفتاری حوکمڕانەکان‌و داڕشتنی بڕیارو سیاسەتەکان‌و دەرهاویشتەکانی شەڕی نێوخۆی موسڵمانان‌و دووبارە بوژانەوەی بەشێ لە بەهاو هەناسەو پێوەرە خێڵەکییەکان، کاریگەربوون بە کولتوری ئەشرافیەت‌و قەڕاڵی ئیمپراتۆریەتەکانی تری پێش ئیسلام‌و هاوکاتی، لەپاڵ نائومێدبوون لە چاکسازیکردن لە دەزگای فەرمانڕەوایی‌و دووبارە گێڕانەوەی ئاراستەی بەڕێوەبردنی حوکمی موسڵمانان بۆ سەر رەوتی سروشتی خۆی، کارێکیان کرد، کە دابڕانێك لە نێوان (دەعوە)و (سیاسەت)دا لە مێژووی موسڵمانان بێتە کایەوە. بەوەش مێژووی حوکمڕانی موسڵمانان لە ئەمەوییەکانەوە لە هەندی رووەوە فۆرمێکی عەلمانی‌و دنیاباوی بەڕێوەبردنی حوکمڕانی‌و دەسەلاّتی بەخۆوە گرت. (ئاین) لەوە بەدوای بە ئاراستەی جیاواز بووە سەرچاوەی (ململانێ)و (رەوایەتی پێدان) و ( شۆڕشی ناڕەزایی)و خۆدابڕینی سیاسی‌و چەندین شتی تر.

بەکردەوە دەسەلاّتداران لە جۆری بەڕێوەبردنی حوکمدا بەها دەستووریەکانیان تێپەڕاندبوو، (فقە) کرابووە (قانون) و ئامرازێکی یەکلاکردنەوە لەو کێشانەدا، کە هاولاّتیان خۆیان تیایدا لایەن بوون. نەك کاربەدەستان. گەر قسەکانمان لێرەدا درێژە پێنەدەین‌و کورت

بکەینەوە، دەبێت لە پەیوەندی بە جۆری کارلێكو سروشتی پەیوەندی نێوان (ئاین) و (سیاسەت) لەم قۆناغەدا ئاماژە بە چەند خاڵێك بکەین، لەوانەش:

١. (ئاین) لەڕێی پێشەوا ئاینییەکانو هەڵگرانی پەیامی ئیسلامییەوە نوێنەرایەتی ئەخلاقیو رۆحی کراوە. بە کردەوەش بواری پیادەکردنی بەم مانایە کۆمەڵگە خۆی بووە، نەك دەسەڵات. ئەو لێکدابڕانو دورکەوتنەوەی رێبەرایەتی (ئاینی) و (سیاسی)یەی ڕووشی دا، تاڕادەیەك لەلایەن هەردوولاوە بە ئاستی جیاواز مامەڵەی لەگەڵدا دەکرا.

٢. چەمکی (فتنە) بەرەنجامی شەڕی نێوان موسڵمانانو سەرکەوتنی (أهل البغی) بووە لەو شەڕەدا، کە موعاویە و لەشکرەکەیو هاوپەیمانەکانی نوێنەرایەتیان دەکرد. هەروەها شکستی چەندەها راپەڕین بەڕێبەرایەتی پێشەوایانی (ئاین) بۆ راستکردنەوەی وەزعەکەو سەرکوتی بێ بەزەییانەی دەسەڵاتدارانی رۆژ بۆ سەربەرزکردنەوانە، کاری کردە سەر دیاریکردنی رۆڵەکانو روانینە سروشتی پەیوەندی نێوان (ئاین)و (سیاسەت). بەجۆرێك بەشێ لە زانایان رەوایەتیان دا بە دەسەڵاتێك کە لای خۆیان یان زۆربەیان ناڕەوا بوو، بە حوکمی ئەوەی لە شورای موسڵمانانەوە سەرچاوەی نەگرتبوو خوێنی ناحەق دەڕێژێو بەرامبەر بە ماڵو سامانی گشتی دەست پاكو دادپەروەر نییە. ئەم چەمکە وای کرد پەیوەندییەکی زۆرەملێیانەی سەپاوی نێوان (ئاین)و (سیاسەت) بێتە کایەوە. (دەعوە)و (ئاین)

کاریان بووه کەمکردنەوە لە خراپییەکانی دەسەڵاتو پشت بەخۆبەستن لە ئاراستەی کۆمەڵگەو رازیبوون بە بینینی رۆڵی دەسەڵاتی یاسادانان، لە بواری یاسای تایبەتدا.

٣. لەم دۆخەدا بە هۆی بوونی مەترسی دەرەکیو نائومێدی لە گۆڕانکاری ناوەکی بە ئاقاری چاکسازی سیاسیدا، بوونو مانەوەی دەسەڵاتو یەکیەتی ئوممەتو قەڵەمڕەوی دنیای ئیسلام، بێ گوێدانە بەها ئیسلامییە باڵاکانی وەکو دادپەروەری بووە ئامانج. بەشی لە ئەرکی (ئاین)یش بوو بە پاساودانی واقیعێکی نائیسلامی لە سۆنگەی رێگرتن لە (فتنە)و قەبەکردنی (فقە)ی گوێڕایەڵی.

٤. لەم قۆناغەدا (ئاین) وەك سەرەتا نەمایەوە، بە حوکمی دەرکەوتنی زانستو رەوتە ئاینییەکان، هەروەها لە سۆنگەی کێشەو پرسیارە نوێکانەوە. دەرکەوتنی (فقە)و (کلام) و (تصوف) لەم قۆناغەدا کاریگەری زۆریان کردە جۆری ئامادەبوونی (ئاین) لە ژیانی گشتیو کۆمەڵگەدا.

ئەوەی لەم رووەوە جێگەی لەسەر وەستانەو تا ڕادەیەکیش پەیوەستە بە بابەتی (دەعوە)و (سیاسەت) لە ئێستادا، سەرهەڵدانو دەرکەوتنی قوتابخانەکانی پاڵفتەکردنی دەروونیو ئەخلاقناسی و سۆفیگەری و عیرفانی بوو، کە تاڕادەیەك بوونە هەڵگرو پەرەپێدەری رووە تەزکیەو ئەخلاقییەکەی ئیسلام لە کۆمەڵگەدا.

بۆیە پێم وایە گەر پرسیارێ لە پەیوەندی نێوان (دەعوە) و (سیاسەت) و (دەسەڵات) لەو قۆناغەدا بکرێت، دەبێت ئەم پرسیارە

ئاراستەی سروشتو جۆری پەیوەندی ئەهلی عیرفانو تەسەوف لەگەڵ دەسەڵاتداران بکرێت. بە حوکمی ئەوەی هەر یەك لە (فقە) و (کلام) دەچنە دەرەوەی پێناسەی دەعوەوە، بە حوکمی ئەوەی یەکەمیان بە تەعبیری غەزالی ئامرازی دەستی فەرمانڕەوایانە و پاراستنی بەرژەوەندی ئەم دنیایەی مرۆڤەکان[1] و دووەمیش چێرۆکی تێکەڵاوبوونی بەشێ لە چەمكو ئامرازە فەلسەفیەکانیمان لەگەڵ جیهانبینی یەکتاپەرستی بۆ دەگێڕنەوە.

گەر لێرەشداو بە خراپیو سادەیی لەسەر سروشتی پەیوەندی نێوان (دەعوە)و (سیاسەت) بوەستین، دەتوانین ئاماژە بە چەند خاڵێك بکەین، لەوانەش:

١. هۆکارێکی سەرهەڵدانی ئەم رێبازە لە تەزکیەو پەروەردەی ئەخلاقیو بانگەواز، خراپی سیاسەتو مۆدێلی حوکمڕانیو دەرهاویشتەکانی بووە.

٢. هۆکارێك بووە بۆ خۆدابڕین لە دەسەڵاتدارو حوکمڕانەکان، بەتایبەتیش لە کاتی سەرهەڵدانیان، وە خۆدوورخستنەوە لە زەرقو برقەکانی دەسەڵاتو میکانیزمو رەنگدانەوەکانی و وازلێهێنانی بۆ دەسەڵاتداران.

---

[1] عبدالكریم سروش/ قصة أرباب معرفت (دفتر نخست ) چاپ شەشەم، ١٣٨٤ ك.هـ.ل٧٦١

٣. ئـەم بانگخوازانــە بــە گــشتی هەســتێکی نــەرێنیان بەرامبــەر دەسەڵاتو دەسەڵاتداران هەبووەو بەشی لە رزگاریی و پاکی خۆیان لـە خۆدوورگرتن لە دەسەڵاتو دەسەڵاتداراندا بینیوەتەوە.

٤. کێشەیان لەگەڵ بەشی لە شـەرعزانو (فقیـە)و کەلامناسـەکاندا هەبووە، ئەو بەشە لە ئاینداریو زانستی ئاینی کە لەگەڵ دەسەڵاتدا لـە پەیوەندیدا بووە.

٥. بانگــەواز لێــرەدا هــەڵگری گوتــارێکی هەمەلایەنــە (شمــولی) ئیـسلامی نییـە، بـەڵکو خـۆی تـەرخانکردووە بـۆ گرنگیـدان بـە بـواری پــەروەردەی ئــەخلاقیو پاڵفتــەو تەزکیــەتی دەروونــی و بــەهێزکردنی هەســتی خواناســیو گیــانی خواپەرســتی لــە دووتــوێی ئەنجامــدانی دروشمەکانی پەرستنو چاکەی ئەخلاقی، واتە (عمل الصالح)دا.

بەگشتی لەم فۆرمەدا (بانگەوان) لە سیاسەت دابڕاوەو جیـا بۆتـەوە، بەرهــەمی نائومێدبوونــە لــە سیاســەت. هــەوڵی رزگــارکردنی بــاوەڕو ئــەخلاقی ئیمانــداران دەدات لەســەر ئاســتی کۆمەڵگــەدا، پیــادەکردنی (فقــە)یــش لەلایــەن دەســەڵاتەوە وای لێ ناکــات بەدگومانییــەکانی بەرامبــەری کــەم بکاتــەوە، چــونکە خــراپ بــەکارهێنانی دەســەڵاتو پێــشێلکردنی ســنوورەکانی (ئیــسلام)و رواڵەتــەکانی ناعەدالــەتی، وای کــردووە، بــە گومانــەوە ســەیری ئــەهلی دەســەڵات بکــاتو بیانخاتــە دەرەوەی بازنەی (ئەهلی دین)ەوە، بە جۆرێ کە دەسەڵاتداران رەمزی (ئەهلی دنیا)و عارفانی سۆفیش رەمزو نوێنەری ئەخلاقی دینـی بـوون، کـە لـە زوهـدو دنیانەویـستیو خـوا خۆشەویـستیو چـاکەکاریدا خـۆی

دەبینێتەوە. ئەمە جگە لەوەی هۆکارێکی تری پشت سەرهەڵدانی ئەم رەوتە بانگخوازییە لە مێژووی ئیسلامیدا، گەورەبوونی پانتایی خۆپەرستیو ماددیگەرایی بووە لەناو خودی کۆمەڵگەدا، بە حوکمی ئەو پێشکەوتنی ژیاریو شارستانێتییەی لەو کاتەدا، لە جیهانی ئیسلامیدا لە ئارادابوو، هەروەها پێمان وایە کاردانەوە بوو بەرامبەر گەورەبوونی ناسروشتی (فقە)و داگیرکردنی پانتاییەکی گەورەو ئەو نەخۆشیو دیاردە نادروستو وشکبوونەوە رووحیانەی لەم دۆخە کەوتبۆوە.

## مێژووی بە یەکەوە گرێدانو تێکەڵبوونی (بانگەواز) و (سیاسەت) لە مێژووی نوێی موسڵماناندا

مەسەلەی فۆرمی بەیەکەوە گرێدراوی (بانگەواز) و (سیاسەت) لە چوارچێوەی رێکخراوێکی هاوبەشو دیاریکراودا، بەو جۆرەی لە ئەزموونی (برایانی موسڵمان)و دواتر (مەودودیو کۆمەڵەی ئیسلامی) و هەندێ ئەزموونی ئیسلامی شیعەگەرایی نوێشدا دەبینرێت، بە پێچەوانەی ئەوەی وا وێنا دەکرێت رەنگدانەوەی خودی ئیسلام خۆی بێت، دەرهاویشتەی واقیعی دوای جەنگی جیهانی یەکەمو هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی عوسمانییە. کە دوا رەمزی تەقلیدی یەکگرتووی بەشێ لە جیهانی ئیسلامیو قەوارەی نێودەوڵەتی موسڵمانان بوو. نموونەی ئەم بە یەکەوە گرێدانە بە پلەی یەکەم خەسڵەتی بانگەوازی (اخوان)ە. دەرکەوتنی ئەم بانگەوازەش لە

سـەردەمو سـاتەوەختێکی مێـژوویی دیـاریکراوی مێـژووی سیاسـی ناوچەکەدا، دەسنیشانی هۆکارە بابەتییەکانو ڕەوشە مێژووییەکەمان لەسەرهەڵدانو فۆرمۆڵەبوونی ئەم ڕەوتە بەو شێوەیەی کە گەشەی کردو داڕێژرا، بۆ دەخاتە ڕوو. مەسەلەکە گەرچی وا وێنا دەکرێت کە پەیوەندی بە سروشتی ئیسلام خۆیەوە هەبێتو بانگەوازەکەش وا نیشان بدرێت کە گوزارشت دانەوەیەکی نوێیە لە ڕۆحە ئیسلامییەکە خۆی، لەڕاستیدا مەسەلەیەکی مێژووکردەو پەیوەستە بەو کاردانەوە سۆزداریو فیکریانەی، هەڵوەشاندنەوەی سەڵتەنەتی عوسمانی لەناو بەشێ لە موسڵماناندا خوڵقاندی. دەنا ئێمە پێش ئەو قۆناغەو لە سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستەمدا، واتە لەسەردەمی ڕەوتی ئیسلاحخوازی ئیسلامیو ئیسلاحخوازە گەورەکانی ئەو سەردەمە، فیکرێکی جیاوازی ئیسلامی لە زیاد لە ڕووێکەوە دەبینین. یەکێ لەو شتانەی (فیکری) ئیسلاحخوازی ئیسلامی سەدەی نۆزدەو پێش جەنگی جیهانی یەکەم لە فیکری دوای ئەو بەتایبەتیش لە بەرگی (اخوان)دا، جیادەکاتەوە، ئەو کێشەو پرسو ئیشکالیە سەرەکییەکە کە هەریەکەیان بە دەوریدا دەخولێتەوەو کردویەتی بە چەقو ڕوانگەی ڕوانینە ئەرکەکانی ئاینو دیاریکردنی سروشتی دەسەڵاتو پەیوەندی نێوانیان. ئیشکالیەتو پرسی سەرەکی فیکری ئیسلاحخوازی ئیسلامی لە سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستەمدا (پێشکەوتن) و (بوژاندنەوە) بوو.

چارەسەری کێشەی دواکەوتنی ژیاریو شارستانێتی موسڵمانانو جیهانی ئیسلامی بوو. واتە وەڵامدانەوە بوو بەو پرسیارەی بۆچی خۆرئاواییەکان لە ڕووی ژیاریو شارستانێتییەوە بەو جۆرە پێشکەوتنو دنیای ئیسلام ئاوا باری کەوتو لە کاروان بەجێما؟ وە چۆن ئەم مەودا شارستانێتییە پڕ بکرێتەوەو ئەم جیهانە لەم دواکەوتووییە رزگار بکرێتو بگەیەنرێتەوە بە کاروانی شارستانێتیو سەردەم؟ بێ ئەوەی واز لە کەسێتی مەعنەوی خۆی بێنێ؟ پێشیان وابوو ڕێگای گەیشتن بەم ئامانجە دوو شتی سەرەکییە:

١. چاکسازییکردن لە فیکرو مەعریفەی ئیسلامیداو زاڵبوون بەسەر چەقبەستوویی و چاولێکەری و دەمارگیری مەزهەبیو بەسەر خۆداخرانو لە مێژوودا ژیان، کردنەوەی دەرگای ئیجتهاو داهێنانو گەیشتنە تێگەیشتنێکی ئاینی گونجاو لەگەڵ ئەرکی دووبارە بیناکردنەوەی ژیانی موسڵمانان لەسەر دادپەروەریو توانای بەرگری لەخۆکردنو گەیشتنەوە بە رەوتی گەشەکردووی شارستانێتی مرۆڤایەتی.

٢. سوودوەرگرتن لە ئەزموونی شارستانی گەشەکردووی خۆرئاواو (جمال الدين أفغاني)ی گوتەنی بەکارهێنانی هەمان چەکی خۆرئاوا بۆ وەستانەوە بەڕووی تەماعە کۆلۆنیالیستیو چاوبڕینە خێرو بێری گەلانو بەتالانبردنی. لەوانەش سوودوەرگرتن لە سیستمی سیاسی نوێی خۆرئاوا کە دەتوانێ ئامرازو هۆکارێك بێت بۆ رزگاربوون لە ستەمکاری و (استبداد)ی ناوخۆیی و دەسەڵاتی رەهاو سنوردانان بۆ دەسەڵاتی

دەسەڵاتداران و رزگارکردنی تاك و کۆمەڵ لە ملکەچی و بێبەشی و چەوساندنەوە، بەشداری پێکردنی تاك لە ژیانی سیاسی و دروستکردنی بڕیار و سەرەنجام هێنانەدی دادپەروەری سیاسی و کۆمەڵایەتی.

لەکاتێکدا تەوەرەو ئیشکالیەتی بنەڕەتی فیکری بوژانەوەگەرا (احیائی)ی دوای جەنگی جیهانی یەکەم و (اخوان)و ئیسلامی حەرەکی و سیاسی، پاراستنی ناسنامەی ئیسلامی کۆمەڵگەو دژایەتی خۆرئاواگەرایی و مۆدێرنەی سیاسی و شێوازی حوکمڕانی و دەوڵەتی نوێ بوو؟!.

ئەم دوو ئیشکالیەتە جیاوازە بووە سەرچاوەی دوو تێگەیشتنی جیاواز لە ئیسلام و پەیوەندی بە دنیای نوێوە. بۆیە لەکاتێکدا فیکری ئیسلاحی خۆرئاوایی بە تەحەدا دەزانی بۆ خۆی، وە خۆرئاوای دوژمنی لە بەرگی ئیستعماردا، لە خۆرئاوای فیکرو شارستانێتی و داهێنان و دیموکراسی و ژیانی دەستوری و رێکخستنی نوێ و مافەکانی هاوڵاتی لەیەك جیادەکردەوە، وە مۆدێلی حوکمڕانی خۆرئاوایی بە مەرجێکی رووبەڕووبوونەوەی خۆرئاواو بوژانەوەی ژیانی کۆمەڵگا موسڵماننشینەکان دەزانی، فیکری نوێی حەرەکی ناسنامە گەرا. یەك خۆرئاوا دەناسی و ئەو کایانەی بەسەر یەکدا تێکەڵ دەکردو، جگە لە زانستی سروشتی پێی وابوو، خۆرئاوا مەڵبەندی شەڕو خراپەو تاوان و نائومێدی و ئازارە[1].

---

[1] مجموعة رسائل، ب. دووەم، لا۱۹۹-۲۰۰.

هەر ئەمەش وادەكات فیكری ئیسڵاحی ئیسلامی توانای لـەخۆگرتنی دەستكەوتەكانی شارستانێتی نوێی هەبێت، تێگەیشتنی بـۆ ئیـسلام لـە بواری گـشتیدا تـا ڕادەیـەكی بەرچـاو شارسـتانیو فـراوانو نـویّ بێـت، لەكاتێكدا لە سایەی فیكری ئیسلامی حەرەكی نـویّدا، فیكـر دووچـاری پوكانەوە هاتو هەوڵی بە ئایدۆلۆژییكردنی ئیسلامو بە سیاسـەتكردنی ئاینو بە ئاینكردنی سیاسەت درا!!

ئەوەی جێگەی لەسەر وەستانیشە گـەورە ریفۆرمخوازەكـانی دنیـای ئیسلام لە سەدەی نۆزدەدا زاناو رەمـزی ئـاینی بـوونو لـەناو ناوەنـدە زانـستییە ئیـسلامییەكەی كۆمــەڵگاوە ســەریان هەڵــدابوو، لەكاتێكـدا داڕێـژەرانی فیكـری نـوێی ئیـسلامی بەشـی هــەرە زۆریـان دەرچــووی سیستمی نویّو خۆرئاوایی خوێندن بوون، بەڵام لـە هەمانكاتـدا، ئـەوان واتە ئیسڵاحخوازەكان هەوڵی لەخۆگرتنی مـۆدێرنی (حداثـة) یـان دەدا، بەشـوێن ژیـانێكی هاوچـەرخی نوێـوە بـوون، ئەمەشـیان نـەك هــەر بـە مەترسی لەسەر ناسنامەی ئیسلامی كۆمەڵگە نەدەزانی، بەڵكو بە ڕێگای نوێبوونەوەو رزگاركردنی موسڵمانانو گەشانەوەی ناسنامەش دەزانـی، كە سـتەمكاری سیاسـیو دەمـارگیریو نـاكۆكی مەزهـەبیو دواكـەوتنی شارستانی شێواندبووی، وەپێویستی بە دووبـارە بنیاتنانـەوە هـەبوو. ئـەوەش مانـای متمانـە بـەخۆبوونی ئـەو فیكـرەو هەسـت بـە كەسـێتی خۆیو ئومێدی بە دووبارە خۆبیناكردنەوە دەگەیاند. لەكاتێكدا فیكـری ناسنامەگەرایی ئیسلامیو حەرەكی نویّ، لەڕێی ستراتیژی بەسەر خـۆدا داخـران، رەتكردنــەوەی بەرامبــەری ژیـاریو دەســتگرتنێكی تونـد بـە

ناسنامەو قەبەکردنیو لـەبیر بردنـەوەی ئـەرکی دووبـارە هەڵـسانەوەی شارسـتانی موسـڵمانان، بـە پێـوەرە نوێکـانی دنیـا، بـە کـردەوە کـەم متمانەیی خۆی سەلماندبوو.

لەڕاستیشدا هەموو داخرانێکـی فیکـریو ئایدۆلۆژیانـە لەگـەڵ فیکـر، بەپێچەوانەی ئەو رەهایی گەراییو متمانە رواڵەتە زۆرەی لەخۆی نیشان دەدات، بەرهەمی هەست بە لاوازیو کەم کەرەسەییو سنورداری توانای کارلێکی فیکریو گفتوگۆی کراوەیە.

گـەر دوای ئـەم پێـشەکییە، سـەرنج لـە سروشـتی پەیوەنـدی نێـوان (دەعـوە)و (سیاسـەت) لەچوارچـێوەی فیکـری ئیـسڵاحی ئیـسلامی سەدەی نۆزدەدا بدەین، دەبیـنین ئـەم کێـشەیەی بـەجوانی چارەسـەر کـردووە، بـەڵکو لـە سـۆنگەی خـەمی پێـشکەوتنو هەسـتانەوە شارستانێتییەکەیدا بەو جۆرە باسمانکرد، هەر لە سەرەتاوە نەیکردووە بە کێشە تا پێویستی بە چارەسەرکردن هەبێت، چونکە خەمی گەورەی ئەو فیکرە ئەوە نـەبووە چـۆن دەوڵـەتێ بـۆ ئیـسلام دروسـت بکرێـتو شەریعەت پیادە بکرێتو ئەخلاقی ئیسلامی بەسەر خەڵکدا بسەپێنرێت، خواستی ئەوان دروستکردنی دەوڵەتێکی نیـشتمانی نـوێو سیـستمێکی دەسـتوری و پەرلـەمانی بـوو، ئەوەشـیان بـە رەنگدانـەوەی (شـورا)ی ئیسلامیو بەها دادپەروەرییەکەی ئیسلام دەزانی.

هەر لەم روانگەشەوە سەیری ژیانی حیزبیو سیاسـی دەکـرا. ئـەوان کە سەرقاڵی رەوایەتی دانو (تأصیل) کردنـی چـەمکی هـاوڵاتی ئـازادو یەکسان بوون لە فەرهەنگی واقیعی موسڵماناندا ، وە خوازیاری ئەوەش

بوون دەسەڵاتی سیاسی لەسەر بناغەی ڕێزگرتن لەسەر مافەکانی هاوڵاتی دابمەزرێت[1]. بەکردەوە هەوڵی دامەزراندنی حیزبی نوێیان لەسەر بناغەی ڕێزگرتن لەسەرەتای هاوڵاتێتی یەکسان دەدا. گەر سەیری ئەزموونی ئەوان بکەین، حیزبیان بە ئامرازی کاری سیاسیو کارکردن بۆ بەرجەستەکردنی بەها باڵاکانی ئیسلام لە وێنەی (شورا) و (دادپەروەری) و (یەکسانی) زانیوە، نەك چوارچێوەیەك بۆ وەعزو ئامۆژگاریو پەروەردەی ئاینی. ئەو تێکەڵاوبوونەی دواتر لە چوارچێوەی مۆدێلی کارکردنی (اخوان)و بەگشتی بزاڤی ئیسلامی ناسنامە گەراو حەرەکی نوێدا روویداو دەرهاویشتەی خراپی لێ کەوتۆتەوە و لەئێستادا بووە بە کێشەو پێویستی بە چارەسەرە.

ئەو حیزبەی لە ئێستادا هەندێ لە بیرمەندو ریفۆرمخوازە ئیسلامییەکان بانگی بۆ دەکەن، ئەوان بە کردەوە دایانمەزراندووە و رابەرایەتیان کردووەو لەڕیشەوە تێکەڵ بە خەباتی بەرفراوانی نیشتمانو تێکۆشان دژ بە ستەمکاری سیاسیو گەندەڵیو داگیرکاری دەرەکی بوونەتەوە.

دەتوانین لەم رووەوە ئاماژە بە ئەزموونێکی مێژوویی وەکو پارتی نیشتمانی لە میسردا لە ساڵی (١٨٨١)دا بکەین. کە بیرۆکەکەی هی زاناو تێکۆشەری گەورە (جەمالەدینی ئەفغانی) بووەو لە سەرەتاشەوە خۆی رێبەرایەتی کردووە و پرۆگرامەکەشی بە پێنوسی زاناو

---

[1] عبدالرزاق عيد، محمد عبدة امام الحداثة و الدستور، معهد الدراسات الأستراتيجية، الطبعة الأولى، ٢٠٠٦، ل١٨١-٢٣٢.

ئیسلاحخوازی بەناوبانگ موفتی پێشووتری میسر شێخ محمد عەبدە نوسراوە. مرۆڤ کاتێ سەیری ئەم پرۆگرامە دەکات کە سەد ساڵ زیاتر لەمەوپێش بە پێنوسی زانایەکی ئەزهەری نوسراوە، سەیری لەو داڕوخانە گەورە سوڕدەمێنێ کە لە سەدەی بیستەمدا لەمەڕ گووتاری سیاسی و دەستووریو ژیانی حیزبی دووچاری موسڵمانانو فیکر و تەوژمی ئیسلامی بوو.

پرۆگرامی حیزبەکە بەجوانیو روونی مەسەلە دەعەوی و سیاسیەکانی لە یەکتر جیاکردۆتەوە و تیایدا هاتووە: ((پارتی نیشتمانی پارتێکی سیاسی نائاینییە، لە شوێنکەوتوانی بیروباوەڕو رێچکە جیاوازەکانو جوولەکە و مەسیحیەکان و هەموو هاولاتیانی میسر (ئەوانەی دەیانەوێت بچنە ناوی)) و بە زمانەکەی دەدوێت، پێکهاتووە، چونکە پارتەکەمان ناڕوانێتە جیاوازی عەقیدەو بیروباوەڕ، وا دەزانێ هەمووان برای یەکترن. وە مافەکانیان لە سیاسەتو شەریعەتە ئاسمانییەکاندا یەکسانە. ئەمە لەلایەن شێخە گرنگو تایبەتەکانی ئەزهەرەوە سەلمێنراوە ئەوانەی پشتی ئەم حیزبە دەگرنو بیروڕایان وایە شەریعەتی راستی موحەمەدی بوغزو رق رەتدەکاتەوە، وە بە یەکسانی مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا دەکات[1].

هەروەك لە بەرنامەی حیزبەکەدا بەڕوونی دەردەکەوێت، ئەندامێتی لەم پارتەدا لەسەر بناغەی هاولاتێتی میسری دامەزراوە، کە تەنها

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل٣٠٩.

مەرجی ئینتما بۆ خاكو زمانی میسر دیاری دەكاتو جیاوازی (ئاین)و بیروباوەڕ ناكاتە كێشە. چونكە هاوڵاتی بوون ئەندامێتی لە نەتەوەی ئاینیدا نیە، تا حیزبی نیشتمانی كە خاوەن ناسنامەی ئاینی و مەزهەبی جیاواز لەخۆ بگرێت، كێشە دروست بكات. هەموو ئەو حیزبانەی تریش كە ریفۆرمخوازە ئیسلامییەكان دایانمەزراندوون یاخود بەشدارییان تێدا كردوون، حیزبی نیشتمانیو دەستووری نوێو گشتیین وەك چوارچێوەیەك بۆ خەڵكە نیشتمانپەروەرو دەستورخوازو عەدالەتخوازەكە سەیركراوە، ئەندامێتی تیایاندا تێكەڵ بە مەرجی ئاینی نەكراوە، بەوەش نەیانهێشتووە ببن بە حیزبی تایەفەگەری سنووردارو نیمچە داخراوو ئاینی[1].

ئەمەش ئەو مۆدێلە فیكرییە شارستانیو گرنگەیە كە دەبێت دووبارە بۆی بگەڕێینەوەو سوودی لێ وەربگرین بۆ ئەوەی لە فیكری ناسنامەگەراو داخراوو كێشەی تێكەڵاوی بانگەوازو مەسەلە دینییە سروشتیەكانو سیاسەت رزگامان ببێت. دەرگایەك بەڕووی بەشدارییەكی نوێ، لە پێگەو روانگەیەكی نوێوە، بەڕووی تەوژمی ئیسلامی دیموكراتیو نیشتمانی باگراوند ئیسلامیدا بكەینەوە.

---

[1] لەم ڕووەوە بۆ نموونە سەبارەت بە ریفۆرمخوازە ئیسلامییەكانی خۆرئاوای جیهانی عەرەبی بڕوانە: خيرية عبدالصاحب وادي، الفكر القومي العربي في المغرب العربي، دار الرشيد للنشر،١٩٨٢. و د. سعيد بن سعيد العلوي، الفكر الأسلامي في المغرب المعاصر، دار المدار الأسلامي، ٢٠٠٧. و عبدالاله بلقزيز، الخطاب الأسلامي في المغرب التكوين و المصادر، دار المنتخب العربي، الطبعة الأولى، ١٩٩٩. و الدكتور محمد صالح المراكشي، الأيدولوجية والحداثة عند رواد الفكر السلفي، دار المعارف.

# فەسڵی دووەم:
# سەرهەڵدان و پەیام و تایبەتمەندییەکانی بزاڤی ئیسلامی نوێ

بزاڤی ئیسلامی نوێ کە هەروەك وتمان بە پلەی یەکەم لە بیرو شێوازی کارکردنی (اخوان)دا دەردەکەوێت و بەرجەستە دەبێت، وە بەرهەمی تێکەڵاوکردنی بانگەوازو سیاسەتە، خاوەن پەیام و تایبەتمەندی خۆیەتی. زادەو سەرهەڵدراوی واقیعێکی مێژوویی و دیاریکراویشە.

پاش هەڵوەشانەوەی خەلافەتی ئیسلامی لە بەرگی سەڵتەنەتی عوسمانی دا لە ساڵی (١٩٢٤) لەلایەن (كمال أتاتورك)ەوە، سەراسیمەییەكی زۆر لەنێو ناوەندە ئیسلامییە علمییەكەو بە گشتی موسڵمانانی ناوچەكەدا دروست بوو. قبوڵكردنی ئەو واقیعەیان لا ئاسان نەبوو، بۆیە هەوڵەكان لەم لاولاوەو بەتایبەتیش لە دنیای عەرەبیدا كەوتنە گەڕ بۆ دووبارە گێڕانەوەی خەلافەت. بەڵام سەرجەم ئەو هەوڵانە رووبەڕووی بەربەستە بەهێزەكانی واقیعو بارودۆخە نوێكان بوونەوە. بەجۆرێك كە سەرەنجام هەموو ئەوانەی هەڵگری ئەم بانگەشەبوون، نائومێد بوون لەوەی بتوانن سەرلەنوێ سیستمەكە دابمەزرێننەوە، بە حوكمی ئەوەی دۆخی پارچەپارچەبوونی موسڵمانانو لاوازیانو داگیركاری خۆرئاواو سیستمی نێودەوڵەتی باڵادەست، رێگایان بە بەدیهێنانی ئامانجێكی لەو جۆرە نەدەدا.

هەڵبەت لە ناوخۆی توركیا جگە لە هەوڵە تێكەڵە ئیسلامییە میللییەكی شێخ سەعیدی پیران، كاردانەوەكان بەهۆی توانای داپڵۆسینی رژێمی نوێی توركیاو مێژووی توركیای پێش كۆماریش، توند نەبوون، بەڵكو ژینگە نوێكە بوو بە ژینگەی سەرهەڵدانی بانگەوازەكەی نەورەسیو پەیامەكانی نور، كە كار لەسەر فیكرو رۆحو لایەنی ئەخلاقی دەكەن. بە دەربڕینی مامۆستا نەورەسی خۆی، پەیامەكان بانگەشەبوون بۆ شۆڕشێكی ئیمانی و وەستانەوە بەڕووی هێرشكردنە سەر ناسنامەی ئیسلامی لەسەر ئاستی تاكو كۆمەڵ (نەك دەسەڵاتی سیاسی) لەسەر ئاستی كۆمەڵگەدا.

(حسن بەننا)ی دامەزرێنەری (اخوان)یش گەنجێکی مەشرەب سۆفیو سەر بە رێبازی سەحافیەی سۆفیزم بوو، هەر لە مێردمنداڵییەوە زیرەکیو وریاییو غەمخۆری پێوە دیاربوو، ئەمەش وای لێکرد هەر لە سەرەتای لاوییەوە بەشداری چەندین چالاکیو کۆمەڵەی چاکەخوازی بکات یاخود دایبمەزرێنێ، هەروەها لە بەرامبەر دۆخی دوای شەڕو بۆشایی ناسنامەو کێشەی (انتما) و شالاّوی خۆرئاواگەرایی بۆ سەر ژیانی تاکو کۆمەڵو کاڵبوونەوەی بەهاو ئەخلاقە ئیسلامییەکان لەناو بەشێکی دا، کەوتە پەیوەندی کردن بە چەندین زاناو رەمزی ئاینی ئەو کاتەوە، داوای ئەوەی لێ دەکردن هەروا دەستەوسان دانەنیشن و کارێ ئەنجام بدەنو بەر بە شالاّوەکە بگرنو هەوڵی دووبارە گێڕانەوەی هەژموونو بالاّدەستی پێوەرو مۆرکە ئیسلامییەکە بۆ ژیانو کۆمەڵگە بدەن[1]. یەکێ لەوانەی لێشی نزیك بۆوە (شێخ محمد رەشید ڕەزا) بوو کە لە بنەڕەتدا بە یەکێ لە ڕەمزە ئیسلاّحییەکان دادەنرا، کە دواتر لەژێر فشاری واقیعدا لە بەشێکی گرنگ لە گوتاری ئیسلاّحی ئیسلامی سەدەی نۆزدە پاشەکشەی کردو جارێکی تر چوارچێوە مەنزومە تەقلیدییە فیکرییەکانو بانگەشەکردنەوە بۆ گێڕانەوەی خەلافەتی

[1] مجموعة رسائل/ ب یەکەم / ل٢٣٧.

ئیسلامی له فۆرمێكی مێژوویی حوكمڕانی موسڵمانانیدا كرد به تاكه شێوازی شەرعی و ڕەوێی حوكمڕانی ئیسلامی[1].

هەر ئەویش مەسەلەی حكومەتی ئیسلامی وروژاندووە، كە دواتر بووه سەرچاوەو ئیلهام بەخش بۆ (حسن بەننا)ی لاو و بڕوا بەخۆ بوو، بۆ ئەوەی چوارچێوەی پەیامو بانگەوازەكەی لەسەر دابڕێژێت، كە له پەیامەكانیدا بەرجەستە بووه. كاتێ ئەو بانگەوازەكەی له میسردا دەستپێكرد ئەوەی له مەیدانەكەدا لەئارادابوو بانگەوازی سەلەفیو سۆفی بوو، كه ناكۆكیو ململانێیەكی قوڵیان لەنێواندا هەبوو. ئەوەی پێشی دەوترا فیكری ئیسلامی له چوارچێوەی هۆڵو میتۆدە چەقبەستووەكانی ئەزهەردا گیری خواردبوو. بەننا هەوڵی دا بناغەی جوڵانەوەیەك دابنێت كە بەڕێی خۆی سەلەفی و سۆفیو فیكری جێگایان تیادا ببێتەوە و له هەمان كاتدا هەمووشیان تێپەڕێنێ. واته هەوڵی دا كۆی تەوژمەكان له چوارچێوەی بانگەوازێكو لەڕێی دروشمی گەڕانەوە بۆ ئیسلامی هەمەلایەنە، ئیسلامێك كه هەموو كونو قوژبنێكی ژیان دادەپۆشێتو هیچ بۆشاییەك بۆ قسەكردنی غەیری خۆی ناهێڵێتەوە، كۆ بكاتەوە. هەر لەسەر ئەو بناغەش دەیویست توێژە جۆراوجۆرەكان بێنه ناو كۆمەڵه دەعەویەكەوە. ئەو له هەوڵی ئەوەدا بوو، ناكۆكییه لاوەكیەكان وەلا بنرێنو نەوەیەكی نوێ بە گوتاری

---

[1] مجموعة رسائل/ ب دووەم / لا ١٠-١١.. هەروەها بگەڕێرەوە بۆ : وجيه الكوثراني، الدولة و الخلافة في الخطاب العربي ايّان الثورة الكمالية في تركيا، دار الطليعة، بيروت. و الدكتور أحمد فهد بركات، محمد رشيد رضا و دوره في الحياة الفكرية و السياسية، دار عمّار، ١٩٨٩.

هەمەلایەنە بوونی ئیسلام پەروەردە بکرێتو (قورئانو سوننەت) ببنەوە بە سەرچاوەی سەرەکی و بالای هەمووان، نەوەیەك پێ بگات کە لەپاڵ ئیسلامدا بەچاوی سووك سەیری ژیاری خۆرئاوا بکاتو بە بچوك بیبینێت[1].

هەموو ئەوەی ئاماژەشمان پێکرد پێمان دەڵێت: ئەم بانگەوازە کاردانەوە بووە، کاردانەوە بەڕووی روخانی سەڵتەنەتی عوسمانیو، ئیستعماری خۆرئاواو، بڵاوبوونەوەی شێوەژیانی خۆرئاواو بی بەندوباوی کۆمەڵایەتیو بە گشتی نوێگەرایی (حداثة).

هەموو بانگەوازێکیش لە دۆخی کاردانەوەدا، لە بیری رزگارکردنی پاشماوەی دۆخەکەو هەڵگرتنی گوتاری مانەوەو دەستگرتن بە پێویستیەکانی ناسنامەو رەتکردنەوەی بەرامبەری هێرشبەرو کارکردن لەسەر (ئیمان)و ئایدۆلۆژیادا دەبێت.

[1] مجموعة رسائل، ب. یەکەم،ل١٢-١٣.

## هەوڵی دووبارە پێناسەکردنەوەی ئیسلامو تایبەتییەکانی فیکرو بزاڤە ئیسلامییە نوێکە

کاتێك بانگەوازێك لەناو مەرجەعیەتی خودی ئیسلامەوە کار دەکاتو پێشی وابێت، هەموو ئەو گوتارانەی کە بەناوی ئیسلامەوە لە کۆمەڵگەدا بوونیان هەیە، ڕەنگدانەوەی سروشتی ئیسلام نینو ناشتوانن وەڵام بە پێویستیەکانی قۆناغەکە بدەنەوە، لەلایەکی ترەوە پێی وابێت رووخانی خەلافەتو هاتنە کایەی دەوڵەتی نوێ وەك بەرهەمێکی مۆدێرنە و نوێگەرایی خۆرئاوایی و سیستمە سیاسیەکەی، هەڕەشەن بۆ سەر ئیسلام وەك بیروباوەڕو شەریعەتو شێوە ژیان، بانگەوازێکی لەم جۆرە دەبێت یەکەم هەنگاوی لە دووبارە پێناسەکردنەوەی ئیسلامو دواتر پێناسەکردنەوەی دەوروبەرەکانەوە دەست پێبکات. ئەمەش هەمان ئەو کارەبوو دامەزرێنەری (اخوان) کردیو ئەنجامی دا. هەوڵی سەرەکی ئەویش دووبارە پێناسەکردنەوەی (ئیمان) و (عەقیدە) بوو.

ئەو پێی وابوو (ئیمان) مانای نییە ئەگەر کرداری بەدوادا نەیەت، بیروباوەڕیش سوودی نییە ئەگەر خاوەنەکەی هەوڵی بەدیهێنانی نەداو لە پێناویدا تێنەکۆشێ، پیشەنگانی باوەڕداری نەتەوەکانی پێشووش هەر بەو جۆرە بوون، باوەڕیان بە پەیامی پێغەمبەران هێناوەو لەپێناویدا تێکۆشاون[1].

[1] مجموعة رسائل/ ب یەکەم / لا ٢٣.

## تایبەتییەکانی بانگەواز و ئایدۆلۆژیا و بزاڤی ئیسلامی نوێ

**یەکەم/ الربانیة**: لەڕوانگەی دامەزرێنەرانو نووسەرانی ڕەوتەکە (ربانیە) بە یەکێ لە خەسڵەتەکانی ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ دەزانن، مەبەست لە پەروەردگاری بوونی ئەوەیە کە هەموو ئامانجەکان بە دەوری خودادا بخولێنەوە، خەڵکی پەروەردگاری خۆیان بناسنو پەیوەندی رۆحیان پێوە بێتو بچنە سەرو ژیانی ماددیگەرایی کەڕو کوێرەوە.

هەربۆیە یەکەم دروشمی اخوان (خودا مەبەستمانە)یە، تا خەڵکی دووبارە وەبیری ئەم پەیوەندییەیان لەگەڵ خودادا بێنێتەوەو بیپەرستن[1]، ئەم خەسڵەتە لەگەڵ ئیسلامی بوونیش دەبێت وا لەهەر ئەندامێکی (اخوان) بکات کە پێی وابێت ئەو بانگەوازەی هەڵیگرتووە بەرزەو ئەو فیکرەی خاوەنیەتی پیرۆزە[2].

١. **ئیسلامی بوون**: لە ڕوانگەی ڕێبەرانی فیکری ڕەوتەکەوە مەبەست لەم چەمکە ئەوەیە کە بانگەوازەکە لە ئیسلامو سەرچاوەکانیو قورئانو سوننەتەوە سەرچاوەی گرتووەو شتی تری تێکەڵ نەبووە. تاکە مەرجەعو چاوگو پێوەری ئیسلامو ڕێنوێنیو ئەحکامەکانیەتی[3].

---

[1] هەمان سەرچاوە، لا١٧٠.

[2] هەمان سەرچاوە، لا٢٥١.

[3] هەمان سەرچاوە، لا٣٢-٣٣ و ٢٥٣.

دامەزرێنــەری (اخــوان) لــەم رووەوە دەڵێــت: ((لەوەتــەی هــەمو پێگەیشتووم ژیانی خۆم بۆ یەك مەبەست تەرخان کردووە، کـە ئـەویش رێنوێنیکردنی خەڵکییە بۆ حەقیقەتی ئیسلامو ئیشپێکردنیەتی. لەبەر ئەوەی رێبازی برایانی موسڵمان لە رووی مەبەستو هۆکارەکانیەوە (الوسائل) ئیسلامییەکی رووتو بێ خەوشە و جگە لە ئیسلام پەیوەست بە هیچ شتێکی ترەوە نییە[1]. لەسەر ئیسلام وەستاوەو لەو وەردەگرێتو لەپێناو ئەودا تێدەکۆشێتو بۆ بەرز راگرتنی ئەو کار دەکات. ئیسلام ناگۆڕێتەوە بە هیچ سیستمێکی تر، جگە لەو رازی نابێت پێشەوا بێت، گوێڕایەڵی حوکمو بڕیاری غەیری ئەویش نابێت))[2].

(فتحی یکن) وەك یەکێ لە بیرداڕێژەر (منظر)انی برایانو بزاڤی نوێی ئیسلامی ئەم خەسڵەتە بە (خودیی بوون) گوزارشی لێ دەداتەوەو دەیکات بە یەکێ لە تایبەتمەندییەکانی بزاڤی ئیسلامی نوێ، مەبەست لەوەش هەروەك ئەو بۆی چووە ئەوەیە کە لە واقیعی کۆمەڵگەی ئیسلامییەوە هەڵقوڵاوەو بە چەشنێ فیکرو رێکخستنەکانی تر لە (رۆژهەڵات) یاخود (رۆژئاوا) وە نەخوازراوە، هەروەك دەڵێت: ((بانگەوازەکەمان بۆ (ئاین)ە و، (ئاین)یش بەهێزترین تایبەتمەندیو ناسێنەرەوەی ئەم نەتەوەیە))[3].

---

[1] مجموعة رسائل/ ب دووەم / لا ١٠.

[2] مجموعة رسائل/ ب دووەم / لا ١٤٤.

[3] فتحي يكن، ماذا يعني انتمائي الى الأسلام، چاپخانە نهضت، قم، ١٣٦٩ هـ. ش، لا ١١٣.

بەوەش یەکەم ئەرکی برایان دەبێتە روونکردنەوەی دەستوورەکانی ئەم ئیسلامە بە رۆشنی و تەواوی و بێ زیادو کەمو تەمو مژ، کە ئەوەش بەشە تیۆرییەکەی فیکری برایانە. دواتر داوایان لێ بکەین بۆ بەدیهێنانو جێبەجێکردن و بەسەریاندا پیادە بکەین، کە دەبێت کاری پێ بکەن. کە ئەوەش رووە کردەییەکەی رێبازەکەیە. (واتە دوای بانگەواز لەڕێی گرتنەدەستی دەسەڵاتەوە شەریعەتیان بەسەردا جێبەجێ دەکرێتو چی تر مەسەلە پەیوەست نابێتبە بوونو نەبوونی قەناعەتی تاکەکان دوای ئەوە ماوەیەك بانگەواز کاری خۆی کردووەو بەشی لە خەڵکی قەناعەتی پێ کردووە))[1].

بە کورتی ئیسلامی بوون جگە لە مەسەلەی بەسەرچاوەبوونی ئیسلام بۆ بانگەوازەکە، واتە (ئیسلام) کردن بە ناسنامەی باڵاو تاکە پێوەر بۆ هەموو شتێكو سەیرکردنی وەك عەقیدەو نیشتمانو رەگەزنامەو ناسنامە.

**دووەم/ هەمەلایەنە بوون (الشمولية)**: دامەزرێنەری (اخوان) بۆ ئەوەی مەسەلەی (ئیسلامی بوون)ی بانگەوازی برایانو تێگەیشتنی خۆیان لە ئیسلامی باوی کۆمەڵگەو سەلەفیو سۆفیو زانستی جیابکاتەوە، دەبەستێتەوە بە تایبەتمەندییەکی ترەوە کە ئەویش هەمەلایەنە بوونە، واتە هەر بۆیە لەم رووەوە و لە پەیمانی (بانگەوازەکەمان) دا دەڵێت: ((کۆکەرەوەترین وەسفێ بۆ

[1] مجموعة رسائل/ ب دووەم / لا١٤٤-١٤٥.

بانگەوازەکەمان (ئیسلامی بوون)ە، بەڵام ئـەم وشـە مانایـەکی فراوانـی جیاواز لەو مانا بەرتەسکەی هەیە، کە خەڵکی لێی تێگەیشتوون، ئێمـە بڕوامـان وایـە ئیـسلام مانایـەکی هەمەلایەنـەو گـشتگیری هەیـە بـۆ ڕێکخـستنی کـۆی ژیـان، وە لـە هـەموو شـتێکی ژیانـدا فتـوا دەداتو سیـستمێکی پتـەو و وردی بـۆ دادەڕێـژێت. وە لەبـەر دەم کێـشە زیندووەکانو سیستمەکاندا دەستەوسان ناوەستێت کە پێویستن بۆ چاککردنی خەڵك. ئێمە تێگەیشتنی ئەو کەسانە بە هەڵـە دەزانـین کـە ئیسلام لـە هەنـدێ تێگەیـشتنی ئێمـە جیـاوازو فـراوانو پـانو پـۆڕە و پێمان وایە ئیسلام کاروبارەکانی دنیاو دواڕۆژ ڕێکدەخات))[1].

واتە ئەم بانگەوازە تەنها بە چاکسازیکردن لـە بـوارێکی دیـاریکراوی ژیان یاخود چەند بوارێکدا وازناهێنێ[2]....

مەسـەلەی تێگەیـشتنی گـشتگیری لـە ئیـسلامیش لـە بانگـەوازی (اخـوان)دا هـەروەها وەك بابـەتێکی فیکـری بـەجێ ناهێڵرێـت، بـەڵکو هەروەك لە پەیامی ئامۆژگاریەکان (التعاليم)دا هـاتووە، دەبێـت هـەموو ئەندامانی کۆمەڵەکەی لەسەر پەروەردە بکرێت، بۆ ئەوەی لەو ڕوانگەوە سـەیری ئیـسلامو تێگەیـشتنی ئیـسلامییەکانی تـر بکـەن، ئامـانجو سـتراتیژی کۆمەڵەکەشـیان دابڕێـژنو هۆکـارو شـێوازی کـارکردنو قۆناغەکانیشی دیاری بکەن. هەر لـەم چوارچـێوەدا مەسـەلەی گشتگیر بوونی تێگەیشتنی (اخـوان) بـۆ ئیـسلام لـە چـەندین شـوێنی جیاجیـای

---

[1] مجموعة رسائل/ ب یەکەم / لا ٣٢-٣٣.

[2] فتحي يكن، ماذا يعني انتمائي الى الأسلام، لا ١١٤.

پەیامەکانی دامەزرێنەرو دواتر ئەدەبیاتی کۆمەڵەکەو نووسەرەکانیدا جەختی لێ کراوەتەوە. بە سیفەتی ئەوەی جیاکەرەوەترین جیاکەرەوەی بانگەوازەکەیانە. هەر لەم رووەوە لە خاڵی یەکەمی پەیامی (تعالیم) لەمەڕ سەرلەنوێ پێناسەکردنەوەی (ئیسلام) لە مەنزومەی فیکری برایاندا هاتووە: ((ئیسلام سیستمێکی گشتگیرە، باس لە کۆی رواڵەتەکانی ژیان دەکات، دەوڵەتو نیشتمان یاخود حکومەتو نەتەوە، رەوشتو هێز یاخود میهرەبانیو دادپەروەری، رۆشنبیریو یاسا یاخود زانستو داوەری، ماددەو سامان یاخود کاسبیو دەوڵەمەندییە، جیهادو بانگەوازە یاخود سوپاو بیرۆکە، هەروەها بە هەمان شێوە عەقیدەیەکی راستو عیبادەتێکی دروستە))[1].

دامەزرێنەری ئیسلامیش ئەم تێگەیشتنە لە (اخوان)ی ناوناوە (ئیسلامی برایانی موسڵمان)و دوای ئەوەی ئاماژە بە گەورەی موسڵمانان لە مێژوو و واقیعدا دەکات بۆ ناوەرۆکی ئیسلامو جارێکی تر جەخت لە گشتگیربوونی ئیسلام دەکاتەوە، وەك جیاکەرەوەی تێگەیشتنی (اخوان) بۆ ئیسلام لە تێگەیشتنەکانی تر[2].

**سێیەم/ جیهانی بوون**: جیهانی بوون لێرەدا بە مانای نانەتەوەیی بوونو تێپەڕاندنی بازنەی نیشتمانە بە چەمکە نوێکەی، بەڵکو تێپەڕاندنی جوگرافیاو قەڵەمڕەوی مێژوویی دنیای ئیسلامو رووکردنە سەراپای مرۆڤایەتیو جیهانە، بە زمانو نەتەوەو رەنگو ئاینو

[1] مجموعة رسائل/ ب یەکەم / لا ٢٥٤.

[2] مجموعة رسائل/ ب دووەم / لا ١٤-٢٠.

ئایدۆلۆژیا جیاوازییەکانیـەوە، دامەزرێنـەری (برایـان) ئـەم خەسـڵەتەی بانگەوازەکەی بەم جۆرە روون دەکاتەوەو دەڵێت: ((بانگـەوازی برایـان جیهانییە، چونکە ئاراستەی سەراپای خەڵکی کراوە، چـونکە خـەڵکانی سەرزەوی لە بنەڕەتدا برای یەکترن! بنەچـەیان یەکـە، باوکیـان یەکـە، رەچەڵەکیان یەکە، جگە لەو خزمـەتو چاکەی پێـشکەش بـە کۆمـەڵی دەکەن، کەسیان رێزی بەسەر ئەوی ترەوە نییە، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾[١].

ئێمە بڕوامان بـە رەگەزپەرسـتی نەتەوایـەتیو نەژادپەرسـتی نییـە، هـانی دەمـارگیری رەگـەزو رەنگـەکان نـادەین، بـەڵکو بانگەشـەی برایەتییەکی دادپەروەرانە لە نێو خەڵکیدا دەکەین[٢]. ئەمـەش وادەکـات کـە بانگـەوازی ئیـسلامی لـەپاڵ پەروەردگاربوونیـدا بـە ئینـسانی نـاو ببرێت[٣].

هەڵبەت ئەگەر مەبەست لە جیهانی بوون لەلایەکـەوە رەتکردنـەوەی بەربەستە نەتەوەیی و نیشتمانیو نەژادییەکان بێت، هەروەها مەبەست لـەوە بێـت کـە (ئیـسلام) وەك دوایـەمین پـەیامی خـودا بـۆ مرۆڤـەکان

---

[١] النساء/١.

[٢] مجموعة رسائل/ ب یەکەم / لا١٧٠-١٧١.

[٣] سەرچاوەی پێشوو / لا١٧٢.

هاتووه، به حوکمی مرۆڤ بوونیانو بەدەر له هەر ناسنامەو ئینتمایـەکی تـری فیکـریو ئـاینیو نـەژادیو نەتـەوەیی، بۆیـە نـاکرێ لـە جـوغزو بازنەیەکی دیاریکراودا قەتیس بدرێتو ئەرکی هەڵگرانی پەیامەکەیـە بـە هــەموو مرۆڤایــەتی بگەیــەنن، ئــەوا لەلایــەکی تــرەوە و بــە ســیفەتی ئامانجێکی ریزبەندیکراو لەچوارچێوەی ئامانجەکانی بانگەوازی برایـان، مەسەلەکە لە میکانیزمەکانی بانگەوازو شێوازەکانی قەناعەت پێکـردنو تەکنیکەکانی راگەیانـدنو بڵاوکردنـەوەی پـەیام دەردەچێتو دەچێتە چوارچــێوەی ململانێــی سیاســیو ســەربازیو ئــاینیو شارســتانیەتە گەورەکانــەوە. بــەوەش (اخــوان) وەك رێبــازو فیکــر دەگەڕێتــەوە بــۆ کولتـوری (دار الأسـلام) و (دار الحـرب) و ئـەو (فقـە)ەی رەوایـەتی بـە درێـژەدان بـە جیهـاد دەدات لەگـەڵ ئـەو جیهانـەدا کـە ئامـادە نییـە دەسەڵاتو هەژموونو قسە ڕۆیشتوویی موسڵمانان قبـوڵ بکـاتو ئـاڵای خۆبەدەستەوەدان بەرز بکاتەوە.

هەربۆیە جیهانی بوون لەم چوارچێوەدا (حكمة) و (موعظة الحسنة) و (جـدال بـالتي هـي أحـسن) تێدەپـەڕێنێت، دەبێتـە تەواوکـەری هەنـدێ قۆناغی زەمینە سازکەر، بەم شێوەیەی خوارەوە:

١. دروســتکردنی تــاكو خێــزانو گــەلو حکومــەتی موســڵمان لــە پانتاییەکی جوگرافی دیاریکراوو وڵاتێکی ئیسلامیدا (کـە میـسر بـۆ ئـەو ئەرکە دەستنیشان کراوە) بە مەبەستی دروستکردنی دەوڵەتی ئیسلامی (نـاوك) یـاخود (قاعـدە)، بـۆ ئـەوەی لـەوێوە دەسـتبکرێت بـە ئـەرکی

گێڕانەوەی یەکیەتی نەتـەوەو جیهـانی ئیـسلامو دەسـەڵاتەکەی یـاخود جەنگو تیاچوون.

٢. قۆناغی دووەم دوای دەوڵەتی ئیسلامی نـاوك دەبێتـە کـارکردن لەپێناو رزگارکردنی خاکـە داگیرکراوەکـانی جیهـانی ئیـسلامی و دواتـر یەکخـستنەوەی نەتـەوەی ئیـسلامی لەچوارچـێوەی قەوارەیـەکی یەکگرتوودا.

٣. رزگارکردنـەوە و بەدەسـتهێنانەوەی سـەرجەم ئـەو وڵاتو ناوچانەی لە مێژوودا بەشێ لـە قەڵـەمڕەوی ئیمپراتۆریـەتی ئیـسلامیان پێکهێناوەو دواتر دابڕێنراون لە وێنەی (ئەندەلوس و سەقەلیە... ). وە پێکهێنانەوەی قەوارەی نێودەوڵەتی ئیسلام.

دوا قۆناغی ئەم ئامانجانەش هەروەك دامەزرێنەری (برایان) ئاماژەی پـێ دەکـات ئاشـکراکردنی بانگەوازەکـەو راگەیانـدنێتی بـۆ جیهـانو ئاگادارکردنەوەی خـەڵکانی سـەرزەوییە و گشتگیرکردنێتی بـۆ کـون و قوژبنەکانی دنیا. وە ملکەچکردنی هەموو خاوەن زۆرو ستەمکارێکە بـە زەبری هێز کاتێ دەبنە رێگر. تاکو ئاژاوە (فتنة) لەسەر زەویدا نامێنێو ئاین بەتەواوی بۆ خودا دەبێتو ئیسلام باڵ بەسەر زەویدا دەکێشێت[1].

ئەمەش پەروەردەی (جیهـاد)ی دەخوازێـت، هـەر بۆیـە (موجاهیـد) پلەیەکی پەروەردەو پلەکانی حەرەکی (برایان) بوو کە ئەندام لەو پلەدا دەبێت ببێتە هەڵگری کۆمـەڵێ خەسـڵەتی دیـاریکراوی وەك: لێـبڕان بـۆ

---

[1] مجموعة رسائل/ ب دووەم / لا١٤٧-١٥١.

بانگەوازو ڕێباز، خۆڕاگری ئامادەگی قوربانیدان بە هەموو شتێك، گیانی سەربازیو گوێڕایەڵی سەرکردەو سەرکردایەتی[1].

دامەزرێنەری (اخوان)یش وەبیری ئەندامان دێنێتەوە کە بیرکردنەوەیان لە کەش‌و هەوایەکی جیهادیانەدا بێت، بیرکردنەوەیان تێکەڵ بە هەستێکی گەرم‌و گوڕ بێت بۆ ڕۆژە شکۆدارەکانی ئیسلام‌و تامەزرۆیی بێت بۆ دەسەڵات‌و هێزی ئەو، هەروەها گریان بێت بۆ حاڵی موسڵمانان لە ئێستادا بە هۆی ئەو سوکی‌و سەرشۆڕییەی دووچاری بوون‌و تیایدا دەژین، جا ئاماژە دەکات بە هەندێ لە ڕەنگدانەوەکانی مانای جیهادو (موجاهید)بوون لە بیرکردنەوەی برایانی موسڵماندا لە وێنەی فەرمانکردن بە چاکەو بەرگریکردن لە خراپە، بانگەوازو ئامۆژگاری خەڵك، هەروەها نکولی کردن لەوەی نکولی لە ئاینەکەیان دەکەن، وە دەنگ‌و پەیوەندی دابڕین لەگەڵ ئەوانەی خۆیان لە خوداو پێغەمبەر دابڕیوەو دوژمنایەتی دەکەن، بەجۆرێك نابێت هیچ جۆرە لەسەر سفرە دانیشتن‌و قسەو مامەڵەیەکیان لەگەڵ بکرێت! هەروەها پێویستە خۆیان بە سەربازی خودا بزانن، بە ماڵ‌و گیانیانەوە ئامادەی قوربانی دان بن.[2]

---

[1] مجموعة رسائل/ ب یەکەم / لا٢٥٣ و دواتر.

[2] أ. د. توفيق يوسف الواعي، الفكر السياسي المعاصر عند الأخوان المسلمين، مكتبة منار التلفزيونية، كويت :٢٠٠١، ص/ ٦-١١.

ئەمەش لەو قەناعەتە فیکریو عەقیدەیەوە سەرچاوەی گرتووە کە هیچ بانگەوازێك بێ تێکۆشانو جیهاد سەرناکەوێت[1]، هەربۆیە دامەزرێنەری (اخوان) (جیهاد ڕێبازمانە)ی کرد بە یەکێ لە دروشمەکانی کۆمەڵەکەی. هەوڵیشی دا لەڕێی دامەزراندنی (دەزگای تایبەت)وە بیرۆکەکە بکات بە کردارو دەزگاکەش بکات بە چوارچێوەیەك بۆ پیادەکردنی داواکاریو بەهاکانی قۆناغی (مجاهد) بەو جۆرەی لە کارنامەی (اخوان) هاتبوو کاری لەسەر دەکرا. هەندێکیش ئاماژە بەوە دەکەن کە بەننا ئەرکی دەزگاکەی بە سێ شت دیاری کردبوو:

١. بەگژداچوونەوەی ئیستعماری بەریتانیا.
٢. بەرەو ڕوو وەستانەوەی نەیارانی بانگەوازو کۆمەڵەی برایان.
٣. زیندووکردنەوەی فەریزەی جیهاد[2].

کەواتە بانگەوازو ڕێبازەکە لە دەوڵەتی بنکە واتە (قاعدە)وە دەست پێدەکات، لەوێوە پەل دەکێشێ بۆ جیهانی ئیسلامو دواتر قەڵەمڕەوی مێژویی ئیمپراتۆریەتی ئیسلامیو دواتر جیهان بە گشتی.

بەدیهێنانی ئامانجێکی لەم جۆرەش کۆکردنەوەی سەرجەم وزەو تواناکانی ئوممەتی دەوێت لە دەستەو هێزێکی یەکانگرتووی کۆکەرەوەی یەکگرتوودا. ئەوەش دەخوازێت، شتی بەناوی فرەحیزبی لە سایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا بوونی نەبێتو دانی پیادانەنرێت. چونکە فرەیی سیاسیو حیزب جگە لەوەی ڕەنگدانەوەیەکی مۆدێرنەی

---

[1] مجموعة رسائل/ ب یەکەم / لا ٢٦٤.

[2] مجموعة من الباحثين، الحركات الأسلامية في الوطن العربي، المجلد الأول،ص١٥٦.

سیاسیو دیموکراسی خۆرئاوایە، کە بنەڕەت تیایدا لـەو روانگـەوە، بـە دەردی ئێمــە نــاخوا، هــەروەها دەبێتــە سەرچــاوەیەکی نــاکۆکیو کێشمەکێشو خۆپەرستیو بەیەکـەوە سـەرقاڵ بـوونو ئـاژاوە نانـەوەو لاوازکردنی تواناکانی نەتەوە[1]، هەر لێرەشەوە فرەیی سیاسـیو حیزبـی دەبێتە یەکێ لە کێشە سەرەکییەکانی فیکری حەرەکی ئیسلامی نـوێ.
جیهانی بوونی ئیسلامو بانگەوازی (اخوان) جیهـانی بـوونی جوڵانـەوەو بزاڤە ئیسلامییەکەش دەخوازێت. مادام یەك ئیسلاممان هەیـە، وە یـەك تێگەیـشتنی تـەواوو گـشتگیری ئیـسلامیو بانگـەوازێکی هاوسـەنگمان هەیە، کە ئەویش لە تێگەیشتنی (برایـان) بـۆ ئیـسلامو بانگەوازەکـەی ئەواندا بەرجەستە دەبێت، دەبێت یەك جەستەی حەرەکیو ئایدۆلۆژیو رێکخراوەیـیو سیاسـیش هـەبێت، تـا ببێتـە هـەڵگرو بانگەشـەبۆکەریو بەرجەستەی بکاتو ئاراسـتەی بکـات! چـونکە بـوونی فـرە مەرجـەعی ئیسلامی لە ئاراستە ئوممەتیە گەورەو سیاسییە بنەڕەتیەکەیدا، جگـە لەوەی دەبێتە تێکدانی هارمۆنیـەتی کـارو بـەفیڕۆدانی وزەو تواناکـانو دابەشـکردنیانو سەرلێـشێوانی حـەرەکیو سیاسـی، پاساویـشی نییـە، چونکە لەپاڵ تێگەیشتنە راستەکەی (اخوان) تێگەیشتنێکی ترمان نییە بەو شێوەیە، تاکو هێزێکی تر نوێنەرایەتی بکات!! مەگەر بانگەوازی تر دواتر بە هەمان شێوەو لەژێر کاریگـەری ئـەودا دەربکـەوێتو ببێـت بـە درێژەپێدەری، تا ئەگەر بەشێوەیەکی کاتیش بێـت، بتوانـێ لـە وڵاتێـك

[1] مجموعة رسائل/ ب دووەم / لا١٨٥.

یاخود زیاتردا نوێنەرایەتی حەرەکیو سیاسی بانگەوازەکە بکات، بۆ نمونە وەك ئەوەی لەسەر دەستی ئەبو ئەعلای مەودودیو کۆمەڵەی ئیسلامی پاکستان روویدا، کە هەڵگری هەمان گوتاری گشتگیری ئیسلامو دەوڵەتی ئیسلامییە.

هەر لە سەرەتاوە (اخوان) هەوڵی بە ئیسلامی کردنی خۆی لەسەر ئاستی دەوڵەتانی ئیسلامیدا ((لە ساڵی (١٩٣٣) یەکەم لقی لە جیبوتی کردەوە کۆنگرەی سێهەمی کۆمەڵەی برایانیش لە ساڵی (١٩٣٥)دا بڕیاری هەناردەکردنی بانگەوازو گشتگیرکردنی بۆ دەرەوەی میسر بە هەموو شێوازێك دا. وە نوێنەرانی خۆی رەوانەکرد بۆ پەیوەندی کردن بە (حاجی أمین حسێنی) سەرۆکی ئەنجومەنی باڵای ئیسلامی لە قودس، وە بە کۆمەڵەی (الهدایة الأسلامیة) لە دیمەشق، و کۆمەڵەی (المقاصد الخیریة) لە بەیروت لە ساڵی (١٩٤٦)یشدا دەستەی گشتی برایانی موسڵمان بڕیاری دا سەرجەم لقەکانی لە دەرەوەی میسردا لە ژێر ناوی (بزوتنەوەی برایانی موسڵمان)دا کۆ بکاتەوە، لەگەڵ هێشتنەوەی پەراوێزێ بۆ کاری سەربەخۆو رەچاوکردنی ژینگە جیاوازەکان[١])).

لێرەوە دەتوانین بڵێین لێکچوونێکی روون لەنێوان جیهانبینی بزاڤی ئیسلامی نوێو مارکسیزمدا لە پەیوەندی بە پرسی دەوڵەتو، نەتەوەو،

---

[١] الحركات الأسلامية في الوطن العربي، المجلد الأول، ص١٦٣.

جیهـانی بـوون‌و، چـه‌ندین شـتی تـردا لـه ئارادایـه[1].ئه‌مـه‌ش ئـه‌وه ده‌سه‌لمێنێت كه فیكر به سروشتی خۆی رنگدانه‌وه‌ی ئالۆزی‌و پرسیارو ئاستی مه‌عریفی‌و كێشمه كێشه‌كانی ژینگه‌و سه‌رده‌می خۆیه‌تی، ئـاینی بوونی فیكرو بانگه‌وازو رێبازێكیش توانای شكاندنی ئه‌م رێسایه‌ی نییه، چـونكه سـه‌ره‌تا ئـه‌وه‌ی فیكـر به‌رهـه‌م ده‌هێنـی و ده‌قـه‌كان ده‌خوێنێتـه‌وه‌و هه‌ڵـسه‌نگاندنه‌كان دیـاری ده‌كـات مرۆڤـه، مـرۆڤیش مه‌حكومه به كات‌وشوێن‌و رێژه‌یی بوونی تواناكانی.

## چواره‌م: یه‌كانگیركردنی دین‌و سیاسه‌ت
## یاخود به دینی كردنی سیاسه‌ت‌و به سیاسه‌ت كردنی دین:

یه‌كێ لـه خه‌مـه هـه‌ره گـه‌وره‌كانی فیكـری حـه‌ره‌كی‌و بزاڤـی نـوێی ئیـسلامی لـه‌دوای هه‌ڵوه‌شـانه‌وه‌ی سـه‌ڵته‌نه‌تی نـوێی عوسمانییـه‌وه، ره‌تكردنـــه‌وه‌ی عه‌لمانیـــه‌ت‌و وێناكردنـــه‌وه‌ی ئیـــسلام بـــووه وه‌ك (استثناء)ێكـی جیهـان‌و ئـاینێكی هه‌مه‌لایه‌نـه‌و لـه‌خۆگری دنیـاو دوارۆژ بووه. ئـه‌و ده‌وڵه‌تانـه‌ی لـه دوای سـه‌ڵته‌نه‌تی عوسمـانی دامـه‌زران، بـۆ یه‌كـه‌مجار لـه مێـژووی سیاسـی موسـڵمانانیدا، تیایـدا ئیـسلام پێـوه‌ری پێناسه‌و سه‌رچاوه‌ی شه‌ریعه‌ت‌و (ئینتما) نه‌بوو.

بـه‌ڵكو بـه حـوكمی گواسـتنه‌وه‌ی مۆدێلـه خۆرئاواییه‌كـه‌ی ده‌وڵـه‌ت‌و سیستمی سیاسـی، بـه‌ناوی ناسـنامه‌ی نیـشتمانی‌و نه‌ته‌وه‌ییـه‌وه دروسـت

---

[1] لـه‌م رووه‌وه بگـه‌رێره‌وه بـۆ ئه‌بوبـه‌كر عـه‌لی/ داعـش لـه نێـوان تونـدره‌وی ئـاینی‌و شكـستی ده‌وڵه‌تدا،٢٠١٥، ل١٤٩-١٧٢.

بوون، دەستورە نوێکان بە شێوەیەکی گشتی بەوە وازیان دەهێنا ئیسلام بە ئاینی دەوڵەت بزانن (جگە لە تورکیا). بە کورتی شەریعەتی ئیسلام تیایاندا حوکمی نەدەکرد، بەڵکو یاسا نوێکان پەیوەندییەکانیان رێکدەخست. کە بە شێوەیەکی بنەڕەتی پشتیان بە مەنزومە یاساییە خۆرئاواییەکە بەستبوو[1]. بە کورتی لە سایەی ئەم دەوڵەتانەداو ئاستی جیاواز (دین)و (دەوڵەت) لە یەکتری جیابوونەوە. شەریعەتی ئیسلام لە بەشی لە وڵاتەکاندا لە یاساکانی باری کەسێتی دا کورتکرابۆوەو لە هەندێ شوێنی وەکو تورکیاو (تونس)یش، لەوێشدا تەنگی پێ هەڵچنرابوو! ئەم دۆخە بەلای رێبەرانی بزاڤی ئیسلامی نوێ و بەشی لە ناوەندە فیکریو زانستییە ئیسلامییەکەوە قبوڵ کراو نەبوو. بۆیە بە شێوازی جۆراجۆر کەوتنە خۆیان، هەوڵیاندا بیخەنە ڕوو (عەلمانیەت) دیاردەیەکی نامۆیە لە جیهانی ئیسلامی دا و (ئیسلام) مەسیحیەت نییە، هەروەك چۆن (عقیدە)یە ئاوها شەریعەتیشە، مێژووی موسڵمانانیش ململانێی نێوان دەسەڵاتی دینیو زەمەنی بە خۆوە نەبینیوە. چونکە هەر لە بنەڕەتەوە ئیسلام شتێکی بەناوی دەسەڵاتی دینی بەرجەستەبوو لە دامەزراوەیەکی هەرەمی دا ناناسێت. هەربۆیە ئەرکی موسڵمانانە کە دژ بەم رەوتە بوەستنەوەو پێ لەسەر یەکانگیریو لە یەکدی دانەبڕاوی (دین) و (دەوڵەت) دابگرن. پێشەنگانی بیری جوڵانەوەخوازی ئیسلامی نوێش پێویستە سەرەتا لەڕووی تیۆرییەوە ئەم بیرۆکەیە بخەملێننو رەخنە لە

---

[1] الدكتور رضوان السيد، الأسلام المعاصر مراجعات و متابعات، دار الكتاب العربي، چاپی یەکەم، ١٩٩٧. ل٣٢-٣٣

عەلمانیــەت بگــرن‌و سروشــتی لەیەکنەپــچڕاوی (دیــن)و (سیاســەت)و (دەوڵـەت) لـە ئیـسلامدا بخەنـە ڕوو، دواتـر ئەمـە لـە بۆتـەی بانگـەوازێك‌و جەستەیەکی حەرەکی ڕێکخراودا بەرجەستە بکەن. بۆ ئەوەی بـە کـردەوە لە ڕێی دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی نـوێ و پیـادەکردنی شـەریعەتەوە، بیخەنە ڕوو.

ئەم خەمە کە ئاماژەیە بە مانەوە لە چوارچـێوەی مەنزومـەی فقهـی مێـژوویی‌و ئـەزموونی بەیەکـەوە بـوونی (دیـن)و (دەوڵـەت) لـە سـایەی ئیمپراتۆریەتی ئیسلامیدا، لانی کەم بەو جۆرەی کە لـە بـیری ئیـسلامی نـوێی حـەرەکی‌و لای کەسـانی وەکـو (بـەننا) و (قطـب)و (مـودودي)و (قرضــاوي) و نووســەرانی تــری حــەرەکی ئیــسلامیدا دەبینرێتــەوە، ســێبەری بەســەر کــۆی تەفــسیرکردنەوەی ئیــسلام‌و پێناســەکردنی بانگــەوازو پەیوەنــدی بــە سیاســەت‌و تایبەتمەندییەکانــەوە دانــاوە، مەسـەلەی جەختکردنـەوەی بـەردەوام لەسـەر گـشتگیربوونی ئیـسلام‌و بانگـەوازی ئیـسلامی‌و بەسـتنەوەی بـە حکومـەت‌و دەسـەڵاتەوە، بـۆ ڕەتدانەوەی بانگەشەی جیاکردنەوەی (دیـن)و (سیاسـەت)ە. هـەر لـەم چوارچێوەدا دامەزرێنەری (برایان) لە زیـاد لـە شـوێنێکی پەیامەکانیـدا جـەخت دەکاتــەوە لەســەر پەیوەنـدی لـە پـچڕان نـەهاتووی نێـوان (ئیسلام)و (سیاسەت) و (دەوڵەت)و لە بۆنەی جیـاوازدا سـەرنج بـۆلای سیاسەت لە پرۆژەو بانگەوازی برایاندا ڕادەکێشێ. لـە هەمانکاتـدا کـە دژی ئەوە بووە، (برایان) وەك حیزبێکی سیاسی پێناسە بکرێن، چونکە

برایانی به گەورەتر لە حیزب زانیوەو جیاوازی لە نێوان سیاسەتو کاری سیاسیو حیزبی دا کردووە.

هەر لەم چوارچێوەدا دەنوسێت: (بە هەڵەداچوون ئەوانەی وا دەزانن کۆمەڵەی برایان کۆمەڵێ دەروێشن، خۆیان لە بازنەیەکی بەرتەسکی خواپەرستیی ئیسلامیدا قەتیس داوە، هەموو خەمو خەیاڵێکیان نوێژو رۆژوو و زیکر و تەسبیحاتە، موسڵمانانی پێشوو ئیسلامیان بەم شێوەیە نەناسیوە. بەم جۆرەش باوەڕیان پێی نەهێناوە، بەڵکو وەك: عەقیدەو عیبادەت، نیشتمانو رەگەزنامە، رەوشتو ماددە، رۆشنبیریو یاسا، لێبوردەییو هێز، باوەڕیان پێ هێناوە، باوەڕیان وابووە سیستمێکی تەواوەو خۆی بەسەر هەموو رواڵەتەکانی ژیاندا دەسەپێنێتو، کاروباری دنیا رێکدەخات، هەروەك چۆن دوارۆژ رێکدەخات، هەروەها باوەڕیان وابووە لە یەك کاتدا سیستمێکی کرداریو رۆحییە. لایانوابووە ئیسلام (دین) و (دەوڵەت) و کتێب (مصحف) و (شمشێر) بووە. لەهەمانکاتدا عیبادەتی خواشیان فەرامۆش نەکردووە[1].

بۆ وەڵامدانەوەی ئەو کەسانەش کە لە کاتی خۆیدا تانەیان لە (برایان) داوە لە سۆنگەی ئەوەوە کۆمەڵەیەکی ئاینی بوون، کەچی دواتر گۆڕاون بۆ گروپێکی سیاسی، کە ئەوەش جۆری لە ناڕاستگۆییان دەردەخات، دامەزرێنەری (برایان) بیری ئەوە دێنێتەوە، کە مەسەلەی جیانەکردنەوەی (ئاین) و (سیاسەت) پەیوەستە بە مانەوەمان وەك

---

[1] مجموعة رسائل/ ب دووەم / لا ١٥٢-١٥٣.

موسڵمان هەر بۆیە سەبارەت بە (اخوان) رۆژێ لە رۆژان نەبووە (دینی) بووبن بە مانای باوەڕ نەبوون بە سیاسەتو دواتر سیاسی بووبن، چونکە لە هیچ کاتێکدا بانگەوازەکەیان سیاسەتو ئاینی لە یەك جیانەکردۆتەوە[1]. لە شوێنێکی تردا لە پەیامی کۆنگرەی شەشدا (١٩٤١) جارێکی تر دێتەوە سەر باسکردن لە پەیوەندی نێوان (ئاین) و (سیاسەت) لە فیکرو بانگەوازی برایاندا.

ئەو سیاسی بوونی (برایان) بەوە لێکدەداتەوە کە بە تەنگ کاروباری نەتەوەکەیانەوەن، وە بڕوایان وایە کە هێزی جێبەجێکردن (حکومەت) بەشێکە لە رێنوێنییەکانی ئیسلامو دەچێتە ژێر بازنەی ئەوو ژێر حوکمەکانییەوە. ئیسلام بە ئامۆژگاریو رێنوێنی واز لە موسڵمان ناهێنێ، بەڵکو بانگی دەکات بۆ خەباتو تێکۆشانو چاکسازیی سەربەرزی هەموو ئەوەشی بایەخدان بە کاری سیاسی دەزانێتو، لە خودی ئیسلامەوە سەرچاوەی گرتووەو بەشێکە لە بانگەوازو رێبازی برایانیش[2].

دواتر بە دەنگێکی بە بڕشتتر و پێداگرتنێکی ئایدۆلۆژی زیاترەوە ڕوو بە ئەندامانی (کۆمەڵە)کەی و بۆ رەتدانەوەی بیری زاڵ لەمەڕ جیاکردنەوەی (ئاین)و (سیاسەت) لە ناو دەستەبژێری کۆمەڵدا دەڵێت: ((بۆخاتری خوا برایان پێم بڵێن! ئەگەر ئیسلام شتێ بێت جگە لە سیاسەت و (اجتماع)و ئابوریو رۆشنبیری، ئیتر دەبێ چی بێت؟)).

---

[1] هەمان سەرچاوە، لا٦٧.

[2] هەمان سەرچاوە، لا١١٨.

هەرکەس وابزانێت ئیسلام سەروکاری لەگەڵ سیاسەتدا نییە، ستەمی لە خۆیو زانیاری بە ئیسلامیش کردووە، دەوڵەتی ئیسلامیش لەسەر بناغەی بانگەواز نەبێت دروست نابێت، بۆ ئەوەی دەوڵەتی پەیام (رسالة) بێت نەك پێکهێنانی ئیدارەو حکومەتێکی ماددی کەرِوکوێر کە گیانی لەبەردا نەبێت، دەعوەش بەرپا نابێتو خۆی ناگرێت لە سایەی پاراستنو پارێزگاری لێ کردنو راگەیاندنو بڵاوکردنەوەی دەوڵەتدا نەبێت[1]. بەم جۆرە لای دامەزرێنەری برایان (بانگەوان)و دەوڵەت بە جۆرێك تێکەڵ بە یەك دەبنو کە هیچیان بێ ئەوی تر نەژین، دەوڵەتی بێ (بانگەوان) دەوڵەتێکی ماددیگەری کەرِو کوێرو بێ پەیامی لێ دەردەچێت، لێرەشەوە ئێمە دەچینە بەردەم پۆلێنو ریزبەندی و دابەشکردنێکی نوێ بۆ دەوڵەتو جۆرەکانی، کە ئەویش:

یەکەمیان: دەوڵەتی پەیامدارو دووەمیان دەوڵەتی بێ پەیام..

دەوڵەتی پەیامداریش تاکە یەك رێگا بۆ دامەزراندنی هەیە، کە ئەویش دامەزراندنێتی لەسەر بناغەی (بانگەوان) بەو جۆرەی برایانو دامەزرێنەرەکەی تێی گەیشتوونو پێناسەی دەکەنو ئەرکی بۆ دیاری دەکەن، بەدەر لەمە ئەم دەوڵەتە لای هیچ نەتەوەو رێبازێکی تری فیکریو فەلسەفی دەستناکەوێت. تەنانەت لای هیچ تێگەیشتنێکی تری جیاوازی ئیسلامی ناو کۆمەڵگەش چنگ ناکەوێتو پەی پی نابرێت!

---

[1] أ. د. توفيق يوسف الواعی، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢١.

جـۆری دووەمیـشیان دەوڵـەتی بـێ پەیامـە کـە لـە چوارچـێوەیدا حکومەتو بەڕێوەبردنێکی بێ گیان دروست دەبێتو بێ پەیام دەبێـت. ئەم دەوڵەتەش هەموو ئـەو دەوڵەتانـە دەگرێتـەوە کـە لەسـەر بناغـەی جیاواز لە بانگەوازو فیکر دروست دەبن.

ئاستی یەکانگیریو ئاوێزانبوونی بانگەوازو دەوڵـەتیش بـە جۆرێکـە، کـە نـە دەتـوانین لـە دەرەوەی بـە یەکـەوەبوونیان وێنـای هـیچ جـۆرە بوونێك بەتایبەتیش بە پەیامدارانە بۆ هیچیان بکـەین. چـونکە دەوڵـەت بوونو رەوایەتی خۆی لـە بانگـەوازو لـەوەوە وەردەگرێـت. کـە لەسـەر بناغـەی ئـەو دروسـت بـووەو بـەوەش بۆتـە دەوڵـەتی رێبـازو فیکـرو پەیامێکی دیاریکراو. کاتێ ئەم رەوایەتیەش وەردەگرێت، دەبێت ببێتـە بڵاوکـەرەوەو پارێزگـاری بانگـەوازو لـە خزمـەتی ئـەودا بێـت، واتـە لـە خزمەتی بانگەوازدا بێت. کـە لەڕاسـتیدا گـەر ورد بینـەوە، دەوڵـەت لـە قۆناغی دوای دروستبوونی دەبێتە (بکەر) و بانگەواز (بەرکار)و بابـەت، دەوڵەت دەبێتە (سەروەر)و بانگـەواز (گوێڕایـەڵ) و (وسـیلة)! چـونکە ئـــەوەی بڕیـــار دەدات بانگـــەواز بـــڵاو بکاتـــەوەو پارێزگـــاری لێ بکـــات دەوڵەتە، واتە بڕیارو توانـاو کەرەسـەو جـۆری بڵاوکردنـەوەو شـێوازی پارێزگاری لێ کـردن هـەر هـەمووی دەگەڕێتـەوە بـۆ لـۆژیکی دەوڵـەتو سیاسەتو پێویستیەکانی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگە!.

پێشم وایە زۆر ماندووبوونی ناوێت تاکو هەست بەوە بکەین کـە ئـەم جۆرە وێناکردنە بۆ پەیوەندی نێوان (ئاین) و (بانگەواز) و (دەوڵەت) لە ژێر هەژموونی دوو مۆدێلی لە یەك جیاوازدایە: مۆدێلی یەکەمیان سەر بە

دنیـــای کـــۆنو جـــۆری بەیەکـــەوەبوونی (ئـــاین) و (دەوڵـــەت)ە لـــە چوارچـێوەی ئیمپراتۆریـەتی ساسـانیدا، کـە لـەڕێی (اداب السلطانیة)و سـەرهەڵدانی مـۆدێلی سـولڵتانیزم لـە مێـژووی سیاسـیو حـوکمڕانی موسـڵماندا، تێکـەڵاو بـە خەیاڵـدانو ئـەدەبیاتی سیاسـیان بـووە، کـە دەڵێـت: ((ئـاین بناغەیـەو سـوڵتانیش پاسـەوان، گـەر بناغـە نـەمێنێ دەسەڵات دەڕوخێو گەر پاسەوانیش نەمێنێ ئـاین تیادەچـێت و زایـەع دەبێت)).

دووەمیـــشیان کاریگـــەر بوونـــە بـــە ئایـــدۆلۆژیا هەمەلایەنـــەکانی شێوەییەکەمو بەتایبەتیش سیو چلەکانی سەدەی رابـردوو لـە وێنـەی (فاشـــیزم) (نـــازیزم) (کۆمـــۆنیزم)و پەیوەنـــدی نێـــوان دەســـەڵات لەچوارچێوەی ئەو مۆدێلانەدا.

ئەمەش پێمان دەڵێت گـەر کـاتی خـۆی ئـەفغانی وتبـووی: خۆرئـاوا دەبێت بەچـەکەکانی خـۆی رووبـەڕووی بوەسـتێتەوە، ریفۆررمخـوازانی گـــەورەی ئیـــسلامیش چـــەکێکی گرنگـــی خۆرئاواییـــان بـــە دەوڵـــەتی دەستوریو حوکمی نوێنەرایەتیو شورایی دەزانی، لەم نموونەدا هەمان لۆژیـك بـە ئاراسـتەیەکی پێـچەوانەدا دووبـارە بۆتـەوە، واتـە: چـەکە وێرانکەرەکـەی خۆرئـاوا لـە ئایـدۆلۆژیا هەمەلایەنـە خوازەکـانی بـووە، خواستراوەو لەڕوانگەی ئەوەوە، ئایدۆلۆژیایەکی نوێی ئیسلامی دارێژرا! مـۆدێلێکیش لـە دەوڵـەتو حـوکمڕانی خرایـە ڕوو، کـە بـە (دەوڵـەتی ئیسلامی) ناسرا کە توانای بەرهەمهێنانەوەی هـەمان پەیوەنـدی نێـوان دەوڵەتی نوێو ئایدۆلۆژیا هەمەلایەنەخوازە نوێکانی لـە هەنـدێ ئاسـتدا

هەبێت! هەڵبەت ئەمە بێ ئەوەی هیچ ئاماژەیەکی تیابێ بۆ نیـازخراپی ئـەو بیرمەنـدو ڕێبەرانـەی ئـەم ئەرکـەیان ئـەنجام داوە، کـە گومـان لـە نیازپاکو دڵسۆزیان زۆر کەمە یان هەر نییە. بەڵام لەچوارچێوەی دنیـاو کاروبارەکانی دنیادا هەروەك (نەورەسی) دەڵێت (نیاز و کردار) ئاڵوگۆڕ بەسـەر شـوێنەکانیاندا دێـت، واتـە لـە دنیـادا: (النیـات بالأعمـال) بـە پێـچەوانەی کـارێ مەبەسـت تیایـدا خـواو ئـاخیرەت بێـت، یـاخود خاوەنەکەی چاوەڕوانی پاداشت بێت.

بانگەوازی ئیسلامی نوێ لە فیکری (اخوان)و دواتر (مەودوودی)شدا، لە سۆنگەی سروشتو مۆرکە کاردانەوەکـەی بەرامبـەر عەلمانییەتـەوە، هەمیشە هەوڵی داوە (دین) بـە جۆرێـك تێکـەڵ بـە دەوڵـەت بکـات، کـە بگاتە ئاستی توانەوەو جارێکی تر قابیلی لە یەکتر جیاکردنـەوە نـەبن! لەبەر ئەوە تەنانەت لەوەش دەترسێت یاخود ترساوە دروشمی (ئیسلام دیـنو دەوڵەتـە) بـە خـراپ لێکبدرێتـەوەو وابزانـرێ (دیـن) شـتێکەو (دەوڵەت) شتێکەو لە چوارچێوەی ئیسلامدا لە یەکدی جیـاوازنو بۆیـە بـەجیا نـاودەهێنرێن. کـە بـەبڕوای یـەکێ لـە بیرداڕێـژەکانی (برایـان)و ئایـدۆلۆژی ئیـسلامی نـوێ دوای (بـەننا) کـە (عبـدالقادر عـودة)یـە تێگەیشتنێکی لەو جۆرە هەڵەیە! چونکە ئیسلام دینو دەوڵـەتی بـە یەکـەوە گـرێ نـەداوە، بـەڵکو تێکـەڵ بـە یـەکی کـردوون! بـۆ ئـەوەی ئەگەری لە یەکجیاکردنەوەیان لە ئارادا نـەمێنێ! بـە جۆرێـك هـەروەك ئەو دەڵێت: ((دەوڵەت لە ئیسلامدا بووە بە دین و (دیـن)یـش بـووە بـە دەوڵەت))! . چونکە هەروەك ئەو دەڵێت ئیسلام تـەواوی کاروبارەکـانی

دنیا لەسەر بناغەی (ئاین) هەڵدەچنێت، (ئاین)یش دەكات بە پاڵپشتێك بۆ دەوڵـەتو (وسـیلة)یـەك بـۆ (ضـبط)كردنـی كاروبـاری حـوكمڕانیو ئاراستەكردنی حوكمڕانەكانو حوكم بەسەردا كراوەكان[1].

كە ئەم بیروڕایانەی (عودة)ش دەنگدانەوەی بۆچوونەكانی پێشووی دامەزرێنەری برایان واتە (بەننا)ن. ئەم پەیوەندییە ئاوێزانبوونەی نێوان (ئاین)و سیاسـەت لەسـەر ئاسـتی (ئـاین) و (دەوڵـەت) بـە هەمانـشێوە لەسـەر ئاسـتی (ئیمـان)و (موسـڵمان) داواكـاری رەنگدانـەوەی خـۆی دەبێت، بە جۆرێك، هیچ موسڵمانێك ئیمانو ئیسلامی تەواو نابێت ئەگەر سیاسی نەبێت. بـەو مانایـەی كارلێـك لەگـەڵ خـەمو ئـازارو كێـشەكانی ئوممەتەكەیـدا نـەكات. لەڕوویـەكی تـرەوە (سیاسـی بـوون) پێـوەری ناسینەوەی ئیسلامی بوونی كۆڕو كۆمەڵەكانیشە، بە جۆرێك هەر گروپو كـۆڕو كۆمەڵەیـەكی موسـڵمانان، سیاسـەت نەكاتـە ریـزی ئامانجـە پلـە یەكەكانی خۆیو سەرلەوحەی كارەكانی دەبێت بـەدوێی تێگەیـشتن لـە مانای (ئیسلام)دا بگەڕێتو عەودالّی بێت[2].

---

[1] عبدالقادر عودة، الأسلام و أوضاعنا السیاسیة، مؤسسة الرسالة، بیروت، ص٨٣.

[2] پەیامی كۆنگرەی پێنجەم/ د.توفیق الواعی، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢.

## فەسڵی سێهەم

## ڕەوتی ئیسلامی و پرسی بە ئایدۆلۆژی کردنی ئیسلام[1]

یەکێ لە خەسڵەتەکانی بانگەوازو فیکری ئیسلامیی حەرەکیی نوێ، بە ئایدۆلۆژی کردنی ئیسلامە. کە دەرهاویشتەی جۆراوجۆری لە ئاستە جیاوازەکاندا لێکۆتەوە. مەبەستمان لە ئایدۆلۆژیا چوارچێوەیەکی فیکری گشتییە کە سروشتو کۆمەڵگەو تاك لێکدەداتەوەو وا دەکات هەڵگرانی لە هەمبەر مەسەلە فیکریو سیاسیو ئابوریو کۆمەڵایەتییە جیاوازەکاندا هەڵوێستێکی فیکریو کرداری هاوبەشیان هەبێت[2].

---

[1] لەبەر گرنگی ئەم خەسڵەتە و بەرفراوانیو درێژی نووسینەکە پێمان باشبوو بیکەین بە فەسڵێکی سەربەخۆ.

[2] أسعد مفرّح و لجنة من الباحثين / موسوعة عالم السياسة، تعريف شامل بالسياسة فكراً و ممارسة، NoBiis، بيروت،٢٠٠٦، ج٢٢،ص٨٣.

واتــە لەڕوانگــەی ئــەو بیروبــاوەڕو فیکــرەوە ســەیری جیهــانو دەروبەریان بکەنو هەر لەسەر ئەو بناغـەش هەڵوێـست بگـرنو رەفتـار بنـوێننو بجوڵێنــەوە. زۆرجـاریش ئایـدۆلۆژیا بەتایبــەتیش لـە بەرگـە هەمەلایەنەکەیدا، دەبێتە کۆمەڵێ وەهمو بیروبۆچوونی ناڕاسـت. ڕێ لـە عـەقڵ دەگرێـت پـەی بـە واقیـعو راسـتیو حەقیقـەت ببـات. چـونکە قەناعەتــە ئایدۆلۆژییــەکان لەســەر بناغەیــەکی زانــستیو مــەعریفی دانەڕێژراونو بووە بە جۆرێ لە دەروێشایەتیو جەزبەگرتنی فیکری بـۆ خاوەنەکانی.

بیرمەندێکی مەغریبیش پێی وایە لە ئەزموونی شارستانێتی ئیسلامی دا (بانگەواز) ئەو چـەمکەیە گوزارشـت لـە نـاوەرۆکی ئایـدۆلۆژیا بـەمانا مۆدێرنەکەی دەداتەوە[1].

مەبەست لە بە ئایدۆلۆژی کردنی ئیـسلامیش ئـەو هەوڵـە ئیـسلامییە نوێیەیە کە ئیسلام وەك سیستمێکی هەمەلایەنەی ئابوریو کۆمەڵایەتیو سیاسی گونجاو بۆ جێبەجێکردن دەخاتە ڕوو بە چارەسەری کێشەکانی حــوکمڕانیو کۆمەڵگــەو ئــاڵۆزیو قــەیرانی سیاســیو ئابوریــەکان و سەرجەم کۆی کێشەکانی مرۆڤایەتی و سەردەم، دادەنێت[2].

هەڵبەت پرسی بە ئایدۆلۆژی کردنی ئاین (ئیسلام) هەروا بێ هۆکـارو مەلامەت نییە. بەڵکو زادەی مێژوو ژینگەو رەوشێکی دیاریکراوە. یەکەم ئامانج لەم هەوڵە گۆڕانی (ئاین)ە بۆ هۆکارێکی خـەبات کردنوململانـێو

---

[1] سلطان العاقل/ الدين بين الأدلجة و الأيدولوجيا. Aljasad.org ٢٠٠٧/٥/٧.

[2] أدلجة الأسلام alwaTan.com، ٣٠ / سبتمبر/٢٠١٦.

رووبەڕووبوونەوە. (لینین) کاتی خۆی وتوویەتی: کاری شۆڕشگێڕانە پێویستی بە تیۆری شۆڕشگێڕانەیە. کەسێك بە هەڵگرتنی تیۆری شۆڕشگێڕانە ـ کە هەمان ئایدۆلۆژیایە ـ لەوە تێ دەگات پێویستە چی بکاتو چی بدڕێنێت، بۆ ئەوەی ئایدۆلۆژیا (دینی بەئایدۆلۆژیا کراویش) رۆڵی ئەو ئامرازو هۆکارە ببینێت، دەبێت فیکرێکی سفتو سۆڵو بێ کەلێن و رەها گەرا بێت. چونکە ئایدۆلۆژیا لەگەڵ بۆچی و چوونە فەلسەفیەکانو گومانە زانستییەکانو لێبوردەییە عیرفانیەکاندا سازگار نیەو بەو لۆژیکەش مامەڵە ناکات، ئایدۆلۆژیا بە سانایی هێڵ بە نێوان خۆیو دوژمنەکانیدا دەهێنێتو سەنگەرەکانی بەرگری قایمو گەورە دەکات، بە پلەی یەکەمیش ئامرازی روخاندنە نەك بیناکردنو ئاوەدانکردنەوە[1].

مرۆڤی ئایدۆلۆژیست خۆی بە هەڵگری فیکرێکی رۆشنو باوەڕێکی پتەوی لە شکان نەهاتوو راست دەزانێت، کاتێ هێزێکیش بیەوێت دین بە ئایدۆلۆژیا بکات، سەروکاری لەگەڵ رەهەندە ئەخلاقی و رۆحانیە گەورەکەی ئایندا زۆر نییە.

ئەگەر ئایدۆلۆژیاش چەك بێت، هەروەك وتمان، ئەوا ئەم چەکە بەجۆرێك دروست دەکرێت کە لەگەڵ جۆری دوژمنو خەباتەکەدا گونجاو بێت. ئامانجی بنەڕەتی ئایدۆلۆژیاش بەجووڵە خستنە نەك دۆزینەوەی

[1] عبدالکریم سروش/ فر بە تراز أیدئولوژی،لا١٠٦

حەقیقەت و راستییەکان[1]. ئایدۆلۆژیا چەکی سەردەمی خەباتە نەك فۆرمی ژیانکردنێکی ئاسایی لە دۆخی سەقامگیریدا.

سەبارەت بە پەیوەندی (دین)و ئایدۆلۆژیا گرنگە لەوە تێبگەین، (دین) بە ئایدۆلۆژیا ناکرێت، (واتە ناکرێت لە هەمان کاتدا بێتە ئایدۆلۆژیاو ناوەرۆکی دینی خۆشی بەو جۆرەی هەیە پارێزگاری لێ بکات) پێویستمان بەوە نییە (دین) بکرێت بە ئایدۆلۆژیاوکارێکی ناڕەواشەو ناکامیو نائومێدیش بەدوای خۆیدا دەهێنێت.

خودا هەرگیز (ئاین)ی لە بەرگی ئایدۆلۆژیادا رەوانە نەکردووە. لە قورئاندا جیهانبینی، ئەحکام، بەهاکان، مێژوو ئامۆژگاری بونیان هەیە، بەڵام لەچوارچێوەی وشكو یەکجار بەکارهاتوودا نەخراوەتە ڕوو، بەڵکو سەرچاوەگەلێکی نەمرنو لێیان هەڵدەگۆزرێو ئیلهامیان لێ وەردەگیرێت[2].

هەربۆیە مەسەلەی بە ئایدۆلۆژی کردنی ئیسلامو کردنی بە فیکرێکی جوڵەخوازی شۆڕشگێڕو ئامرازی ململانێی سیاسیو شەڕی ناسنامەگەریی بەو جۆرەی بینراو و ڕوویدا، لەسەر حسابی رۆحە عەدالەتخوازە کراوەو گەردوونییەکەی ئیسلام بووە. کێشەی جۆراوجۆریشی بۆ کۆمەڵگەی موسڵمان نشینەکانو جۆری ئامادەبوونەوەی ئیسلام لەبواری گشتیو کێڵگەی سیاسیدا لێکەوتەوە. وزەو توانایەکی زۆریشی لە ململانێ خوێناوییە نەزۆکەکاندا بەفیڕۆ دا.

[1] سەرچاوەی پێشوو / لا١٠٦

[2] سەرچاوەی پێشوو، لا ١٢٦،١٢٥.

قەیرانێکی فیکری قوڵیشی بەدوای خۆیدا هێنا، چونکە فیکر لەسایەی ئایدۆلۆژیادا بەتایبەتیش ئایدۆلۆژیایەکی هەمەلایەنەی خەباتکارو شۆڕشگێڕدا. کە تەماحی گەورەی سیاسیو شارستانی هەبێت.

زۆربەی ئامرازەکانی گەشەکردنو نوێبوونەوەی خۆی لەدەست دەدات. بە حوکمی ئەوەی گەشەی فیکریو مەعریفی پرسیارو گومانکردنو پشکنینو دووبارە هەڵسەنگاندنەوە و پیاچوونەوەی ئەوەی هەیەو عەقڵی رەخنەیی دەخوازێت، کە هیچ کام لەوانە لەگەڵ سروشتی رەقو ئاراستەکەرو گومان هەڵنەگرو سازدەرو رەهایی گەراییو خۆ بەڕاستی رەها بینینی ئایدۆلۆژیادا ناگونجێن. هەر ئەوەشە وای کردبوو بۆ ماوەی دەیان ساڵ هیچ نوێبوونەوە و راچەنینێکی لە فیکری ئیسلامی دا روونەدات، ئەدەبیاتی ئیسلامی و بەتایبەتیش حەرەکیی، ببێت بە دووبارە بەرهەمهێنانەوەو دارشتنەوەو درێژەپێدانو شرۆڤەکردنی ئایدۆلۆژیاو تێگەیشتنی باو کە پێشەنگەکانی وەك (بەننا)و (مەودوودی) دایانڕشتبوو[1].

یەکێ لە رەنگدانەوەکانی بە ئایدۆلۆژی کردنی (ئاین) لای بزاڤی ئیسلامی نوێ ئەوەیە (کە هەموو شتێك قابیلی تێگەیشتنو

---

[1] بۆ نموونە سەیری کتێبەکانی نوسەرانی وەك: سەعید حەووا، فتحی یکن، یوسف قەرزاویو هاووێنەکانیان بکە، زۆربەی هەرەزۆری پەراوێز نوسینە لەسەر تێگەیشتنەکانی بەننا. بە مانای فکر هیچ ئیزافەیەکی دیارو شایانی باسیان نەخستۆتە سەر خەرمانی فکرو مەعریفەی ئیسلامی نوێ، گەر رەخنەیەکیشیان گرتبێت، بۆ ئەوە بووە بیسەلمێنن، لە فکری رەسەن و بنەڕەتی (اخوان)و (بەننا) لایان داوەو پێویستە بۆی بگەڕێنەوە.

تـەئویلکردنی ئاینییـە. لـە خوداپەرسـتییەوە تـا دەگاتـە سیاسـەتو سیستمی حوکمڕانیو ئابوریو هونەریو لێخوڕینی ئۆتۆمۆبێل)[1].

بـە ئـاینی کردنـی هـەموو شـتێكو سـەراپای ژیـان، بـە یـەکی لـە میکانیزمەکانی ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ دادەنرێن.

بـۆ ئەنجامـدانی ئـەم پرۆسـەش میکـانیزمێکی تـر داهێنـرا بـە نـاوی (تأصـیل) واتـە هـەموو شـتێ لـەم ژیانـەدا دەبێـت سـەرەتا بکرێـت بـە ئیـشکالیەتو کێـشەیەکی دینـیو بـە فلتـەری (دیـن) تێپـەڕێتو ڕێگـای بدرێت، ئەنجا قبوڵ بکرێتو باوەشی بۆ بکرێتەوە.

ئەم بیرکردنەوە ترساوە ناسنامەگەرا داخراوەش، بنەڕەت لە هەموو فیکرو ئەزموونو شێوازو میکـانیزمێکی نوێـدا بـە (حـەرام)و قەدەغـە و یاساغ دەزانرێت، تا ساغ دەبێتەوە وا نییەو (موباح)و ڕێپێدراوە ! ! ڕێك پێچەوانەی ئەو ڕێسایەی کـە دەڵـێ (الأصـل في الأشـياء الأباحـة) واتـە بنەڕەت لە هەموو شتێکدا ڕێپێدانو موباحو بێ کێشە بوونە.

هەر لە پەیوەندی بەم باسەوە مەسەلەیەکی تر کە لەم چوارچـێوەدا روویدا ئەوەیە کە (کلیفورد هیرتس) بـە بەئایـدۆلۆژی کردنـی تـەوەرەی بوونی تاکەکان ناوی بردووە، واتە لە چوارچێوەی ئایـدۆلۆژی ئیـسلامی نوێـدا کـە بەرهـەمی بەئایـدۆلۆژی کردنـی (ئیـسلام)ە، (ولاء)ی ئـاینی دەبێتە تەوەرەی بوونی تاکەکانو سەراپێی بوونیان دادەگرێت[2]!.

---

[1] نادر كاظم/ أدلجة الـدين و ادلجـة الحداثـة، الأبـتلاء بـالغرب www.alwasaTnews.com پێنج شەممە.. ١٨/مايو/٢٠٠٦

[2] نادر كاظم/سەرچاوەی پێشوو.

لەم خاڵەوەیە کە ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ لەکاتێکدا پاساوی بوونی خۆی لە پارێزگاری کردنی ناسنامەی کۆمەڵگەو چارەسەرکردنی قەیرانی ناسنامەدا دەبینێتەوە، دەبێتە سەرچاوەی جۆرێکی تر لە قەیرانی ناسنامە. کە ئەویش لە داننەنان بە فرە ڕەهەندی ناسنامەی تاكو کۆمەڵگەی موسڵمانی نوێدا خۆی دەبینێتەوە لەگەڵ پێداگری لەسەر ناسنامەی تاك رەهەند، (ناسنامە)ی تاکی موسڵمان لە چوارچێوەی ئەم ئایدۆلۆژییەدا یە، ئیسلام پێکی دەهێنێ. تۆ پێش هەر شتێ موسڵمانی، دەبێت (ولاء)و ئینتمات بۆ ئیسلام یەکلا کردبێتەوە، هەر رەهەندێکی تری ناسنامەو فۆرمێکی تری (إنتما)بوونیان هەبێت دەبێت لە سێبەری ئەودا بمێننەوەو بەلاوەکی سەیر بکرێن‌و لە کاتی پێویستیشدا قوربانیان پێ بدرێت ؟!.

هەڵبەت ئەگەر (ئیسلام) وەك (ئاین) سەیر بکرایە، واتە لە هەموو ئەو مەسەلانەی پەیوەستن بە بواری ئیمان‌و خواپەرستی‌و ئەخلاقی دینییەوە مرۆڤ دەبێت (ئینتما)ی بۆ ئاینەکەی هەبێت، مەسەلەکە زۆر کێشەی نەبوو، کێشەکە کاتێك دروست دەبێت ئیسلام بە ئایدۆلۆژی دەکرێت‌و ملکەچی دووبارە پێناسەکردنەوەیەکی هەمەلایەنەی سیاسی دەکرێت‌و (ئیمان)و (ناسنامەی دینی بە چەندین (فۆرم)و (قەناعەت) و شێوازی (حوکمڕانی)یەوە دەبەسترێتەوە. سەرچاوەی کێشەکانی ئەم ئایدۆلۆژیا دینییەش، وەك هاوشێوە سیکۆلارەکانی لە هەمەلایەنەبوون‌و، پێویستیەکانی سازدان‌و تا ڕادەیەك شتنەوەی

مێشکی هـەڵگرو ئەنـدام و لایـەنگرە، لـە هـەر تێگەیـشتن‌و بۆچـوونێکی جیاواز لەوەی ئایدۆلۆژیاکە دەیخاتە روو.

کاتێك ئایدۆلۆژی ئیسلامی نوێ (ئیـسلام) دەکـات بـە هـەموو شـتێك (هەڵبەت کە بەو کـارە زوڵمێکـی گـەورە لـە ئیـسلام دەکـات) وە داوای (ولاء)ی رەها لە ئەندام دەکات لەسـەر ئـەو بناغەیـە، بەرجەسـتەبوونی ئایدۆلۆژیاکەش بە کاتی لە مۆدێلێکی دیاریکراوی حوکمڕانیدا بەرجەستە دەبێت کە پێی دەڵێن دەوڵەتی ئیسلامی‌و دواتر حوکمڕانی نێودەوڵەتی ئیسلامی لە بەرگی خەلافەتدا. وە جیهانی دابەش کرابێت بـۆ (دینـی) و (نادینی)و ناوەرۆکی ناسنامەکە بە گشتی لـە روانگـەی پێویـستیەکانی ململانێـی (ئیـسلام) و یـاخود (دیـن) و (سیاسـەت) دیاریـدەکرێت‌و دەخەملێنرێن، ئـەو کاتـە ناکرێـت تـۆ لەیـەك کاتـدا موسـڵمانیش بیـت‌و نەتەوەیش بیت! بۆ نموونە ناکرێـت مـن نووسـەری ئـەم دێڕانـە، داوای دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان بکەم لە هەمانکاتدا خۆم بە ئیـسلامی، بـەڵکو بـە موسـڵمانیش بـزانم!! چـونکە ئایـدۆلۆژیای ئیـسلامی نـوێ کێشەی قوڵی لەگەڵ نەتەوەایەتیدا هەیەو تاکە یـەك فـۆرمی (ئوممـە)ی سیاسـی دەناسـێت، کـە ئـەویش ئوممـەتی ئیـسلامییە، یـاخود گـەلی موسـڵمانە لـە سـایەی دەوڵەتـە ئیـسلامی دا وەك دەسـتپێکێك بـۆ گێڕانـەوەی سـەروەریی نێودەوڵـەتیی ئوممـەتی ئیـسلامی! لـەڕوویێکی ترەوە بە ئایدۆلۆژی کردنی (ئیسلام) کێشەیەکی گەورەی، بۆ تواناکانی ئیسلام، بۆ لـەخۆگرتنی ئەزموونـەکانی دەرەوەی خـۆی دروسـت کـرد.

چونكە ئایدۆلۆژیا لە چوارچێوەیەكی داخراوی زهنیی ئاخنراوو سیخناخ بە چەمكو گوتەزای كۆتایيو گومان هەڵنەگر بەرجەستە دەكات[1].

ناتوانێت دەستكەوتەكانی مرۆڤایەتی وەك ئەوەی پێویستە لەخۆ بگرێتو بیانخاتە خزمەت كۆمەڵگە موسڵماننشینەكانو خودی بزاڤ و تەوژمە ئیسلامییەكەشەوە. بە پێچەوانەی ئەزموونی ئیسلام لەگەڵ كولتوری فەلسەفی یۆنانيو چەندین كولتوری تر، كە لەخۆی گرتنو كردنی بەبەشێك لە كولتوری موسڵمانان، هۆیەكەشی ئەوەبوو، كە ئیسلامو دنییێی ئیسلام لەو كاتەدا بەهێزبوونو هەستیان بەلاوازی نەدەكرد. مەڵبەندە هەرە گەشەكردووەكەی شارستانی مرۆڤایەتیان لەو برگە مێژووییيەدا پێكدەهێنا. لەلایەكی ترەوە ئیسلام بەو جۆرەی ئێستا لە (قالَب) نەدرابوو نەكرابوو بە ئایدۆلۆژیا. بە حوكمی ئەوەی ((ئایدۆلۆژیا فۆرمێكی رزگارییەخش بە خۆی دەداتو دژی هەموو فیكرەیەكی دەرەوەی خۆیەتی ))[2].

سروشتی ئایدۆلۆژیا بە گشتيو لەوانەش ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ، بە جۆرێكە كێشەی لەگەڵ فیكر و دەرەوەی خۆی بەگشتی هەیە، لەبەر چەندین هۆ كاری جیاوازو وێناكردنی خۆيو ئەو رۆڵەی بۆ خۆی لەژیانو بووندا دیاریكردوون، ئایدۆلۆژیا بێ نیازە لە دەرەوەی خۆی! چونكە خۆی بە هەڵگری وەڵامە راستو كۆتا هاتووەكان دەزانێت، بینای خۆی

---

[1] د. محمد عبدالجبار الرفاعی، چاوپێكەوتن، مركز الآفاق للدراسات و البحوث،. com qataqenTer ٢٠١٥/٣/٦.

[2] د. محمد عبدالجبار الرفاعی، سەرچاوەی پێشوو.

لەسەر تێکشکاندن و سڕینەوەی بەرامبەر دەکات، هەڵبەت ئەگەر بوونی فیزیکیشی نەسڕێتەوە، وەك هاوبەشێك حەقیقەتی لەگەڵدا دابەش دەکات، مامەڵەی لەگەڵ ناکات، هەر ئەمەشە لەپشت کێشەی قوڵی ئایدۆلۆژی ئیسلامی نوێ لەگەڵ، نەتەوایەتی، دیموکراسی و فرەیی، خۆرئاواو چەندین شتی تر. ئەگەر هۆکارەکانی لاوازی ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ بۆ لەخۆگرتنی دەستکەوتەکانی شارستانی نوێ و دەرەوەی خۆی لەناو خودی ئەدەبیاتی ئیسلامی بەرەچاوکردنی سروشتی ئایدۆلۆژیا خۆی بگەڕێت، دەتوانین سەرچاوەی ئەو لاوازی و کێشەیە بۆ چەندین هۆکاری جۆراوجۆر بگێڕینەوە لەوانەش:

١. خۆرئاوا لە دۆخی داڕماندایە: پێشگریمانەیەکی ئایدۆلۆژی (برایان) لەسەر زاری دامەزرێنەرەکەی ئەوەیە کە رواڵەتەکانی شارستانی نوێی خۆرئاوا ماددی ڕوتن، هەموو ئەوەی ئاینە ئاسمانییەکان هێناویانە دەیڕوخێنێ! دژبەیەکی (تناقض)یشی لەگەڵ بناغەکانی شارستانێتی ئیسلامیدا هەیە (واتە ئەوەی حوکمی پەیوەندی نێوانیان دەکات ململانێیە) لە گرنگترین رواڵەتەکانی شارستانێتی نوێی خۆرئاواش ئەمانەی خوارەوەن:

(١) گومانکردن لە خوا و نکولی کردن لەبیربردنەوەی سزاو پاداشتی دوارۆژ.

(٢) بەرەڵایی و تێکچڕژان لەسەر چێژو هونەر نواندن لە بەربەرەڵاکردنی رەمەك (غرائز)ەکان و تێرکردنی شەهوەتی ورگ و سێکس. هەروەها رازاندنەوەی ئافرەتە بۆ سنووری سەرشێتی و

شـەیدایی و رۆچـوون لـە خراپەکاریـدا بـە جـۆرێ جەسـتەو دەروون و عەقڵەکان تێکبشکێنێو سیستمی خێزان لەناو بەرێت؟.

(٣) خۆپەرستی تاکەکان بەجۆرێ هەر تاکێ جگە لە چاکەی خـۆی چاکەی کەسی ناوێت، هـەموو نەتەوەیـەك دەمـارگیری بـۆ نەتەوەکـەی خۆی هەیەو دەیانەوێت ئەوانەی لاوازن حەپەلوشیانبکات.

(٤) سوو (ریبا) بناغەی مامەڵەکردنە.

ئەم رواڵەتە ماددیانەی شارستانێتی خۆرئاواش کۆمەڵی بەرەنجامیان لێ کەوتۆتـــەوە لەوانـــەش: گەنـــدەڵبوونو خراپبـــوونی دەروونـــەکان، لاوازبـوونی رەوشـت و، پـشت سـاردبوونەوە لـە بەگژداچـوونەوەی تاوانـــەکان، زۆربـــوونی کێـــشەکانو ســـەرهەڵدانی بـــیرورِاو بنـــەما روخێنـــەرەکان، لەگـــەڵ شۆڕشـــە وێرانکـــەرو تێکـدەرەکان. سیـستمە سیاسیو ئابوریـیـەکان دووچـاری پەشـۆکاوی هـاتوونو لەسـەر دۆخێـك ناگیرسـێنەوە، دەوڵەتـەکان بـەهۆی تایەفـەو حیـزبو بەملیەکـداهاتنی گەلەکان لەسەر کینەو چاوچنۆکی کەرتو پەرت بـوون! بـەجۆرێك ئـەم شارسـتانێتییە نوێیـە بێتوانـایی تـەواوی خـۆی لـە چارەسـەر کردنـی کێشەکانو دەستەبەرکردنی کۆمەڵگەیەکی مرۆڤانـەو دڵنیـایی و ئاشـتی دەرخستووە، هەروەها لەگەڵ هەموو ئـەو زانـستو مەعریفـەو هۆکـاری ژیانو سامانو دەوڵەمەندییەی بۆ خـەڵك فەراهـەمی کـردووە، شکـستی خواردووە، لە بەختەوەرکردنی خەڵکدا[1].

---

[1] مجموعة رسائل، ب. یەکەم، لا ٢٣٠-٢٣١.

ئەوەی لەم پەرەگرافەی پێشووی (بەننا)ی دامەزرێنەری (اخوان)دا هەستی پێ دەکرێت‌و شایانی ئاماژە پێکردنە لانی کەم لە پەیوەندی بە بابەتەکەی ئێمە، ئەم خالانەی خوارەوەیە:

(١) جیهان دابەشدەکرێت بەسەر دوو ناونیشان‌و بژاردەو شارستانیەتدا، (ئیسلام) و (دەرەوەی ئیسلام) خۆرئاواش بە حوکمی گواستنەوەی قورسایی بنکەی شارستانێتی بۆ ئەوێ‌و هەژموونی بەسەر دنیادا، نوێنەرایەتی دەرەوەی ئیسلام‌و تەحەدێی سەرەکی‌و هەرە گەورەکان دەکات. کە دیارە کۆمۆنیزم‌و سەرمایەداری لەم پۆلێن‌و ریزبەندییەدا جیاناکرێنەوە، چونکە هەردووکیان دوو بەشی جیاوازی شارستانێتی نوێی خۆرئاوا پێکدەهێنن.

(٢) ئەم وێنایەی خۆرئاوا بە ڕوونی قەیرانی سییەکانی سەدەی بیستەم‌و هەلگیرسانی جەنگی مال وێرانکەری دووەمی جیهانی‌و ئاسەوارە دەروونی‌و کۆمەلایەتی‌و ئابوری‌و فیکری‌و کارەساتبارەکانی پێوە دیارە، کە هەروەك دەزانین دەرکەوتنی ئایدۆلۆژیا دژی مرۆڤایەتییەکانی وەك فاشیزم‌و نازیزم‌و پێشتریش کۆمۆنیزم‌و شەڕە جیهانییەکان، تا ئومێدییەکی قولی لە خودی ئەوروپادا خولقاندبوو.

(٣) بە پێچەوانەی بیری ئیسلاحخوازی ئیسلامییە گەورەکانی سەدەی نۆزدە (خۆرئاوا) لەم وێناکردنەدا[١]، یەك خۆرئاوایەو دابەش ناکرێت، ئەگەر لێی ئەوان خۆرئاوا (ئیستیعمار)و رووە

---

[١] د. رضوان السید، سەرچاوەی پێشوو.ل٣٦.

ماددیگەرییەکـەیان، لـە خۆرئـاوێی بـەرزو دیموکراسـیو عەقڵانییـەتو پێـشکەوتن جیـا دەکـردەوە، ئـەوا لـەم وێناکردنـەدا هـەموو ئـەو جیاکردنەوانـە ون دەبـن، خۆرئـاوا دەبێـت بـە مەڵبەنـدێکی داڕووخـانی گـەورەی ئـەخلاقیو خۆپەرسـتیو چـێژ پەرسـتیو گـورگ سـیفەتیو چاوچنۆکیو بەڕەڵاییو نکولی کردن لە بەها جوانەکانی مرۆڤایەتی؟!.

لەم وێنایەدا (لۆك)و( روسۆ)و (هیتلەر)و (مۆسۆلۆنی)و (ئۆکسفۆرد)و (یانەیەکی شەوانە) یەك حوکمیان بەسەردا دەدرێت! چـونکە خۆرئـاوا نوێنەرایـەتی (ظلمـات) دەکـاتو یـەك پارچـە غـەرقی تۆفـانی خۆڕووتکردنەوەیە لە هەرچـی پێـی دەوترێـت ئـەخلاقو لێپرسـراوێتیو خەسڵەتی مرۆڤایەتی؟ خۆرئاوایەکی بەم جـۆرەش کـە وێنـاکراوە، نـەك هی ئەوە نییە مرۆڤ وەك مەڵبەندێکی شارسـتانی مرۆڤایـەتی وا سـەیری بکـات، کـە شـایانی لێـوە فێربوونـە، بـەڵکو هـەموو بـاوەڕدارو ئـەخلاق دۆسـتێ دەبێـت قێـزی لێ بکاتـەوەو نـەفرەتی لێ بکـاتو بەربـەرەکانی بکات.

رەتکردنەوەی کۆی خۆرئـاوا و کورتکردنـەوەی شارسـتانێتییەکەی وەکو ئەو، لەو رواڵەتانەدا کە ئاماژەی پێ کراوە، رێگا خۆش دەکات بۆ ئەوەی کۆی خۆرئاوا (جگە لە زانسـتە سروشـتییەکەی) رەتبکرێتـەوە! پـێم وایـە ئـەوەش پێداویـستییەکی خـەملێنی ئایدۆلۆژییـە ئیـسلامییە نوێکەی (برایان)بوو، بۆ ئـەوەی وەك (جێگـرە)وەی کـۆی رواڵەتـەکانی ژیانی خۆرئاواگەراییو خودی شارستانێتییەکە خۆی بخاتە ڕوو، ئامادە نەبێت هیچ بوارو کێڵگەیەکی لەگەڵدا بەش بکات.

(٤)   ئەو وێنایەی خۆرئاوا کە خراوەتەڕوو، بە پلەی یەکەم رووە کۆمەڵایەتییەکەیەتی، ئەو ڕووەیە کە ڕەنگدانەوەی لە وڵاتانی ئیسلامیدا بینراوە، بە مانایەکی تر، خۆرئاواناسینێك نییە بەرهەمی لەنزیکەوە ببینین‌و سەردانی مەیدانی‌و هەڵسەنگاندن بێت بەو جۆرەی لێی (رفاعة تەهتاوی) و (شیخ محمد عەبدە) و (جمال الدین ئەفغانی) دەیبینین، حوکمدانە بەسەر خۆرئاوادا لە ڕوانگەی ئەو رواڵەتانەی کە دواتر بە خۆرئاواگەرایی ناوبراو بەسەر ژیانی بەشێ لە خەڵکی‌و وڵاتانی ئیسلامی‌و لەوانەش میسر رەنگی دابۆوە، کە لە خواردنەوەو فڕێدانی حیجاب‌و گوێ نەدان بە ئەرکە ئاینییەکان‌و هاوچەشنەکانیان خۆی دەبینییەوە، لەگەڵ هەندێ نوسین لەسەر شارستانێتییەکە.

ئەمەش تێگەیشتنی ئاسانە چونکە (اخوان) لە سەرەتاوە بۆ ماوەی (١٠) ساڵ زیاتر لە بەرگی بانگەوازێکی ئاینی‌و چاکسازی کۆمەڵایەتی‌و ئەخلاقیدا خۆی دەناساند. ئامانجێکی گەورەی رووبەڕوو وەستانەوە بوو لەگەڵ رواڵەتەکانی شێوە ژیانی خۆرئاوادا، کە بە خێرایی لە میسرو وڵاتانی تری ناوچەکەدا لە بڵاوبوونەوەدا بوو.

(٥)   ئەو رواڵەتانەی شارستانێتی خۆرئاوا کە بە جەوهەرو ناسنامەی سەرەکی ئەو دەستنیشان کراون، دژبەیەکی (تناقض)یان لەگەڵ بناغەکانی شارستانێتی ئیسلامی دا هەیە، ئەمەش هەروەك وتمان دەیخاتە ڕوو کە هیچ شانسێکی لە یەك نزیکبوونەوەو بەیەك گەیشتن‌و کارلێکردن لەگەڵیدا بوونی نییە ! !

بنەڕەتی پەیوەندی لەگەڵ ئەم شارستانێتییەدا ململانێیە، هەروەك چۆن لە مەنزومەی فقهی تەقلیدی مێژوویی‌و لۆژیك‌و عەقیدەی سەلەفیەتی جیهادی نوێشدا لەڕووی بنەڕەتەوە، بنەڕەت لە پەیوەندی لەگەڵ (دارالحرب)دا، جەنگە نەك ئاشتی. ئەوپەڕی ئەوەی لەگەڵیدا بکرێتە رازی بوون بە ئاگربڕ (هدنة) لەگەڵیدا، لە سۆنگەی ناهاوسەنگی هێزەکان یاخود هەر بەرژەوەندییەکی تردا.

لەم دیدی ئایدۆلۆژییە ئیسلامییە نوێیەشدا خۆرئاوا (دار الآثام)ە، مەڵبەندی گوناهو سەرپێچی‌و تێکشکانی پەیکەری ئەخلاقی مرۆڤایەتییە. نوێنەراتی ئەو (ظلمات)ە دەکات کە دەبێت رووناکی پەیامی خودا بیگاتێ‌و رزگاری بکات‌و لە چنگ شەڕو تاوان دەری بێنێ[1].

خۆرئاوا بابەتێکە بۆ بانگەواز، لە بنەڕەتدا دەبێت ملکەچی (دار الأسلام) بێت‌و لەژێر رکێفی ئەودا بێت. بەو جۆرەش لە ئێستادا بە هێزێکی یاخی لەقەڵەم دەدرێت. خۆ ئەگەر هێزی موسڵمانان بەو جۆرە نەبێت، بەهێز ملکەچی بکات‌و سەروەری دەسەڵاتی ئیسلامی‌و شەریعەتەکەی بەسەردا بسەپێنێ، ئەوا لەڕووی ئایدۆلۆژی‌و دەروونییەوە، دەتوانێ دانی پێدا نەنێت‌و رەوایەتی لێ وەربگرێتەوەو وەك سەرچاوەیەکی خراپەو تاوان بیناسێنێ و ململانێی لەگەڵدا بکات‌و

---

[1] ئاماژە بە ئایەتی: (الر ۚ كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ النَّاسَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَىٰ صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ) ابراهيم/١.

گــەلانی موســڵمان لــە پــیلانو جەوهــەری شارســتانێتییە ماددییــە نائەخلاقییەکەی ئاگادار بکاتەوە ! ! . ئەم دیدەش بۆ خۆرئاوا سـەرجەم مەسـەلەکان دەکـات بـە ئـایینیو حـساب بـۆ ئەزموونـەکانی مرۆڤایـەتی ناکات، دیدێکە پێش ئەوەی واقیع دروسـتی بکـات، مێـژوو دایدەڕێـژێ، هەروەها پێش ئەوەی بەرهەمی خوێندنەوەیەکی رەخنەییو هاوسەنگی واقیعی شارستانیەتەکە بێت، کورتکردنەوەیـەتی لـەڕووی ئیـستعماریو ئــایینیو کۆمەڵایەتییەکــەی، هەڵبــەت بــەو پێوەرانــەی ئایــدۆلۆژیا ئیسلامییەکە دیاریان دەکاتو رەوایەتیان پێ دەدات.

گرنگە بزانین ئەم وێنا سەرەتاییە بۆ خۆرئاوا هەڵوێـست دیـاریکردن بەرامبەری، کە هیچ جیاوازییەکی وێی لەگەڵ دیدی خۆرهەڵاتناسـانە بـۆ هەڵــسەنگاندنی ئیــسلامو دنیــای ئیــسلامو مێــژوو و واقیــعو شارستانێتییەکەی نییە، لە پشت بەشێکی گرنگی ئەو قەیرانە فیکـریو کێشەو ململانێتیانەوە بووە، کە دووچاری تەوژمی ئیسلامیو هەڵگرانی ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ بوون، بەشـێ لـە هـەر چاکسازییەکیش لـەم روەوە لــە دووبــارە بیناکردنــەوەی وێنــەی خۆرئــاواو سروشــتی پەیوەندییــەکان لەگەڵیـداو لێجیاکردنـەوەی خۆرئـاوا جیاوازەکـان لـە یـەکتر، دەسـت پێـدەکات. بـە جۆرێـك دەبێـت لـە بـە نـەفرەتکردنو قێزەونیــی خۆرئــاواوە بگەینــە دیــاریکردنی رووە دوژمنکارییەکــەی خۆرئاوا، کە بەرژەوەندییە سیاسیو ئابوریو سـتراتیژییەکان (تحکـم)ی تێدا دەکـەن، لەگـەڵ رووە ژیـاریو ئـەخلاقیو مـەدەنیو دیموکراسـیو مافی مرۆڤ و هاوڵاتییەکەی خۆرئاوا، کە بۆ ئێمە (تەحەدا)یەو مایەی لێ

فێربوونه. نەك دوژمنایەتیو رەتكردنەوە. كاتێكیش دەبینین بە بەشێ لە شارستانی نوێ ئەو كاتە هەوڵ دەدەین بەشدارییەكی راستەقینەمان لە چاكسازی كردنی رووە نەخۆشو خراپو شەڕخوازەكەیدا هەبێت بە حوكمی ئەوەی ئێستا ژیاری هەموانە.

٢. ئەگەر ئەوە وێنەی خۆرئاوا بێت بە سیفەتی پێویستیەكی خۆپێناسەكردنی ئایدۆلۆژیو خۆجیاكردنەوەو ناسنامە، ئەوا پێشگریمانەیەكی تری ئایدۆلۆژی (برایان)و بەننا لەم رووەوە دەبێت بە تاكە چارەسەرو سەرچاوەی بەختەوەری لە جیهاندا (ئیسلامە) ئیسلامو بەس، جارێ پێش هەموو شتێك دەبێت بزانرێت كە بەختەوەری پەیوەستە بە دڵو دەروونو لەوێوە هەڵدەقوڵێ نەك لە دەوروبەری ماددیو دەرەوەی مرۆڤەوە، هیچ ئاینو رێنوێنییەكیش بوونی نییە وەك ئیسلام بەختەوەری بۆ مرۆڤ دەبین بكات[1].

هەر لەم چوارچێوەدا (بەننا) لە پەیامی (بۆ لاوان)دا روو دەكاتە لاوانی (برایان)و دەڵێت: (ئەی لاوان) باوەڕێكمان هێناوە هیچ مشتومڕو گومانێك هەڵناگرێت، باوەڕمان بە بیروباوەڕێ هێناوە پتەوتر لە چیاكانو قوڵتر لە پەنهانەكانی ویژدان، كە تەنهاو تەنها یەك رێبازو فیكر هەیە ئەم دنیا سزدراوە دەرباز بكاتو مرۆڤایەتی سەرسامو واق وڕماو و خەڵكی بەرەو رێگای راست رێنوێنی بكات. لەبەرئەوە شایستەی ئەوەیە لە پێناو راگەیاندنو مزگێنی پێدانو سازدانی خەڵك

[1] مجموعة رسائل، ب. دووەم، لا٩-١٠.

لەسەری قوربانی بدەن. ئەم ڕێبازەش ئیسلامە (هەڵبەت ئیسلامی برایانو بەو جۆرەی ئەوان لێی تێگەیشتوون) کە ڕاستو دروستو بێ خواریو لاری و خراپەو گومڕایی[1].

هەرلەو ڕوانگەوە هیچ هەنجەتێکمان نییە بۆ لادان لە ڕێگای (هەق). ڕێگای ئیسلام وە شوێن ڕێگای زرقو برقو حەزو ئارەزووەکان بکەوین. کە ڕێگای ئەوروپایە. لە ڕێگای ئەوروپادا زینەتو کەشخەییو چێژو دەستبلاویو بەرەڵاییو بێ بەندو باویو هەموو ئەوەی تێدایە کە دەروون لە چێژ ئارەزووی دەکات. هەموو ئەو شتانەش بەلای دەروونەوە خۆشەویستو داواکراون[2].

بەڵام ڕێگای ئیسلام ڕێگای سەربەرزی و هەقو هێز، فەڕو ڕاوەستاوی، خۆگریو فەزیلەتو نەفس بەرزییە، لەگەڵ ئۆممەتەکاندا بیگرنەبەر خودا پشتان دەگرێت (ڕوو بە برایان). ئەوەی ئەوروپای بە لەرزە خستوە، زیادە چێژو خۆشیو چێژو چاوچنۆکییە: ﴿وَإِذا أَرَدْنا أَنْ نُهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنا مُتْرَفِيها فَفَسَقُوا فِيها فَحَقَّ عَلَيْهَا الْقَوْلُ فَدَمَّرْناها تَدْمِيرًا﴾[3]. بەڵام دەبێت ئەوە بزانن کە خودا پێغەمبەرەکەی بە میهرەبانی بۆ جیهانیان تا ڕۆژی قیامەت ناردووە، کتێبی خۆی پێدا ڕەوانە کردووە، کە هەقو نورو ڕێنوێنییە تا ڕۆژی دوایی.

---

[1] مجموعة رسائل، ب. دووەم، ل١٤٣.

[2] مجموعة رسائل، ب. یەکەم، ل١٥١.

[3] الأسراء/١٦.

ڕێبەرایەتی پێغەمبەریش (ﷺ) بە سوننەتەکانی بەردەوامە، سوڵتانی قورئانیش بە بەڵگەکانی بەهێزە، وە مرۆڤایەتی بەبێ هیچ گومانێك، بە دەسەڵاتی دەسەڵاتدار یاخود سەرشۆڕی سەرشۆڕ، زوو بێت یان درەنگ بەرەو ئیسلام دێن ئەوساش بەڵێنی خودا دێتە دی کە قورئان دەفەرموێت: ﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَىٰ وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ﴾ الصف/٩ [١].

چونکە سەراپای جیهان واقوڕماوو سەرسامو پەشۆکاوە، هەرچی سیستەمو ڕێبازیشە تیایدا نەیانتوانی چارەسەری بکەن، بۆیە تاکە دەرمان ئیسلامەو جگە لەو هیچ دەرمانێکی تر بوونی نییە. ئێوەش بەناوی خودا بکەونەڕێو پێشکەون بۆ ڕزگارکردنی، هەمووان لە جیهاندا چاوەڕوانی ڕزگارکەرێکن هیچ ڕزگارکەرێکیش جگە لە پەیامی ئیسلام کە ئێوە مەشخەڵەکەتان هەڵگرتووە و مزگێنی پێ دەدەن، بوونی نییە [٢].

ئەم وێناکردنە دەرخەری خەسڵەتێکی ئایدۆلۆژی بوون، لە جەوهەردا تەرحێکی ئایدۆلۆژی هەمەلایەنەی ڕزگاریبەخشە، بۆ پشکنینو هەڵسەنگاندنو لێکۆڵینەوەی زانستیو تاقیکردنەوە نییە، بۆ دیارییکردنی ڕاستی و ناڕاستی، وابوونو وانەبوونو ئاستی ڕەنگدانەوەی بۆ واقیعو ڕاستی، گوێ لە قسەی بەرامبەرو ڕێی دەرەوەی ماڵی ئایدۆلۆژیای دیاریکراو ناگرێت. دۆگمابوونی ئایدۆلۆژیاش

---

[١] مجموعة رسائل، ب. یەکەم، لا١٥٢.

[٢] مجموعة رسائل، ب. دووەم، لا١٤٦.

هەر لێرەوە دەست پێدەكات. چونكە ئایدۆلۆژیا تاك رەهەندو تاك سەرچاوەو تاك پێوەرە. لەگەڵ فرەیی‌و هەمەڕەنگی‌و رەخنەو هەڵسەنگاندنی دەرەكی دا هەڵناكات، ئایدۆلۆژیا بۆ بڕوا پێهێنان تەرح دەكرێت. هەروەك ئاین بڕوایی پێ دەهێنرێت، هەر ئەوەندەی باوەڕیشت پێ هێنا تۆ دەبیت بە ئامرازو ئەو بە ئامانج! ئەم وێنایەش بۆ جیهان هەمان شتە، تێكۆشەری ئیسلامخوازو ئایدۆلۆژیستی باوەڕدار دەبێت قەناعەت‌و باوەڕی وابێت، جیهان دەردەدارو یەك پارچە ئازارو قەیرانە. جیهانێكە لەبەردەم كێشەو نەخۆشیەكاندا دەستەوسان وەستاوە، چونكە تاكە یەك چارەسەر بۆ دەردو ئازارو كێشەكانی هەیە و ئەویش تاكو ئێستا دەستی پێ نەگەیشتووە، كە ئەویش ئیسلامە بە خوێندنەوەی هەڵگرانی ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ‌و رێبەرانی جوڵانەوەی ئیسلامی!

پێویستیش ناكات بپرسرێت وردەكاری ئەم چارەسەرەی ئیسلام چۆنەو چۆن وەردەگێردرێت بۆ بەرنامەو پرۆگرامی كرداری؟ یاخود لەكاتێكدا ئیسلام ئاینە چۆن دەتوانێ چارەسەری كۆی كێشە سیاسی‌و ئابوری‌و كۆمەڵایەتییە نا ئاینییەكانی بەو هەموو ئاڵۆزییەو لە دنیایەكی جەنجاڵی پڕۆ بەرژەوەندی تێكچڕژاو بەیەكدا چوودا بكات ؟ خۆ ئەگەر ئەوە وەزیفەی ئیسلامە ئەدی بۆچی موسڵمانان خۆیان ناتوانن بۆ چارەسەری كێشكانی خۆیان بەكاری بێنن؟ یاخود تۆ بڵێی لەكاتێكدا لەپێش قۆناغی مۆدێرنەو لە سایەی ئیمپراتۆریەتە ئیسلامییەكاندا بە ناوی ئەوەوە حوكمڕانی كراوە، داخۆ بە كرداری كێشەكان چارەسەر

کراون؟ یاخود لە بنەڕەتەوە ئەمە ئەرکی ئیسلام نییەو بێ دیدگاییو پرۆژەی سیاسی وا دەکات ئەم ئەرکە قورسە روو بکاتە ئەو؟ چاوەڕوانی گەورەی لەسەر دروست بکرێتو سەرەنجام لە شتێکدا تاقی بکرێتەوە، کە لە بنەڕەتدا ئەرکی مرۆڤی موسڵمانە نەك ئیسلام وەك ئاین؟! دوای گریمانەی جیهانی دەردەدارو ئیسلامی چارەسەرو سەرەنجام قایل بوونی مرۆڤایەتی بەو چارەسەرە جا بەخۆشی بێت یاخود بە زۆر ( بعزّ عزیز أو ذلّ ذلیل) هەروەك لە دەقەکەی بەنندادا هاتووە. پێش گریمانەیەکی تر دێت.

سێهەم: توانای لەڕادە بەدەر: دوای باوەڕهێنان بەوەی شارستانێتی خۆرئاوا لەناو زەلکاوی ماددەو سێکس و خۆپەرستیو بەرەڵایی دا دەتلێتەوەو سەرچاوەی بەدبەختیو چارەڕەشی مرۆڤە، هەروەها بڕوابوون بەوەی کە سەراپێی جیهان لە رەنجو ئازارو کێشەو سەراسیمەبووندا جنگڵ دەداو دەتلێتەوە، بێ ئەوەی هیچ فیکرو رێبازێك جگە لە ئیسلام لە بەرگی ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ دا بە تاکە چارەسەر بۆ دەردەکانی مرۆڤایەتی، تێکۆشەری باوەڕدارو ئایدۆلۆژیست نابێت گەورەیی ئەرکەکانو درێژی رێگاو زۆری بەربەستەکان گومانی بۆ لە تواناکانی خۆیو هاوڕێبازانی یاخود واقیعی بوونی دروشمو ئامانجەکانی ئایدۆلۆژیاکەی بۆ دروست بکات. بەننا ڕوو دەکاتە شوێنکەوتووانیو پێیان دەڵێت: (ئەگەر ئامانجی رزگارکردنی نیشتمانی ئیسلامی، دروستکردنی حکومەتی ئیسلامی، گێڕانەوەی گیان بۆ دەوڵەتی ئوممەتی ئیسلام بە گێڕانەوەییەکیەتی دنیای ئیسلامو

خەلافەتو مامۆستایەتیکردنی جیهانو گەیاندنی بانگەواز بە سەراپای جیهان، بەڕاستی گەورەو گرانن، خەڵکی بە خەیاڵیان دەزانێت، بەلآم برای موسڵمان وەك راستیو حەقیقەت دەیانبینێت جا دەڵێ ئێمە هەرگیز نائومێد نابین. مەگەر خودا نافەرمووێت: ﴿وَقَالَ الَّذِي اشْتَرَاهُ مِنْ مِصْرَ لِامْرَأَتِهِ أَكْرِمِي مَثْوَاهُ عَسَىٰ أَنْ يَنْفَعَنَا أَوْ نَتَّخِذَهُ وَلَدًا ۚ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الْأَرْضِ وَلِنُعَلِّمَهُ مِنْ تَأْوِيلِ الْأَحَادِيثِ ۚ وَاللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰ أَمْرِهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾[1]. يوسف/٢١

له شوێنێکی تردا و دوای ئاماژەکردن بە (٧) ئامانجەکەی برایان رووبەڕووی دڵساردکەرەوەکان دەڵێت: (با کورتبینە ترسنۆکەکان هەڵبێن ئەمە خەیاڵپلآوەو وەهمێکە دەستی بەسەردا گرتوون، ئەمە ئەو زەبونییەیە چۆتە دڵی ئەم نەتەوەو بە هۆیەوە دوژمنانی دایانپلۆسیوەو ژێرچەپۆکیان کردووە. هەروەها ئەوەیە کە (ئیمان) لە دڵدا وێران دەکاتو هۆکاری رووخانی موسڵمانانە)[2]. دواتر دەگاتە بەرەنجامێکی یەکجار مەترسیدار کە ئەویش بەستنەوەی (ئیمان)و موسڵمانێتی خەڵکە بە هەڵوێستیان بەرامبەر بانگەوازی برایان و دەڵێت: ( ئێمە بە هەموو راشکاویو رۆشنییەکەوە رایدەگەیەنین، هەر موسڵمانێ باوەڕی بەم بەرنامەو رێبازە نەبێتو هەوڵی بەدیهێنانی نەدات، فڕی بەسەر

[1] مجموعة رسائل، ب. یەکەم، لا ٢٦١-٢٦٣.

[2] مجموعة رسائل، ب. دووەم، لا ١٥٠.

ئیسلامەوە نییە!! بۆیە با لە ڕێبازو فیکرێکی تر بگەڕێت بۆ ئەوەی شوێنی بکەوێتو کاری بۆ بکات)[1].

دواتر ڕوو بە لاوانی برایان دەڵێت: (ئێوە لاوازتر نین لە پێشینانی خۆتان کە خودا ئەم بەرنامەو ڕێبازەی لەسەر دەستیان بەدیهێنا، خۆتان بە لاوانی بێدەسەڵات مەبینن‌و هەمیشە چاو ببڕنە فەرموودەی خوا کە دەفەرموویێت: ﴿الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُوا لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَانًا وَقَالُوا حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ ال عمران/١٧٣﴾ ئێمە لەم پێناوەدا ئیمانێکی بەلەرزە نەکەوتوو، کردارێکی نەپچڕاو، متمانە بەخوابوونێکی لەلاوازی نەهاتوو، گیانانێکمان ئامادە کردووە، کە خۆشترین ڕۆژەکانی ژیانیان ئەو ڕۆژە بێت، بە شەهیدی لە پێناو خوادا سەردەنێنەوە[2].

لێرەدا وەکو بەشی لە هارمۆنی ئیسلام کردن بە چارەسەری هەموو دەردێك، مەسەلەی (ئیمان)و (گیانی) خۆڕاگری و ئامادەیی قوربانیدانی تێکۆشەرانی ئیسلامخواز دەکرێت بە پێوەری بنەڕەتی سەرکەوتن.

ئەوەی لە مێژوودا باوەڕدارانی سەرخستووەو ئیمپراتۆریەتێکیان دروست کرووە، هەر ئەوە بوو، ئێوەش دەتوانن بە هەمان ڕۆحیەتو ئامادەگی، ئەوەی ئەوان ئەنجامیان داوە، ئەنجامی بدەن.

کە ئەگەر هەندێ ورد ببینەوە ئەم لێکدانەوە نامۆ بوون‌و ناواقیعی بوونی زۆری تێدایە. چونکە بەربەستەکانی بەردەم گێڕانەوەی فۆرمی

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا ١٥٠-١٥١.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا ١٥١.

ئیمپراتۆریـــەتو خەلافـــەتو یەکیـــەتی جیهـــانی ئیـــسلامی بـــە فۆرمـــە مێژووییەکـەی، بەشـێکی گرنگـی پەیوەسـتە بـە گۆڕانکارییـە زانـستیو شارستانیو سیاسیو نێودەوڵەتییە نوێکـان نـەك (ئیمـان)و (ئـیرادە)ی رووتی باوەڕدارانە. ئەم تەرحە لە فەزایەکدا تەرح دەکرێتو ئامانجەکان بە جۆرێ دارێژراون، وەك ئەوەی جیهان بۆشاییەکی گەورە بێتو شتێ بە ناوی سیستمی نوێی نێودەوڵەتیو زلهێزەکانی جیهـانو پێـشکەوتنە تەکنۆلۆژیو سیاسیو یاساییەکان بوونیان نـەبێت. ئەمـەش یـەکێ لـە کێشەکانی ئایدۆلۆژیایە، مرۆڤ دووچاری جۆرێ لە وەهمو خـەیاڵ پـڵاوی دەکات، لەلایەکی ترەوە مەسەلە ئاڵۆزەکـان سـادە دەکاتـەوەو توانـای تێگەیـشتنی واقیعـی وەك ئـەوەی هەیـە، نـەك وەك ئـەوەی وێنـەی دەگیرێتو ئاواتی بۆ دەخوازێت نییە.

لەچوارچـێوەی پـەروردەو کـەشو هـەوێی زاڵ بەسـەر فـەزای ئایدۆلۆژیدا، گومان کـردن لـە بنـەماو دروشـمو ئامانجـەکان قەدەغەیـە. تەنانەت زۆرجـار گومـانکردن لـە میکـانیزمو رێکارەکـانیش رێگـەی پـێ نەدراوەو تۆمەتبارکردنی تونـدو رێکارەکانیـشی رێگـەی پـێ نـەدراوەو تۆمەتبارکردنی توندو رەنگە سزاشی بەدوادا بێت..

بۆ نموونە، مارکسیستێك بڕوای وا بێت دەکرێت لـە رێگـەی خـەباتی پەرلەمانییەوە بگەین بـە ئامانجـە سۆشیالیـستییەکانو واز لـە شـۆڕش بهێـنین، بـە هەلپەرسـتو لادەر لـە قەڵـەم دەدرێـت، ئیـسلامخوازێکی ئایدۆلۆژیستیش گەر لە ساتێکدا عەقڵی لە تەلبەندی ئایـدۆلۆژیا رزگـاری ببێتو هەندێ سەربەخۆ بیر بکاتەوەو گوێ لە ڕاو لێکدانەوەکانی تریش

بگرێت، کە پێیـان وایـە ئـەو ئامانجانـەی (برایـان) دیاریـان کـردووە بـۆ سایەی دەوڵەتی نوێو سیـستمی نێودەوڵـەتی نـاواقیعینو ئاسـان نییـە ڕێگەیان پێ بدرێت، بەتایبەتیش بەو جۆرەی خراوەتەڕوو، بەوە تاوانبار دەکرێت، کە ئیمانی لاواز بووە و دووچـاری دەروون بـەزیوی بۆتــەوە و متمانەی بە خوداو کۆمەکی ئەو کەم بۆتەوەو ورەی روخـاوەو شـەیتان فێڵـــی لێ کـــردووە و کەوتۆتـــە ژێـــر کاریگـــەری پڕوپاگەنـــدەی دڵساردکەرەوەکانو دوژمنان و پاڵێدەرەوەکان!

ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی سالآن بێتو تێپـەڕنو دەسـتگرتن بـەم دروشمانەوە تەوژمەکە دووچـاری جۆرەهـا ململانێـی وێرانکـەرو نـەزۆك بکاتو وزەیەکی زۆر بە فیڕۆ بچێت، کەچی هـەر بـە ئاسمـانی خـەیاڵی ڕێبەرانی ئەندامانو دووتوێی لاپەڕەی کتێبە ئایدۆلۆژییەکاندا بمێننەوە.

لە ڕوویـەکی تریـشەوە ڕێ بگرێـت لـەوەی نوێبوونەوەیـەکی فیکـری راستەقینە لەسەر بناغەی رەخنەگرتن لەو ئامانجو دروشمانەو دووبـارە هەڵسەنگاندنیانو دیاریکردنی ئاسـتی واقیعـی بـوونو پێویـستبوونیان، بێتەدی، کە بێ ئەو کارە خولانەوە لە بازنەی ئایدۆلۆژییـەکی داخـراودا دەبێتە بژاردەیەکی نامێژووییو نا عەقڵانی بەڕواڵەت ئیسلامی.

## ئایدۆلۆژییی ئیسلامی نویٚو قۆرخکردنی راستییەکان

١. قۆرخکردنی راستی لە خۆدا: ئایدۆلۆژیا بە حوکمی ئەوەی پێی وایە وەڵامی کۆتاییو هەمەلایەنە دەربارەی کۆی پرسەکانی ژیانو بوون بە مرۆڤ دەداتەوە، خۆی وەك بەرجەستەکەری راستیو حەقیقەت دەخاتە ڕوو. بە جۆرێك هێڵێکی جیاکەرەوەی نێوان خۆیو ئەوانی تر بەوە رەنگ ڕێژ دەکات، کە ئەو هەلگرو لەخۆگری تێگەیشتنو راڤەو چارەسەرە راستەکانەو بەرامبەرەکان لە هەڵەو گومڕاییدا دەژینو ئەوەی لێی خۆیان راستی و دروستییە، جگە لە وەهم هیچی تر نییە! مرۆڤی ئایدۆلۆژیستیش بە حوکمی هەلگرتنی ئایدۆلۆژیاو هەوڵدان بۆ پیادەکردنی، خۆی بە خاوەن تەواوترین رێبازو بیروباوەڕ دەزانێت. هەڵبەت دروستکردنی ئەم قەناعەتە بۆ موسڵمانێکی قەناعەت پێکراو بە ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ، ئاسانترە، چونکە هیچ مەودایەکی راستەقینە لە نێوان ئیسلامو ئایدۆلۆژیاکەدا، نامێنێتەوە! هەموو باوەڕدارێکیش ئیسلام بە حوکمی ئەوەی لەلایەن خوداوە هاتووە (وەك ئاین) بە تەواوترینو بێ خەوشترینە ئاینو بیروباوەڕ دەزانێت. ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ لەم رووە وەك هەر ئایدۆلۆژیایەکی نوێ سەروکاری لەگەڵ رێژەییدا نییەو ئامادەی دابەشکردنی راستییەکان نییە. خۆ ئەگەر لە سنوورێکدا دان بەوەدا بنێت کە رێبازو ئایدۆلۆژیاو سیستمە ئابوریو سیاسییە هاوچەرخەکانی وەك سۆشیالیزمو سەرمایەداری، هەلگری هەندێ راستیو جوانین، ئەوا پێی وایە کە ئەو بەشە لە جوانیو ڕووناکییەی ئەوان، لە ناو خودی ئیسلامدا دەستمان

دەکـەوێتو جێـی کراوەتـەوە، بۆیـە پێویـست بـەوە ناکـات لـەوانی وەربگرین، یاخود پێمان وابێت لـە بنەڕەتـدا داهێنـراوی ئەوانـە. بـەڵکو بەشە باشو روناکییەکەی ئەوان پێشتر لای (ئیسلام) هـەبووە و ئـەوان تێکـەڵ بـە شـتی تریـان کـردووەو دەیانـەوێت بـەناوی تـرەوە پێمـان بفرۆشنەوە[1].

ئەم دیدە بـە گـشتی میکـانیزمێکی گوتـاری ناسـنامە گـەرایی بـیری جوڵانەوە خوازخوازی ئیسلامی نوێ بووە، کە پێـی وابـوو هەرچـی لای ئەوانی تر جوانو باشەو بە کەڵکی ژیانی مـرۆڤ دێـت، لـە بنەڕەتـدا هـی ئیـسلامە و بـردراوەو ئێـستا پێمـان دەفرۆشـنەوە. بـەڵام لەڕاسـتیدا سەلماندنی ئەمە هەروا کارێکی ئاسان نییە، چونکە ئەزموونی مێـژوویی و واقیـع پێمـان دەڵـێن، جگـە لـە مەسـەلەی پەیوەندیـدار بـە خـوداو دوارۆژو جەوهـەری ئـاین، کـە لـەڕێی وەحییـەوە وەردەگیرێـن، بـوارە گۆڕاوەکانی ژیان، مەسەلەی راستیو ناڕاستی دابـەش دەبێـت، چـونکە ملکـەچ دەبێـت، بـۆ جـۆری فەرهـەنگو ئاسـتی گەشـەکردنی شارستانیوجوڵەی عەقڵو پـشکەش کردنـی ئـەزموونو خـەباتی گـەلان لەپێناو رزگاریو ئازادیو خۆشگوزەرانیو پێشکەوتن.

ناڕێـژەیی بـوونی عـەقڵی لەقاڵبـدراو بـە هـەژموونو سـنورەکانی ئایـدۆلۆژیا زەبرێکـی کوشـندە لـەو عەقڵـەو جوڵـەو کرانـەوە و تـوانێی داهێنانو گەشانەوەی دەدات، چونکە وا دەکـات عـەقڵ ببێتـە ئـامرازی

---

[1] مجموعه من الرسائل، ب. یەکەم، لا٩٢-٩٣.. ب. دووەم،لا١٩٧-١٩٨.

بەڵگەهێنانــەوە و گونجانــدنی ئــەوەی کــە هەیــە، نــەك دووبــارە هەڵسەنگاندن و بەراورد کردنو رەخنەلێگرتن، بە دەربڕینی (عبدالکریم سروش) بەو جۆرەی لە پێشەوە ئاماژەمان پێکرد، دەبێتـە عـەقڵێ کـە عەودالّی بزوتن (حرکە)ت بێت نەك (حەقیقەت). ناتوانن نـاوەرۆکی ئـەو گوتەزایەی (شافعی) قبوڵ بکات کە دەڵێت: ئەوەی من دەیلێمو بیروڕاو قسەکانم راستنو دەربـڕی حەقیقـەتن بـەڵام ئەگـەری هەڵـە بوونیـشیان هەیە، وتەو بیروڕای بەرامبەرەکەشم هەڵەیە بەڵام ئەگەری راستبوونیان تێدایەو هەیە[1]. لێرەدا دەرخستنو دەرکەوتنی راستیو ناڕاستی. بەجێ هێڵراوە، بۆ گفتوگۆو تاوتوێکردنی بەڵگەکانو مشتومڕی زانستی.

نەورەسی لەم رووەوە بـە ئـەو کەسـەی هەمیـشە خـۆی بـە ڕاسـتو بەرامبەرەکانی پێ هەڵەیە دەڵێت: (ئەو کەسە دووچاری تەنگ نەزەریو لەقاڵبـدانو شــەتەکدانی هــۆش بــووە. کــە سەرچــاوەکەی لــە خــۆ خۆشویـستنەوەیە. ئـەم جـۆرە بیرکردنـەوەش سەرچـاوەیەکی گومـانی خراپبردنە بە بەرامبەرەکان، لایەنگری حیزبو گروپگەراییە).

کاتێ (حەق)یش دابەش نابێتو لای ئایدۆلۆژیاو هێزێك کۆدەبێتەوە، بێگومان پاساوێك بۆ فرەیی نامێنێتەوە، هەر ئەمەشە وای لە ئایدۆلۆژیا هەمەلایەنــەکانی مێــژووی نــوێی مرۆڤایــەتی کــردووە، (لەوانــەش ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ) هەمیشە دژ بە فرەیـی فیکـرو سیاسـی بـن. کۆمـۆنیزمو نـازیزم جگـە لـە ئایدۆلۆژیـەکانی خۆیـان کـەس بـە راسـت

---

[1] بديع الزمان سعيد النورسي، صـقيل الأسـلام، ترجمـة و تحقيـق احـسان قاسـم الـصالحي، الطبعـة الخامسة، شركة سوزلر للنشر و التوزيع، ٢٠٠٨، ص٣٤٩.

نەزانن‌و ڕێگای ئیشکردن‌و گوزارشت لەخۆدانەوەی پێ نەدەن، مەگەر بەو شێوەیە لەو ئاستە بێ ناوەرۆك كراوەی خۆیان دەیانەوێت وەك بەشێ لە ڕازاندنەوەی دیكۆری دەرەوە. ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێش بۆ نموونە لای هەردوو دامەزرێنەرەكەی (بەننا)و (مەودودی)یش، مەسەلەی فرە حیزبی و دیموكراسی ڕەتبكرێتەوە و بە سەرچاوەی شەڕو ناكۆكی‌و خراپە دابنرێت‌و لای بەننا یەكسان بكرێت بە خۆپەرستی‌و بڕوا نەبوون بە یەكیەتی ئوممەت.

بەشی لە ململانێ و شەڕی نێوان تەوژمە ئیسلامییەكان خۆشیان هەر لەم خاڵەوە سەرچاوەی گرتووە، واتە لەوەوە، كە هەر یەكەیان خۆی بە (هەق)و هەڵگری (ڕاسترین) تێگەیشتن لە ئیسلام زانیوەو ئەوی تری بەو چاوەوە سەیر نەكردووە. واتە بە كردەوە فرەیی ئیسلامیان لە زۆر شوێن‌و كاتدا بە (تنوع) دانەناوە، بەڵكو بە (تضاد)یان بینیوە! ڕشتنی ئەم ئاوەش لەناو فیكرو بزاڤی ئیسلامی نوێ دا ڕێگەی خۆشكرد بۆ توندڕەوی و پەڕگیری، چونكە سروشتی ژیان و عەقڵ و واقع تا سەر ناتوانێت تەنها یەك بیروباوەڕو هێزو ئایدۆلۆژیا لە خۆبگرێت، لەناو خودی ئەو تەوژم‌و ئایدۆلۆژییە بێت یاخود لە دەرەوەی ئەوەوە، گروپ‌و خوێندنەوەی نوێ سەرهەڵدەدەن. كە زۆرجار پاساوی بوونیان لە شلگیری گروپی دایكەوە وەردەگرن. بۆ نموونە گروپە جیهادی‌و تەكفیریەكانی وەكو (جیهاد) و (كۆمەڵەی ئیسلامی)و (تەكفیرو هیجرەی میسری) سەر هەڵدەدەن‌و (اخوان) ڕەخنە باران دەكەن بەوەی وازی لە ڕەسەنایەتی‌و پێویستییەكانی ئیسلامی بوون هێناوەو خۆیان وەك

هەڵگری بیروباوەڕە پاكو تەواو و هەقخوازەكە یەكەو لەقەڵەم دەدەن!

دوای ئـــەوانیش (القاعـــدة) ســـەری هەڵـــداو مەســـەلەی زەوتكردنـــی راسـتییەكانو رەتكردنـەوەی ئـەوانی تـری نـەك هـەر عـەلمانی بـەڵكو ئیـسلامی و لـەوانیش (اخـوان) چـووە پێـشەوە، دوایـەمین مۆدێـل لـەم روەوە سەرهەڵدانی داعشە، كە تەكفیری (القاعدە) دەكـاتو بـە كـاڵ و كـرچو گومڕایـان دەزانـێ و هـەقو ئیـسلامو یەكتاپەرسـتی تـەنها لـە لێكدانەوە و نموونەكەی خۆیدا قەتیس دەكـات، رەتكردنـەوەی سـایەی (داعش)یش تەنها بە رەتكردنەوەی تیۆری نییە، بەڵكو داوای وازهێنـان لە فیكرەو پەشیمانیو بەیعەت لە شوێنكەوتەی گروپـە ئیـسلامییەكانی تر دەكاتو بە پێچەوانەشەوە شمشێری تینو بە خوێنیان دەخەنە سەر گەردنیانو بەوەش پیادەی بەشی لە ئەركە جیهادییەكانیان دەكەن[١].

ئەوپـــەڕی میهرەبـــانی لەگـــەڵ ئـــەوانی تـــری ئیـــسلامی، بـــە جیهادییەكانیشەوە بینـوێنن، ئەوەیـە، بـێ دەنـگ دابنیـشنو ملكەچـی دەسەڵاتی داعش بنو لە جووڵە بكەون.

---

[١] ئەبوبەكر عەلی، داعش لە نێوان توندڕەوی ئایینیو شكستی دەوڵەتدا.

# فەسڵی چوارەم:
# چەمكی بانگەواز لە مەرجەعیەتی
# رەوت و ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نویّ دا

ئێمە بۆ ئەوەی بزانین بە وردی باسی چی دەكەین‌و چ شتێ كێشەی دروست كردووە لە چ روانگەیەكەوە داوای سەربەخۆكردنی كێڵگەی (دعوة)و كاری سیاسی دەكەین. دەبێت لە سەرەتا ناوەرۆكی چەمكی (بانگەوان)و (سیاسەت) لە بزاڤ و بیری حەرەكی نویێو ئەو گۆڕانكارییانەی ئێستا بە حوكمی ئاڵوگۆڕە سیاسیو ئابوریو فیكریو نێودەوڵەتییەكان، بەسەریاندا هاتووە، بوەستین.

چـونکه بـەبێ دەستنیـشانکردنی ئـەو جیاوازییانـە لـە پرۆسـەی جیاکردنـەوەی بانگـەواز و سیاسـەت تێناگـەین، کـە لـە ئێـستادا بۆتـە واقیعو ئەوەی زوو ئەنجامی نەدا دووچاری کێشەو دەرفـەت بـەفیرۆدان دەبێت. چونکە مەبەست لـە (بانگـەواز) لـە بزاڤـی ئیـسلامی نوێـدا، تـا ڕادەیـەکی زۆر بـە مانـای هاوچـەرخەکەی ئایدۆلۆژیایـە، کەواتـە بـە بانگەشـەی جیاکردنـەوەی بانگـەواز لـەکاری سیاسـیو حیزبـی لـەڕوو مانایەکەیدا، بانگەشەیە بۆ شکاندنی کۆتو بەنـدەکانی ئایدۆلۆژیایـەکی هەمەلایەنەی بەبڕوای ئێمە ناکۆك لەگەڵ پێویستیەکانی کارێکی سیاسی نیـشتمانی جـەماوەریو پێویـستیەکانی کێبڕکێـی مـەدەنی. چـونکە ئایدۆلۆژی بوون لـە قۆنـاغێکی دوای ئایـدۆلۆژیا هەمەلایەنـەکان گـۆڕانی هەلو مەرجەکانو فەزای کـاری سیاسـی، یەکسانە بـە پەراوێزکـەوتن، یاخود لانی کەم لەبەردەمدا نەبوونی دەرفەتی بەزۆرینە بوونی سیاسی، کە ئامانجی هەرهێزو جوڵانەوەیەکی سیاسییە.

چەمکی بانگەواز لە ئەدەبیاتی بزاڤی ئیسلامی نوێدا، گەرچی تێکەڵ بە بانگەشەو پابەندیو تەنانەت هەندی رواڵەتی سۆفیگەریش بووبێـت، لە جەوهەردا بانگەواز نییە بە مانا ئاینییە رووتەکەی، بـەڵکو رەهەنـدی جۆراوجـۆری هەیـەو ئایدۆلۆژیایـەکی هەمەلایەنەیـە. هـەروەك (بـەننا) دەڵێت: بانگەوازی برایانی موسڵمان بانگەوازی رێباز (مبدأ)ە. هـەروەك چۆن لە ئەمڕۆدا جۆرەها بانگەوازو رێبازو فیکرو بیروڕا هەن کە هەست

و بیری خەڵکیان گیرۆدەو دابەش کردووە[1]. دوای ئەوەش باس لەوە دەکات کە بانگەشەکارو شێوازەکانی بانگەوازو پڕوپاگەندە لە ئێستای دنیادا گۆڕانی زۆریان بەسەردا هاتووە وەکو رابردوو نەماون[2].

دواتر دەڵێت: بانگەوازەکەی ئێمە (ئیسلامی)یە، کە ئەم خەسڵەتەش لە بانگەوازەکانی تر جیای دەکاتەوە، بەڵام ئیسلام بەو جۆرەی (برایان) تێیگەیشتوونو بانگەشەی بۆ دەکەنو دەیخەنە ڕوو، ئیسلام بە مانا هەمەلایەنەکەی کە کۆی کاروبارەکانی ژیان رێکدەخات، لە هەموو شتێکدا ڕا دەداتو پێڕەو و رژێمێکی مەحکەمو وردی بۆ دادەڕێژێت[3].

بانگەوازەکەی برایان گشتیو لەخۆگری هەموو شتەکانە، هیچ بەشێکی چاك لە هیچ بانگەوازێکی تردا بونی نییە ئەم ئاماژەی بۆ نەکردبێت، لەکاتێکدا بانگەوازەکانی تری سەردەم دڵەکانی لەیەك کردوە و بیرەکانی شڵەژاندووە[4].

بانگەوازلە چوارچێوەی بزاڤی ئیسلامی نوێدا، باسی ئامۆژگاری چاك (الموعظة الحسنة) و (حیکمەت) و مشتومڕ (مجادلة)و بانگەشە بۆ لای (اخبات)ی دڵو ناسك کردنی رۆح نییە، هەموو ئەوانە بە شتێکی بچوکی بانگەوازن. بانگەواز لەو چوارچێوەدا، هەڵگری خەمو پرۆژەیەکە

---

[1] مجموعة رسائل،ب. یەکەم، ص٣٩.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا.

[3] هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا٣٢.

[4] هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا٣٣.

بانگەشەی چارەسەرکردنی کێشەکانی واقیعی سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئەخلاقیو ئابوری دەکات[1]. لەلایەکی ترەوە چارەسەری ئیسلامیان بۆ پێشکەش دەکات، بەڵام چارەسەری سیاسیو ئابوریو جیهادیو کرداری نەك ئامۆژگاری.

ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ کە لە بەرگی بانگەوازدا خراوەتە ڕوو، تەنها بانگەشە نییە بۆ وازهێنان لە تاوانو پەشیمانی لە کاری خراپو پاککردنەوەی دەروونو چاکەکاریو ئەخلاقی جوانو کارکردن بۆ بەهەشت، بەڵکو دەتوانم بڵێم ڕاگەیاندنەوەو پێناسەکردنێکی نوێی ئیسلامە بۆ موسڵمانانو جیهانیش. واتە ئەگەر دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر (ﷺ)و ئەو بۆشاییەی لەو کۆچە دروست بوو، دامەزراندنی بناغەی سیستمی خەلافەت، بە قۆناغێکی دووبارە لەچوارچێوەدانو داڕشتنەوەی دامو دەزگاییانەی ئیسلام و پەیوەندی نێوان (ئاین) و سیاسەت) و (دەسەڵات) و مانادان بە ناوەڕۆکی چەمکی کۆمەڵ (جماعة)و نەتەوەی موسڵمانان بێت، ئەوا ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێش (بانگەواز) دوای ئەو بۆشاییەی لە هەڵوەشانەوەی (خەلافەت) یاخود سەڵتەنەتی عوسمانی لەدوای جەنگی جیهانی دووەم کەوتەوە، هەمان ئەو ڕۆڵەی بینی. لەگەڵ جیاوازی ئەوەی کە هاوەڵان دەسەڵاتیان دروست کردوو ئەوەش نیشانەی ئومێدو هێزیان بوو، بەڵام پێشەنگانی بانگەوازو ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ لە دۆخێکی پڕ لە تاڵاو چەشتنی

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥٤.

شکستو هەست بە کاڵبوونەوەی ناسنامەو پیلانی دوژمنو لاوازیو بێ کەسیو بێ قەوارەییدا، کەوتنە دارشتنی ناوەرۆکی بانگەوازو ڕێبازەکەیان. کە ئەو دۆخە بە جوانیو ڕوونی شوێن پەنجەی بەسەر تێگەیشتنیان بۆ ئیسلامو دەسەڵات دانا. ئەگەر هاوەڵان دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر (ﷺ) بناغەی چۆنیەتی دامەزراندنی سیستمی سیاسیو دەسەڵاتیان دارشت، بۆ ئەوەی (ئوممەت) ڕەوتی مێژوویی خۆی تەیی کاتو قەڵەمڕەوی خۆیو پەیامەکەی بەرفراوان بکاتو سەرەنجام دەسەڵاتێکی فراوانو بەرین بەرپا بکات، ئەوا داڕێژەرانی بانگەوازی نوێ ئایدۆلۆژیایەکیان دارشت لە سەردەمی بۆشایی دەسەڵاتی ئیسلامی دا (لە فۆرمە مێژووییەکەی و بەو جۆرەی تێی گەیشتبوون) توانای دووبارە سازدانەوەی پێشەنگانی تێکۆشەرو رۆڵەکانی هەبێت، بەمەبەستی دووبارە گێڕانەوەی دەسەڵاتی لەدەست چوو!

دۆخێکی لەم جۆرەش توانای خۆڕاگریو پشوودرێژیو بەرگەگرتنی فشاری فەرهەنگی و سیاسیو سەربازی و ئابووری بەرامبەر دەخوازێت، هەر بۆیە دەبێت بانگەوازەکەش هەمەلایەنەو جوڵێنەرو تاودەرو شۆڕشگێڕ بێت. پێش هەموو شتێ ئەم بانگەوازە دەبوو کێشەی دووچاری بەلابوون بە خۆرئاوا لەلایەن موسڵمانانەوە چارەسەر بکات. کە مەبەست لێی ئەو پرسیارو کێشەو ئیشکالیاتانە بوون ژیاری نوێی خۆرئاوا لە ژیارییە کۆنەکانو لەوانەش ژیاری ئیسلامی دەکردو بۆی دروست دەکردن. لەوانەش: ناسیۆنالیزمو، سکیۆلاریزم (عەلمانیەت) و

دیموکراسی‌و دەوڵەتی نوێ‌و چەمکی هاوڵاتی‌و ڕێکخستن‌و بیروکراتیەتی هاوچەرخ‌و ئازادی تاکەکەسی‌و گشتی‌و فرەیی..

هەر لەم چوارچێوەشدا بانگەوازەکە کەوتە ململانێیەکی توندەوە لەگەڵ زۆربەی ئەو چەمکانە. لەبری لەخۆگرتن‌و گونجاندنیان لە مەنزومەو فەرهەنگی ئیسلامی دا، بەو جۆرەی ژیاری ئیسلامی لە مێژوودا بەرامبەر فەلسەفەی یۆنان‌و شارستانیەتەکانی تر کردی، یاخود چاکسازیخوازە ئیسلامییە مەزنەکانی سەدەی نۆزدە داوایان دەکرد، کەوتە ڕەتکردنەوەیان.

لە پێشمەرجێکیشەوە دەستیان پێکرد کە دەیووت: هەرچی ڕێبازو فیکرو سیستەم‌و فەلسەفەیەك لە جیهاندا لە دەرەوەی ئیسلام بوونیان هەیەن توانای ئەوەیان نییە مرۆڤ بەختەوەر بکەن[1].

خودی بەننا جەخت لەوە دەکاتەوە کە دنیا لە ڕەنج‌و ئازاردا دەژین‌و کەس چارەسەری پێ نیەو چارەسەر تەنها و تەنها لای ئیسلامەو مرۆڤایەتیش سەرەنجام بە هەر شێوازێك بێت، بە خۆشی بێت، یان بە ناخۆشی، ڕووەو ئەو چارەسەرە هەنگاو هەڵدەگرێت[2].

لەو سۆنگەشەوە کە زەمەنی مێژوویی سەرهەڵدان‌و داڕشتنی بناغەکانی بانگەوازی ئیسلامی دەگەڕێتەوە بۆ سی‌و چلەکانی سەدەی رابردوو، ئەو کاتەش ئایدۆلۆژیا هەمەلایەنەکانی وەکو کۆمۆنیزم، فاشیزم، نازیزم، جیهانیان بە خۆیانەوە سەرقاڵ کردبوو. هەروەها

---

[1] الدکتور یوسف القرضاوي، التربیة الأسلامیة و مدرسة حسن البنا، چاپی یەکەم، نهضت ــ قم، لا٨١.
[2] مجموعة رسائل، ب. یەکەم، لا ١٥٢ وە، بەشی دووەم، لا١٤٦.

لەڕوانگەی ئەو کودەتا هەمەلایەنەی ژیاری نوێی خۆرئاوا لەسەر ئاستی بیرکردنــەوەو ژیــانو سیاســەتو ئــابوریو کۆمەڵایــەتیو دەوڵــەتو حوکمڕانیو شـێوازی ژیانکردنـدا بەسـەر جیهانیـدا هێنـابوو، بانگـەوازە ئیــسلامییە نوێکــەش، گــشتگیر (شمــولی) بــوو، لەبــەر ئــەوەی ئایدۆلۆژیاکەش (ئیسلامی) بـوو، واتـە لـەخۆ بینـاکردنو پێناسـەکردنو رەمزییەوە پشتی بـە ئیـسلام بەسـتبوو، بـە سروشـتی حـاڵو ێنایـەکی هەمەلایەنـەی لـە ئیـسلام خـستە ڕوو، تـا ڕادەیـەکی زۆر نـامۆ بـوو بـە مێــژووی موســڵمانانو ژیــاری ئیــسلامی. پێــشەنگانو داڕێــژەرانی بانگەوازەکەش ئەوەیان نەدەشاردەوە، کە ئەوە تێگەیشتنی ئەوانە بـۆ ئیسلام، (بەننا) دەیووت: تێگەیشتنی هەمەلایەنە بۆ ئیسلام تایبەتە بە برایانو ئەوە ئیسلامی برایانی موسڵمانە. سـەرەتا بـەننا ئامـاژە بـەوە دەکات کە موسڵمانان لە درێژایی مێژووی خۆیاندا، جیـاوازی گـەورەیان لەســەر واتــای ئیـسلامو پێناســەکردنی هــەبووەو جۆرەهـا سـیفەتیان پێبەخشیوەو چوارچێوەو سنووریان بۆ دیاریکردووە.

دواتر دێتە سەر باسی تێگەیشتنی (اخوان) بۆ ئیسلامو لـەم رووەوە تایبەتمەندی ئەم تێگەیشتنە بەم خاڵانەی خوارەوە دیاری دەکات:

١. بــاوەڕبوون بــەوەی کــە ئــەحکامو رێنوێنییــەکانی ئیــسلام ســەراپاگیرنو کاروبارەکـان لـە دنیـاو دواڕۆژدا رێکدەخـەن. ئیـسلام: عەقیـدەو عیبادەتـە، دیـنو دەوڵەتـە، کتێـبو شمـشێرە، روحانیـەتو کردارە، نیشتمانو رەگەزنامەیە.

٢.   باوەڕبوون بەوەی بناغەی ئەحکامو ڕێنوێنییەکانی ئیسلام قورئانو سوننەتە[١]. هەروەك چۆن لە سەرەتای ئیسلامیشدا وە لە ئێستادا سەبارەت بەو نامۆسڵمانانە واتەی ئیسلامیان بۆ دەخرێتە ڕوو، داوا دەکرێت باوەڕی پێ بێنن، (بەننا)ش داوا دەکات کە (باوەڕ) بە بانگەوازەکەی خۆیو برایان بهێنرێت[٢].

لەڕوویەکی ترەوە ئەم (ئیسلامە) هەمەلایەنە لە بەرگی بانگەوازو ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێدا پێویستی بە ڕێکخراوێکی گشتگیرو (شمولی)یش هەیە، بۆ ئەوەی لەخۆی بگرێتو مزگێنی پێ بداتو تواناکانی لەپێناویدا ڕێکبخاتو هەوڵی بەدیهێنانی ناوەڕۆكو ئامانجەکانی بدات! ئەو ڕێکخراوەی نوێنەرایەتی ئەویش دەکات دەبێ هیچ شتێ لە هیچ بوارێکدا بۆ کەس بەجێ نەهێڵێ، بە گوتەی (بەننا)و دواتر کەسانی وەك (قەرزاوی) لەخۆگری سەرجەم واتاکانی چاکسازی (اصلاح) بێت. بۆئەوەی هەموو کەس خۆی تێدا ببینێتەوە و وانەزانێت پێویستی بە بانگەوازو ئاڵاو ڕێکخراوو پێشەوای تر هەیە. هەر لەم چوارچێوەدا (بەننا) برایان بەوە پێناسە دەکات کە چەندین ڕەگەزی جۆراوجۆری لەخۆ گرتووەو هیچ کام لەو ڕەگەزانەش نییە، بەڵکو لە کۆی هەموویان بانگەوازو فیکرەیەکی نوێی داڕشتووە. ڕەگەزەکانیش بەو جۆرەی (بەننا) دەستنیشانی کردوون ئەمانەی خوارەوەن:

---

[١] الدكتور يوسف القرضاوي، شمول الأسلام، الطبعة الثالثة، مطبعة المدني، القاهرة، ٢٠٠٣، ص١١٥-١٢٢.

[٢] مجموعة رسائل، ب. یەکەم، لا ١٩-٢٢.

(١) بانگەوازێکی سەلەفی.

(٢) ڕێبازێکی سوننەتگەرا (طريقة سنيّة).

(٣) ڕاستیو حەقیقەتێکی سۆفیگەری.

(٤) دەستەیەکی سیاسی.

(٥) کۆمەڵەیەکی وەرزشی.

(٦) ڕایەڵەیەکی زانستیو ڕۆشنبیری.

(٧) کۆمپانیایەکی ئابوری.

(٨) ڕێبازێکی کۆمەڵایەتی[1].

کەواتە (برایان) لە یەك کاتدا هەمو ئەو شتانەیە بەیەکەوە. هەر بۆیە پێناسەکردنی ئاسان نییە جگە لەوەی بوترێت: بانگەوازو ڕێبازێکی هەمەلایەنە یاخود سەراپاگیر (شمولی) ئیسلامییە.

لە سۆنگەی سروشتی هەمەلایەنەی بانگەوازو ئایدۆلۆژیاو ڕێکخراوی برایانیشەوە، ئەو کەسەی دەبێتە هەڵگری بانگەوازەکە و شوێنکەوتەی ڕێبازەکەو ئەندامی ڕێکخراوکە دەبێت، هەموو ئەمانەی هەمەلایەنە بێتوکۆی ژیانو بوونی بکاتە وەقفی ئەو و هیچ بۆشاییەك لە بیرکردنەوە و واقیعی ژیانیدا نەمێنێ ڕەنگدانەوەی ئەوو لە خزمەتیدا نەبێت؟!.

هەروەها (بەننا) لە پەیامی (بانگەوازەکەمان)دا داوای فەنابوونو توانەوەی ئەندام لەناو کۆمەڵەکەو بانگەوازدا دەکات و دەڵێت: (ئەم

---

[1] مجموعة رسائل/ ب.د ووەم، ص٢٢–٢٥. هەروەها.دکتور يوسف القرضاوي، شمول الأسلام، ص١٢٠–١٢١

بانگــەوازە ئــەو كەســەی بەكــەڵك نایــە، كــە بــە گـشتیو هەمەلایەنــە وەرینەگرتبێتو ماڵو كـاتو تەندروسـتی خـۆی نەخاتـە خزمەتییـەوە، چونكە بانگەوازێكە هاوبەشی قبوڵ ناكات) لـە پـەیامی ئامۆژگارییـەكان (التعالیم)یشدا كە بۆ پلەی (موجاهید) لـەناو برایانـدا نوسـراوەو ئـەركی ئەوانو خەسڵەتە پێویستەكانیان دیاری دەكات، پێش هەموو شتێ داوا دەكـات كـە هــەڵگری تێگەیـشتنی هەمەلایەنــەی (برایــان) بــن. داوای تێكۆشانو قوربانیدان بە هەموو شتێكی خۆیانو گوێڕایەڵی سەربازانەی تەواو و خۆڕاگری لێ بڕانەیان لێ دەكات[1].

دوای هەمەلایەنــەبوونی ئایــدۆلۆژیاو هــەڵگرو ڕێكخراوەكــەی، ئــەو دەوڵەتــەی لەســەر بناغــەی ئــەوانیش دروســت دەبێــت. دیــسانەوە سەراپاگیرو (شمولی)یە. بەجۆرێك هیچ پانتاییو كونو قـوژبنێكی ژیـان نامێنێ دەستی تێ نـەخاتو ڕەنگـی نـەكات! بـە حـوكمی ئـەوەی ئـەو (ئیسلام) پیادە دەكات، ئیسلامیش هەمەلایەنەیەو هیچ بۆشـاییەكی لـە ژیانی مرۆڤایەتی بێ قسە لەسەر كردنو ڕێكخستن بـەجێ نەهێـشتووە. ناشكرێت ئیسلام بەش بەش بێتو هەنـدێكی پیـادە بكرێـتو هەنـدێكی تری پیادە نەكرێت، چونكە بەوە لە ئیسلام دەردەچین؟! لەڕاستیـشدا بــە هەنــدێ ســەرنجدان لــەوە تێدەگــەین كــە سەرچــاوەیەكی گرنگــی هەمەلایەنەبوونی ئایدۆلۆژیای ئیـسلامی نـوێ، هەمەلایەنـەبوونی خـودی دەوڵەتی نوێیە، هەروەك دەزانین گەر بە دەسـتەبەریو میكانیزمـەكانی

[1] مجموعة رسائل/ ب.یەكەم، ص٢٥١-٢٨١.

دیموکراسی کۆتو بەند نەکرێتو بە عەقڵانی نەکرێت، مرۆڤ و کۆمەڵگە مەسح دەکاتو دەست دەخاتە وردەکاریەکانی ژیانی مرۆڤەوە و هیچ پانتاییەکی تایبەت بۆ هەناسەدانی ئازاد بۆ تاكو کۆمەڵ ناهێڵێتەوە. ژیانی سایەی نازیزمو فاشیزمو کۆمۆنیزمو بەعسیزمو کەمالیزمو هاو وێنەکانیشیان بەڕووی ئەو راستییە دەردەخەن. پێشەنگانی ئیسلامی نوێ لە رۆڵی ترسناکی دەوڵەتی نوێو هەمەلایەنەبوونی رۆڵەکەی تێگەیشتوون، بەڵام پرۆژەکەیان لەسەر بناغەی ئاراستە کردنی رەخنەی ئەخلاقی لەم دەوڵەتە بنیات نەناوە، بەڵکو کاریان کرد بۆ ئەوەی ئەم ئامرازو وەسیلە هەمەلایەنو کاریگەرە لەدەست سکیولارو بەرامبەرەکان بسێننەوەو بە سروشتە هەمەلایەنو هەژموونخوازەکەیەوە، بیخەنە خزمەت پرۆژەو بانگەوازەکەی خۆیانەوە!

(مەودوودی) بەڕۆشنی ئەم مۆدێلە لە دەوڵەت، کە بە دەوڵەتی ئیسلامی ناسرابوو، وەسف دەکاتو دەنووسێت: (ناکرێ سنورێ بۆ کارەکانی دەوڵەتی ئیسلامی دابنرێن، چونکە دەوڵەتێکی هەمەلایەنەیەو سەرۆکاری لەسەر کۆی ژیانی مرۆڤایەتی و کۆمەڵگە هەیە، هەموو لقو بەشەکانی ژیان بە مۆرکی تیۆرە ئەخلاقییەکەی خۆی رەنگ دەکات.

بۆ کەس نییە رووبەڕووی بێتەوەو کارێ لە کاروبارەکانی بخاتە دەرەوەی هەژموونو دەسەڵاتی ئەوەوە و بڵێ: ئەمە کارێکی تاکە کەسییە و بۆ دەوڵەت نییە دەستی تێ بخات! لەبەر ئەوە دەوڵەتی ئیسلامی لەم رووەوە لە حکومەتە فاشیو کۆمۆنیستەکان دەچێت، بەڵام

(استبداد)ی ئەوانی نییە[١]! لەم دەوڵەتەدا دەسەڵات تەنها بەدەست ئەو کەسانەوە دەبێت کە دڵسۆزی ئەو فیکرەن لە سەری دامەزراوەو بەدەر لەوان کەسی تر بۆی نییە بەشدار بێت. گومانیشی تێدا نییە کە دەوڵەتی ئیسلامی دەوڵەتێکی هەژموون خوازو رەهاو تۆتالیتار و هەژموون بە سەر کۆی ژیاندا دەکات بەڵام لەسەر بناغەی یاسای خودایی[٢]. لەم دەوڵەتەدا لای (مەودودی) و (بەننا)ش رێگە بە فرەحیزبی نادرێت، کاتی خۆی (بەننا) داوای هەڵوەشاندنەوەی حیزبەکانی میسرو کۆکردنەوەیان لە دەستەیەکی یەکگرتوودا کرد، کە رەمزییەکیەتی ئوممەتو کۆمەڵگە بێت[٣] ؟!.

دیموکراسیش لە چوارچێوەی ئەم ئایدۆلۆژیاو دەوڵەتەدا، جێگای نابێتەوە، لەگەڵ ئیسلامی هەمەلایەنە لە ناکۆکیدایەو زادەی خۆرئاوای دوژمنە[٤]!! لای (سید قطب)یش دیموکراسی وەك شێوازێکی بەڕێوەبردنی دەسەڵات دەبێت بە فۆرمێکی نەفرەتلێکراوی نەفامی نوێ[٥].

---

[١] أبو الأعلى المودودي/ نظرية الأسلام و هديه في السياسة و القانون و الدستور، دار الغد،١٩٦٩، ص٤٦... و سيد قطب / المعالم في الطريق، دار الكتاب الأسلامي، قم، ١٩٨٣، ص٣٦-٧.

[٢] سەرچاوەی پێشوو، لا٤٧، ٥٣، ٥٤.

[٣] سەرچاوەی پێشوو، لا٦٠ هەروەها مجموعة الرسائل.ب دووەم، لا٧٦.

[٤] مەودوودی، سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٢ برایانیش لە دوای نەوەدەکانەوە وەرەقەیەکیان لە بارەی دیموکراسییەوە بلاوکردەوەو هەندێ تێداچوونەوەیان بۆ ڕاکانی پێشوویان کردبوو، قبوڵکردنی دیموکراسی لە خۆیان نیشاندا. وە بڕوانە دکتور یوسف القرضاوي، الحلول المستوردة و كيف جنت على أمتنا، الطبعة السادسة، مكتبة وهبة، القاهرة، ٢٠٠٦، ص ٣٥٢-٣٥٣.

[٥] سيد قطب/ معالم في الطريق، ص٢٢.

کەچی (مەودودی) دوێی ئەوەی دەوڵـەتی ئیـسلامی بـە هـەموو ئـەو وەسفانەی سەرەوە وەسف دەکات، واتە لە هەژموونخوازو تۆتالیتاریو هاوشێوەبوونی لە ڕووی دەست وەردان لـە کـۆی ژیـانی تـاکو کۆمـەڵ، لەگەڵ حکومەتە فاشیو کۆمۆنیستەکان. هێشتا پێی وایە ئەم دەوڵەتـە تەنها لەو سۆنگەوە کە شەریعەت پیـادە دەکـاتو لەسـەر بناغـەی ئـەو دروسـت بـووە، بـیروڕا کۆمەڵایـەتیو پرۆگرامـە ئـاوەدانو شارسـتانیەتییەکانی ئیـسلام بـە زۆر ناسـەپێنێ، هـەروەها ئـازادی تاکەکەسـی زەوت ناکـاتو ڕێگـا لـە زوڵـمو زۆری دەسـەڵاتو دەوڵـەت دەگرێت. کە لەڕاستیدا ئەم قسانە بەڵگەن لەسەر نەناسـینی ماهیـەت و سروشتی دەوڵەتی نوێو ئامرازەکانی پیادەکردنی دەسەڵات تیایدا. کـە لـە سـایەیدا لـە دەرەوەی میکانیزمـەکانی سـنوردارکردنی دەسـەڵاتو دابەشـکردنو ڕێکخـستنی لـە چوارچـێوەی پـەیمانێکی کۆمەڵایـەتی و ڕێکـەوتنێکی سیاسـیو مـەدەنی دا، هـەرگیزاو هـەرگیز پـەروەردەی ئایدۆلۆژیی کاربەدەستو دەسەڵاتداران و پیادەکردنی شـەریعەت نابنـە ڕێگر لە سەرهەڵدانی جۆرەها فۆرمی ستەمو ناعەدالەتی، چونکە ئەگـەر (ئیمان)و شەریعەت لە سایەی دەوڵەتو دەسـەڵاتێکی سـادەو سـاکاری وەك خەلافـەتی راشـیدینو سـەرەتای ئیـسلامو هـاوەڵێکی دیـاری وەك (عوسمـانی کـوڕی عـەففان) نەبووبێتـە هـۆی دەسـتەبەرکردنی دادپـەروەری ئیـسلامیو هەنـدێ شـێوازی سـتەمو جیاکـاری ئاشـوبو

ململانێی لێ کەوتبێتەوە، هەروەك خۆی لە کتێبی (خلافت و ملوکیت)[1] ئاماژەی پێ کردووە و لەسەری وەستاوە، داخۆ دەبێ چلۆنا و بە چ شێوەیەك لە چوارچێوەی دەوڵەتی نوێو دەسەڵاتە زۆر و زەوەندەکانی و ئامرازەکانی دەستی بۆ کۆنترۆڵکردنی کۆمەڵگەو لەقاڵبدانی ژیانو سەرکوتی کۆملگە، ئامانجێکی لەو جۆرە، بە هەمان مکیکانیزمە کۆنەکان بێتە دی؟ لەڕاستیدا هەموو ئەوەی ئەدەبیاتی ئیسلامی لە بەرگی ئایدۆلۆژیاو ئیسلامی حەرەکی دا دەیخاتە ڕوو، جگە لە نەناسینی سروشتی سەردەمو دەوڵەتی نوێو خۆشباوەڕی زیاد لە پێویستو ژیان لە فەزای ئیمپراتۆریەتە بەسەرچووەکاندا هیچی تر نییە.

ئەمەش ئەوە دەردەخات کە بانگەوازەکە تەنها بۆ خودا نییە، واتە تەنها ناگەیەنرێتو قسە لەسەر باشکردنی تاكو کۆمەڵ ناکرێتو وازیان لێ بهێنرێن. بەڵکو لە پرۆسەیەکی تەئویلکردنی سیاسی نوێ دا (سبیل ربك) واتە کاتێ خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ادْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ﴾ یەکسان دەبێت بە بانگەشە بۆ لای ڕێکخراوی (برایان) یان (کۆمەڵەی ئیسلامی) لە پاکستانو هاو وێنەکانیان! هەر بۆیە هەر کەسێ لە نزیکەوە شارەزایی لە جۆری ئیشکردنی برایان هەبێت، مەسەلەی بانگەوازی گشتی هۆکار و (وسیلە)یەکە بۆ ئامانجێکی تر کە پێی دەوترێت (تجمیع) واتە کۆکردنەوەی خەڵك بە دەوری ڕێکخراوە کەو

---

[1] ابو الأعلى المودودي، خلافت و ملوكيت، ل١٠٦-١٠٩.

دواتـر قۆنـاغ بـه قۆنـاغ لێ هەڵبـژاردن‌و ڕێکخـستنیان لـه چوارچـێوەی ڕێکخـــستنەکانیاندا. خـــودی (بـــەننا)ی دامەزرێنـــەریش قۆناغـــەکانی بانگەوازی برایان دەکات به سێ قۆناغەوە:

(١) ناساندن و مژده پێدان ( تعريف)

(٢) پێگەیاندن‌و پێکهێنان.

(٣) به دەسەڵات گەیشتن (تمكين)[1]

که لێـرەدا بـه مانـا ئیـسلامییه رووتـه باوەکـەی بانگـەواز و ئـەوەی زۆرینەی موسڵمانان‌و زانایانی تێی گەیشتوون، تەنها (تعريف)و قۆناغی یەکەم دەچێته چوارچـێوەی بانگـەوازەوە. گـەر زۆریـش ورد ببینـەوە، کاتێ بانگەواز دەگات به دەسەڵات ئیتر پاساوی مانـەوەی وەك پێـشوو نامێنێـت، لانـی کـەم بەشـێ لـه پاسـاوەکانی خـۆی لەدەسـت دەدات. چونکه له بنەڕەتـدا وەسـیلەیە، یـان دەکرێـت پرسـیارەکه بـەم جـۆره بکەین: ئایا لەدوای گەیشتنه دەسەڵاتی بانگەواز که له بنەڕەتدا، بـۆوه سەری هەڵداوه حکومـەت‌و دەسـەڵاتی ئیـسلامی بگێڕێتـەوەو دەوڵـەتی ئیـسلامی دابمـــەزرێنێ‌و شـــێوه ژیـــانی ئیـــسلامی بەســـەر کۆمەڵگـــەدا بسەپێنێت (جگه لەو ئامانجه نێونەتەواییانـەی مـاون) مانـای بانگـەواز چی لێ دێت ؟بانگەواز له چوارچـێوەی شـێوازی کـاری ئیـسلامیدا ن بـه مانا (ئاینی)یه رووتەکه، وەسیلەیه بۆ سەرخستنی پرۆژەی نوێبونەوەی ئوممەت‌و بەرپاکردنەوەی دەسەڵاتەکەی.

[1] مجموعة رسائل / ب دووەم، لا١١٦.

که لەم ئامانجانەی خوارەوەدا خۆی دەبینێتەوە:

١. پێکهێنانی تاکی موسڵمان.

٢. پێکهێنانی خێزانی موسڵمان.

٣. پێکهێنانی گەلی موسڵمان.

٤. پێکهێنانی حکومەتی موسڵمان.

٥. رزگارکردنی وڵاتانی ئیسلامیو گێڕانەوەی خەلافەتی ئیسلامی و قەوارە نێودەوڵەتییە زایە بووەکە.

٦. گێڕانەوەی هەموو ئەو وڵاتو ناوچانەی سەردەمێ بەشی لە ئیمپراتۆریەتی ئیسلامیان پێکهێناوە لە وێنەی ئەندەلوس و سەقەلیە.

٧. مامۆستایەتی و رێبەرای کردنی جیهانو مرۆڤایەتی.

ستراتیژی سەرەکی بانگەوازی (برایان)یش پەروەردەیە، پەروەردەیەکی دوور مەوداو هەمەلایەنە، بە جۆرێك هەوڵبدرێت گۆڕانکاریەکی قوڵ و سەراپاگیر بەسەر ئەنداماندا بهێنرێت[١].

زیادەڕەویش لە پەروەردەدا، لەپاڵ وێناکردنی ئایدۆلۆژیاو ئیسلامی بە ئایدۆلۆژیا کراوو، سیستمەکەی، بە سیفەتی نمونەیەکی وەك سیستمو رێبازێکی تاکانەو بێ وێنە[٢]، هەروەها سەرهەڵدانی ئەوەی ناوی

---

[١] د. سعيد بن سعيد العلوي، أدلجة الأسلام بين أهله و خصومه، الطبعة الأولى، رؤية للنشر و التوزيع،٢٠٠٨،ص٣٠

[٢] بێ وێنەبوونی چارەسەری ئیسلامیو نموونە حوکمڕانی یەکەی، خاڵی هاوبەشی نێوان زۆربەی هەرە زۆری نوسەرو رێبەرە ئیسلامی یەکانی سەر بە قوتابخانەی هەمەلایەنەی ئیسلامین، هەر بۆ نموونە لەم رووەوە خوێنەر دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ سید قطب/ معالم في الطريق، و عبدالقادر عودة /الأسلام و اوضاعنا السياسية.دكتور يوسف القرضاوي، حتمية الحل الأسلامي... هتد.

دەنێم بیروباوەڕی بێ نیازی لە هەموو جیهان، وەك رەنگدانەوەیەك بۆ بڕوابوون بە هەمەلایەنە بوونو بێ کەمو کوڕی بانگەوازو ئایدۆلۆژیاو ئیسلامی پێناسەکراو لەو نێوەندەدا، وەشکستخواردنی سەرجەم چارەسەرەکان جگە لە چارەسەری ئیسلامیو راگەیاندنی ئەوەی کە نەتەوەی ئیسلامی پێویستی بە هیچ چارەسەرێکی هاووێنەی (نەتەوایەتی، سۆشیالیستی، لیبرالیو دیموکراسی نییە و هێنراو لەدەرەوەی خۆی و بە تایبەتیش لە خۆرئاواوە نییە)[1].

کارێکیان کرد ئەو تۆوەی دەربارەی گومانکردن لە ناسنامەی ئیسلامی کۆمەڵگە لای (بەننا) چێنرابوو[2]، لای (سید قطب) بە حوکمی پێکهاتەی خۆیو دۆخە بابەتییەکەو سروشتی سەرکوتکارانەو ستەمکارانە کە فۆرمێکی دواکەوتووی عەلمانیەت سەپاندبوی، کە لە سایەیدا (سید) و هەزاران هاوبیری دووچاری سزاو شێوازی مامەڵەی وەحشیانە بوونەوە، لە زیندانەکانی ناسردا، قوڵبۆوە بۆ دابەشکردنێکی قووڵی جیهان بۆ (ئیمان)و (کفر) و (ئیسلام) و (نەفامی) و حوکمدان بەسەر کۆمەڵگە موسڵمانەکاندا بەوەی دەستیان لە ئیسلام بەرداوەو لە

[1] دکتور یوسف القرضاوي، الحلول المستوردة، ص٣٣٩-٣٦٢.

[2] بۆ نموونە کاتێ دەڵێت هەر کەسێ باوەڕی بەوە نەبێت ئێمە باوەڕمان پێیەتی و ئەو لێکدانەوەی بۆ ئیسلام قبوڵ نەبێت کە برایان دەیخەنە ڕوو، بەشی بە ئیسلامەوە نەماوە. بەڵکو لای من جۆری دەستنیشانکردنی ئامانجەکانو باسکردن لە دروستکردنەوەی تاکی موسڵمانو خێزانی موسڵمان و گەلی موسڵمان لە ناخیدا گومانێکی قوڵی لە ناسنامەی موسڵمانێتی تاکو خێزانو کۆمەڵگە لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە، چونکە باسکردن لەوەی کە دروستی دەکەین، واتە بوونی نییە بە گشتیش بەشێ لە رەگو ریشەی نوسینەکانی (سید قطب) لە پەیامەکانی بەننادا دەدۆزینەوە.

دۆخی نەفامیدا دەژین. وە سەرزەوی هیچ کونجو پارچە زەوییەکی تیا نەماوە بە کۆمەڵگە موسڵماننشینەکانیشەوە کە نەفامی باڵی بەسەردا نەکێشابێت، هەر بۆیە دەبێ تەوەری بانگەواز ببێتەوە بەدووبارە پێناساندنو پەروەردە کردنەوەی خەڵك لەسەر عەقیدەی (لا اله الا الله) و لە بناغەوە ئیسلامیان پێ بناسرێتەوە!! خۆشیان با رواڵەت بە موسڵمان بزانن، چونکە ئیسلام پێش هەر شتێك داننانە بە (عقیدە)دا.

(لا اله الا الله ) بە ناوەرۆکی ئاماژە راستەقینەکەیەوە، کە گێڕانەوەی هەموو شتێکی ژیانیانە بۆ حاکمیەتی خوداو دەرکردنی هەموو ئەوانەیە کە خۆیان وا دەردەخەن ئەو مافەیان هەیەو دەستدرێژیان کردۆتە سەر دەسەڵاتی خوا[1]. گەر مەسەلەکەش بەو جۆرە بێت، بانگەوازی ئیسلامی تەنها یەك مانای دەبێت، ئەویش ئاشکراکردنی دابڕان، (قطیعة) و خۆجیاکردنەوەیە لە (کۆمەڵگەی نەفامی) وەك رێخۆشکردنێك بۆ هەڵوەشاندنەوە و تیابردنی لە داهاتوودا[2]. هەنگاوێکی لەم جۆرەش بیرکردنەوەو رۆحیەتێکی تایبەت بە خۆی دەخوازێت، ئەویش ئەوەیە کە هەڵگرانی بانگەوازی ئیسلامی و تێکۆشەرانی رێگای گێڕانەوە ئیسلامو حاکمیەتی خودا (خۆمان بەدوور بگرین لە کۆمەڵی نەفامیو بەهاو بۆچوونەکانیو بە چاوی سووك سەیری بکەین، وە ئێمە ئامادە نەبین بچوکترین سازشی بۆ بکەینو تۆزقاڵێ لە بەهاو بۆچوونەکانی خۆمان بگۆڕینو دەستکاری بکەین. بە مەبەستی ئەوەی لە نیوەی

---

[1] سید قطب، معالم في الطريق، ص٤٠.

[2] د. سعيد بن سعيد، سەرچاوەی پێشوو، ص٣٢.

ڕێگادا بـە یەکـدی بگـەین. چـونکە ئێمـەو ئـەوان لەسـەر دووڕییـانێکین لەگـەڵ یەکـداو هـیچ شـتێك بەیەکمانـەوە نابەسـتێتەوەو هـیچ خـاڵێکی هاوبەش لەنێوانماندا نییە. چـونکە یـەك هـەنگاو لەگـەڵ نـەفامی بـڕۆین کۆی ڕێبازو ڕێگاکە لەدەسـت دەدەیـن[1]!!. ڕەتکردنـەوەی کۆمەڵگـەی نـــەفامی، کـــە هـــەموو کۆمەڵگـــە موســـڵمانەکانیش دەگرێتـــەوە. ڕەتکردنەوەیـەکی هەمەلایەنـەو ڕەهایـە، چـونکە لەڕوانگـەی ئـەوەوە ململانێی نێوان (ئیسلام)و (نەفامی)و جوڵانەوەی ئیسلامیو کۆمەڵگەی نەفامی دادەڕێژێت (سفری)یە، واتە دەبێت بە شکستو کۆتایی هێنـانی یەکێکیان کۆتایی بێت. بە حوکمی ئەوەی پرسەکە سەبارەت بە (سـید) پرسێکی (عەقیدە)ییە، پرسی عەقیـدیش سـازشو نـەرمی هـەڵناگرێتو هـەموو بیرکردنەوەیـەك چارەسـەری مـام ناوەنـدی دەسـتبەردانە لـە (عەقیـدە)و بنـەماکانیو لۆژیکـە ناوەکییەکـەیو دەرکەوتـە مەیـدانیو مادديیەکانی. پەیوەندی نێوان جیاوازی (اختلاف) نییە، تا بـە گفتوگۆ لەیەك تێگەیشتنو لە نیوەی ڕێگا گەیشتن بە یەك چارەسەر ببێت، بـەو جـۆرەی سروشـتی سیاسـەت دەیخوازێـت، بـەڵکو ئـەو پەیوەندییـە گەیشتۆتە ئاستی دژ بەیەکی (تناقض) و جگە لە چارەسەری ڕیشەیی، کـە لـە هەڵتەکانـدنی پایـەکانی نەفامیـدا بـە هـەموو ئاسـتو دیـاردە دەرکەوتەکانی خۆی دەبینێتەوە، ڕێگایەکی تر بوونی نییە.

---

[1] سيد قطب، معالم في الطريق، ص٢٢.

بانگەواز لەم خوێندنەوەدا، بە تەواوی رەهەندە کۆمەڵگەیی و گشتیی و چاکسازییە ئەخلاقییە تاکە کەسییەکان و کۆمەڵایەتییەکان دەدۆڕێنیی و لـە دەسـتی دەدات. دەبێـت بـە وەسـیلەیەك بـۆ بەرجەسـتەکردنی ئایدۆلۆژیای حاکمیەت، کە مەبەست تیایدا هۆشیارکردنەوەی موسڵمانان نییـە لـە خراپـەی گونـاهو تـاوانو هانـدانیان لەسـەر خواپەرسـتیی و چاکەخوازیی و پارێزگـاری (تقـوی)، بـە مانـا سـوننیی و مىللییـە باوەکـە، بەڵکو کارکردنە بە ئاراستەی پێگەیانـدنی پێشـەنگایەتێکی بـاوەڕداری خۆنەویستو عەقیدیی و گیـان لەسـەر دەسـت، گۆشـکراو بـە ئایـدۆلۆژی (حاکمیـەت)، بـۆ ئـەوەی لـەرێی دووبـارە، وە رێخـستنەوەی کـاروانی جوڵانەوەی ئیسلامی نوێ، بەهەمان ئەو شێوەی لە سەرەتای ئیـسلامدا هەبووە، لە پێناو گێڕانەوەی حاکمیەتی خواو پارێزگاری لە قەڵەمڕەوی دەسـتەڵاتی خواوەنـدێتی خـودا، کـە لـە سـایەی نـەفامیی و خـۆ بەخاوەنزانینی رێبازی مرۆڤەکانەوە، دووچاری هێرشو پەلامار بۆتەوە، خـەباتو تێکۆشـان بکـات!! ئـەم بۆچـوونەش تـا ڕادەیـەکی بەرچـاو نوسخەی لەبەرگیراوەی پارتی پێشڕەوی (لینینیزم)ە، کە مەبەست لێی ئەو پێشەنگە ئایدۆلۆژیستە شۆڕشـگێڕانەیە ئـەرکی رێبەرایـەتی کردنـی شۆڕشو گۆڕانی بە قازانجی پرۆلیتارو سۆشیالیزم دەگرێتە ئەستۆ.

بابـەتی بانگـەواز لـەم فۆرمەیـدا (عەقیـدە)یـە، ئـەوەی پاسـاوی چـڕکردنەوەی بانگـەوازیش بـە دەوری عەقیـدەدا دەدات، لای (سـید)

دەسـتپێکردنی ئیـسلام‌و سروشـتی پەیامەکەیـەتی، کـە سـەرەتا بـە دروشمی: ﴿قولوا لا اله الاّ الله تفلحوا﴾[1]. دەستی پێ کردووە واتە بڵێن: (لااله الاّ الله) سەرفراز دەبن. بەڵام لە بانگەوازی ئیسلامی لە قۆنـاغی دووبـارە راگەیاندنـەوەی ئیـسلامدا بـێ ئـەوەی پێغەمبـەر و رابـەرێکی ئیسلامی مەعسوم لە ئارادا بێت، تـەنها وتنـی (لا الـه الاّ الله) بـە فریـای مـرۆڤ ناکـەوێت‌و رزگـاری ناکـات‌و تەنانـەت نایخاتـە ریـزی موسـڵمانانی باوەڕداریشەوە، هەر بۆیە موسڵمانانی سەردەم با خۆشیان بە موسڵمان بزانن دەبێت حسابی ناموسڵمانیان بۆ بکرێت‌و لە ئەلفی عەقیدەو (لا الـه الاّ الله)ەوە لەگەڵیان دەستپێبکرێتەوە!![2].

(لا الـه الاّ الله) شـتێ نامێنـێ بـە دانپیانـان‌و وتنـی حەسـانە بـۆ مـرۆڤ دروست بکات، ( من قـال لا الـه الا الله حـرّم دمـه و مالـه و عرضـه). هـەروەها چۆن پێغەمبەر (ﷺ) وای دەکردو رووبەڕووی (خالدی کوڕی وەلید) کە پیاوێك لەگەڵ ئەوەی شایەتمانی (لا اله الاّ الله محمد رسـول الله)ی هێنـابوو، کوشتبووی. پێغەمبەریش (ﷺ) پێناخۆشـبوونی خـۆی لـە کردارەکـەی دەربڕی‌و بـە نـاڕەواو نائیـسلامی دایـە قەڵـەم، ویـستی بزانـێ کێـشەی لەبیرکردنەوەی (خالد)دا لە کوێیدایە وا بـەم جـۆرە کەوتۆتـە هەڵـەوەو سنوورەکانی ئیـسلامی لـە مامەڵـەکردن لەگـەڵ بەرامبەرێکـدا پـشتگوێ خستووە، بۆ ئەوەی بۆی راست کاتەوەو ئەم هەڵە لە ژیانیـدا ببێـت بـە

[1] داواکاری پێغەمبەر (ﷺ) بوو، لـە هاوبەشی پەیداکەرانی سەردەمی خۆی.

[2] سید قطب / معالم في الطريق، لا ٤٠.. و محمد قطب /

رووداوێكی تێپەڕو بەها ئیسلامییەكان بەسەر ئاراستەكردنی رەفتاریدا فەرمانڕەوابن.

ئەویش لە وەڵامدا وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆیە كوشتم چونكە لە ترسا وتی (واتە لە دڵەوە نەبوو راستگۆ نەبوو لە وتنەكەیدا)، پێغەمبەریش (ﷺ) ویستی رێساو تەرازوویەكی بدات بە دەستەوەو ئەو بنەما ئیسلامییەی پێ بڵێت، كە دەڵێت: (الشرع يأخذ بالظاهر والله يتولى السرائر) شەریعەتی ئیسلام كار بە رواڵەتی كار دەكات و نیازی پەنهانی مرۆڤەكان هەواڵەی خودا دەكاتو بۆ ئەوی بەجێ دەهێڵێت. بۆیە رووبەڕووی خالد فەرمووی (هلاّ شققت عن قلبه؟!) داخۆ دڵت كردەوە تا بزانی بەڕاستییەتی یاخود نا؟!.

بەڵكو لەوەش قوڵتر لە دەقی دامەزرێنەری ئیسلامدا واتە قورئان خۆیدا ئەم پرسە چارەسەر كراو خودای گەورە رووەو باوەڕداران فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا ضَرَبْتُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَتَبَيَّنُوا وَلَا تَقُولُوا لِمَنْ أَلْقَىٰ إِلَيْكُمُ السَّلَامَ لَسْتَ مُؤْمِنًا تَبْتَغُونَ عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا فَعِنْدَ اللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٌ ۚ كَذَٰلِكَ كُنْتُمْ مِنْ قَبْلُ فَمَنَّ اللَّهُ عَلَيْكُمْ فَتَبَيَّنُوا ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا﴾[١]. واتە كاتێ یەكێ سڵاوتان لێ دەكاتو بەوەش ئاماژە بە ناسنامەی موسڵمان بوونی خۆی دەكات، ئێوە پێی مەڵێن: تۆ باوەڕدار نیت، ئەگەر بەو جۆرە رەفتار بكەن، ئەوا دەیسەلمێنن مەبەستان لە كارەكەتاندا، دەستكەوت و زرقو برقی دنیایە نەك خوداو پاداشتی رۆژی دواییو ئیسلام.

---

[١] النساء/ ٩٤.

هێڵی گشتی ئەهلی سوننەش لە مێژوودا بەم جۆرەیە کەچی لای (سید)و (محمد قطب)ی برای و هاوبیرەکانیان (لا الـه الاّ الله) ناوەرۆکێکی هەمەلایەنەو ئایدۆلۆژیو قورسی وای پێ دەدرێت کە زۆرینەی زۆری خەڵك توانای ئەوەیان نەبێت پێی بگەنو لە خۆیانی بگرن، رەهەندێکی نوێش دەخاتە سەر (یەکتاپەرستی) کە بە یەکتاپەرستی (حاکمیەت) ناوی دەرکردووەو بەشێکی ئایدۆلۆژی نوێو پەرەپێدراوی (سید) و (مەودودی)و دواتر سەلەفیەتی جیهادییە. ئەوەی (سید)و سەلەفیەتو سەلەفیەتی جیهادییش دەگەیەنێ بە یەكو (سید)و بیروڕاکانی دەکات بە سەلەفیەتی حەرەکی جولانەوەخواز، پێداگرتنە لە بە تەوەرەبوونی (عەقیدە) لە بانگەوازو جیهانبینی سەلەفی دا. هەروەها بەستنەوەی (عەقیدە) و (یەکتاپەرستی) بە تیۆر یاخود ئایدۆلۆژیای حاکمیەتی خوداییەوە، لێرەشەوە رەتکردنەوەی واقیعی نوێی کۆمەڵگەو وڵاتانی ئیسلامیو (تکفیر) و (تجهیل)کردنیان لە سۆنگەی هاوبەشی پەیداکردن (شیرك)ی یاسایی و سیاسییەوە[1]. تێگەیشتنی (سید) و (محمد قطب)ی برای و هاووێنەکانیاندا، ئێمە لەبەردەم واقیعی کۆمەڵگەیەکی موسڵمانی (ئیمان) ساردو سڕو نەبوونی خاوەن تێگەیشتنێکی راستی ئیسلامی و نابەرچاو ڕوون و سەرسام بە شێوە ژیانی خۆرئاواو بێ ئاگا لە جەوهەری دیندا، دانانێت.

---

[1] لەم رووەوە بۆ ناسینی بنەماکانی ئایدۆلۆژیای سەلەفیەتی جیهادی نوێ بگەڕێرەوە بۆ: الحركات الأسلامية في الوطن العربي. بەرگی دووەم/ لا١٢٠٩–١٥٨١

بـەو جـۆرەی (بـەننا) لـە زیـاد لـە شـوێنێكی پەیامەكانیـدا ئامـاژەی پێدەكاتو ئەو واقیعەش دەكـات بـە پاسـاوێكی بـەهێزی سـەرهەڵدانی بانگەوازەكـەیو كەرەسـەیەكی هانـدەری دەروونـی هـەڵگرانی. واتـە لەبەردەم هیچ بیركردنەوەو هەستو هەناسەیەكی ئیسلاحخوازانەدا نین. تا لە رێگەیەوە، هەوڵی دووبارە بوژاندنەوەو بالادەستكردنەوەی حوكمە ئیسلامییەكان بدەین، بەڵكو هەر لە بنەڕەتەوە شتێ بە ناوی كۆمەڵگەی موسڵمان بوونی نەماوە، چـونكە ئـەوەی بـەننا نـاوی نـابوو كۆمەڵگـەی موسڵمانی ناتەواو، لای (سید) نامێنێ، كۆمەڵگـەی ئیـسلامییەك فـۆرمو دەركەوتەو بەرجەستە بوونی هەیە، ئەویش ئەوەیە وردو درشتی ژیانو كۆمەڵگە لە سایەی حاكمیەتی شەریعەتی خوداو پێشەنگانی باوەڕداردا بەڕێوە بچێت، وە هیچ بۆچوونو بەهاو پێوەرێكی تـر بوونیـان نـەبێتو بە تـەواوەتی سـڕابنەوە، یـاخود كرابنـە دەرەوەی مـاڵی بـاوەڕدارانی یەكتاپەرستو كۆمەڵگە مەلەكوتییەكەیانەوە[1].

بەڵكو لەوەش زیاتر (سید) گاڵتەی دێت بەوەی هەڵگرانی بانگەوازی ئیـسلامی سـەرقاڵی تازەكردنـەوەی (فقـە) و باسـكردن لـە تیۆرییـە سیاسییەكانو مـۆدێلی حـوكمڕانی بـن، چوارچـێوەو سـیماكانی دیـاری بكـەنو بانگەشـەی بـۆ بكـەنو هـەوڵی جێبـەجێكردنی بـدەن، هـەموو كـارێكی لـەم جـۆرە بـە ناپێویـست دەزانێـت، پێـی وایـە بەشـێكە لـە وەلامدانەوە بەو فشارانەی نەفامی لەم رووەوە بۆ بانگخوازانی ئیسلامی

[1] سید قطب/ معالم في الطريق، لا ٢٠-٢٢.

دروستکردووەو دەیەوێت (احراج)یان بکات، لای ئەو هەموو ئـەم شـتانە دەبێ بکەونـە دوای دامەزرانـدنی کۆمەڵگـەی ئیـسلامی لەسـەر بناغـەی عەقیدەی (لا الـه الاّ الله) کە حاکمیەت تیایدا جگە لە خوا بۆ کەسـی تـر نەبێتو دان بە ڕەوایەتی هیچ دۆخێکدا لە دەرەوەی ئەوەوە نەنرێت[1].

دەبێت پـێش هـەموو شـتێك شۆڕشـی عەقیـدەیی سـەرکەوتبێت، وە لەسـەر ئـەو بناغـە خـەڵك وا پێگەیـەنرابێت کـە لـە دڵـەوە ملکەچـی شەریعەتو حوکمی خوا بنو جگە لەو هـیچ یاسـاو بەرنامەیـەکی تریـان قبوڵ نەبێت، ئەنجا باس لە دانانی یاساو دیاریکردنی سیستمی سیاسـی بکرێـت[2]. هەڵبـەت ریـشەی ئـەم بۆچـوونە لای (بـەننا)ش هەسـتی پێدەکرێت. ئەویش پێکهێنانەوەی کۆمەڵگـەی موسـڵمان وەك ئامـانجی سـێهەم لـە ریزبەنـدی ئامانجـەکانی برایانـدا، دەکـات بـە پێـشمەرجی دامەزراندنی حکومەتی ئیسلامی، بەڵام مەسـەلەکە لای ئـەو بـە ئاسـتی (قطـب) توندوتیـژ نییـەو بانگەوازەکـەی هـەمووی لـە عەقیـدەدا کـورت نەکردۆتەوەو مژدەی بـە سیـستمی حـوکمڕانی ئیـسلامی دەداو هەسـت دەکرێـت رازی بـووە بـەوەی کوتلەیـەکی مێـژوویی لـە کۆمەڵگـەدا سەرهەڵبداتو توانای بە ئەنجامگەیاندنی ئەرکەکانی قۆنـاغی راپەڕانـدن

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل٣٨٧.

[2] هەمان سەرچاوە و لاپەڕەی پێشوو. ئەم بۆچوونە چارەنووسو ئەزموونی موجاهیدانی ئـەفغانیان بیر دێنێتەوە، کە لە کاتێکدا رژێمی ئەو وڵاتە لـە روخاندابوو. خەریکبوو دەگەیـشتنە نـاو کـابوڵ هێشتا ئەو رژێمەی بەنیاز بوون دایبمەزرێنن لـە مێشکیاندا ڕوون نەبوو، هەندێکیشیان دەگەڕانـەوە بۆ کتێبە کەلـەپوری یەکانی بواری فقهی سیاسی وەك (الأحكام السلطانية)ی ماوەردی بـۆ ئـەوەی لێیەوە فێر بن حکومەتی ئیسلامی چی یە و چۆن دادەمەزرێت!!.

(تنفیذ)یان هـەبێت، دەوڵـەتی ئیـسلامی دابمـەزرێتو دواتـر لـە رێگـەی میکانیزمـەکانی دەسـەڵاتەوە شـەریعەت بەسـەر خەڵکەکـەدا جێبـەجێ بکرێت، بە ئاستی ئیمانیی جیاوازیانەوە. لەکاتێکدا (سید) بە کاریگەری ژیان لە سایەی واقیعی (ستەمکاری ـ استبدادی)و زیندانو ئەشکەنجەو خەفەکردنی ئازادیدا، ئەم دۆخەی تێپەڕاندووەو پێی وایە ئەو کۆمەڵگەی شایستەی ئیسلامەو هەیبەتی شەریعەتەکەی تێدا دەپارێزرێت، دەبێت لەسـەر بناغەیـەکی عەقیـدەیی روون و بێگـەرد بنیاتنرابێتـەوە و پیادەکردنی شەریعەت پێش ئەوەی کرداری بێت دەسـەڵاتێکی سیاسـی پێی هەڵسێت، دەبێت خواستێکی ئیسلامیو داواکارییـەکی قـوڵایی دڵو هـەناوی خەڵکـە باوەڕدارەکـە بێـت. کـە روونـە ئـەم لێکدانـەوە هـەموو هـەوڵێك بـۆ دروسـتکردنی کۆمەڵگەیـەکی لـەو جـۆرە لـە چوارچـێوەی واقیعی هەبوودا، رەنگە تا رۆژی دواییش، دەکات بـە یۆتۆپیـاو (مدینـة الفاضلة)ی و نایەتـە دی. دەتـوانین ئـەم پێداگرتنـەش لـەم رووەوە بـە قازانجی رەتکردنەوەی حوکمی دینیو تیۆری حاکمیەتی ئیلاهی سوودی لێ وەربگرین (بـە حـوکمی ئـەوەی ئـەو بانگەشـەی بـۆ دەکـات حـوکمی دینییە نەك ئیسلامی تەنها ئەوەیە بەناوی ئیسلامەوەیە) و رەوایەتی لە هەر هەوڵێ بەو ئاقارەدا بۆ دامەزراندنی سیستمێکی سیاسی لەو جۆرە، بـە لـۆژیکی خـودی وتـەکانی (سـید) رەتبکرێتـەوە. بـەڵام کێـشەکە لەوەدایە، کە لە بـوونی ئـەم جـۆرە بیرکردنـەوەو گروپـی توندڕەوانـەو مەترسی پەنابردنە بەر تیرۆرو توندوتیژی زیاد دەکاتو کۆمەڵگـەش بـە نیمچە بـەردەوامی لـە دۆخـی لـەناکاوو ناسـەقامگیردا دەهێڵێتـەوە، بـە

حوكمی بوونی گوتـارێكی ئـاینی داخـراو و تونـدو رادیكـاڵ، كـە هـەموو جـــۆری ڕەوایەتییـــەكی ئـــاینی لـــە كۆمەڵگـــەو دامو دەزگاكـــانی دەسەنێتەوە ! !

بەشـداریش دەبێـت لـە شـێواندنی هەنـدێ لـە سـیماكانی ئیـسلام و شلەژانی دروستكردن بۆ هەندی لەو ڕۆڵە سروشتییەی كـە پێویـستە لـە كۆمەڵگەیەكی موسڵماندا بیگێڕێت.

ئەوەی جێگای سەرنجە لەگەڵ ئـەم لەقاڵبدانـە ئایـدۆلۆژیو داخـراوو توندەی ناوەڕۆكی چەمكی بانگەوازی ئیسلامی لەسەر دەسـتی (سـید)و (محمد قطب)ی برایو هاوبیرەكانیان، ئـەم بیرمەنـدی ئیـسلامییە، نـەك هەر لە پەراوێزی بیركردنەوەو ناوەندە ئیسلامییە حەرەكییەكەی نیوەی دووەمی سەدەی بیـستەم و ڕەنگـە لـە هەنـدێ شـوێنو لـە نـاو هەنـدێ گرووپیـشدا تـاكو ئێـستاش، نـەبووە، بـەڵكو زیـادەڕەوی ناكـەین كـە كاریگەرترین كەس بـووە بەسـەر داڕشـتنی فیكـرو جیهـانبینی زیـاد لـە نەوەیەكی ئیسلامی لە ناوچـەكەدا، بـە حـوكمی ئـەو فـەزا داخـراوو پـڕ سەركوتو ستەمكارییە سیاسییەی بۆ دەیان سـاڵ درێـژەی كێـشا، كـە بیروڕا توندەكانی (سید) لەسایەی ئەودا سەریان هەڵدابوو خـەملێبوون. مانەوەشی پاساوی بە زیندوو مانەوەیان بوون.

ماوەتەوە لێرەدا ئاماژە بكەین بەوەی كە لە پـاڵ بیروڕاكـانی (سـید قطـب) لەمـەڕ (عەقیـدە) و ڕەنگدانـەوەكانی یەكتاپەرسـتی دا، خـودی (اخـوان)یـش لـەدوای پەنجاكانـەوە، بـە حـوكمی میحنـەتی زینـدانو ئاوارەبوونو مانەوەی هەندێكیان لە وڵاتانی كەنداو، مـۆركو سـیمایەكی

سەلەفی بەسەریاندا زاڵ بوو. بە جۆرێك بەشی لەوەی ئێستا سەلەفییەکان دەیکەن، تا کۆتایی هەشتاکانیش لەناو (برایان) و پەروەردەکەیاندا بڵاو بوو، تەنها ئەوەیە ئێستا هەندێکیان تێپەڕاندووە و سەلەفییەکان لە واقیعی حەفتاو هەشتاکانی ئەواندا دەژین.

سەرنجێکی تریش لێرەدا دەمەوێت لەمەڕ تیۆری حاکمیەتو ناوەرۆکی (عەقیدە) لای (سید)و سەلەفیەتی جیهادی باسی بکەم ئەوەیە کە پێموایە هەموو توندڕەوی و پێداگرتنێکی زیاد لە پێویست لەسەر یەکتاپەرستی (توحید) و رەهەندی نوێ پێدانو وردکردنەوەی و کردنی بە پێوەر بۆ حومکدان بەسەر (ئیمان) و ناسنامەی موسڵمانێتی کەسانی دیدا، بە جۆری لە جۆرەکان، سەری لەشێواندنی ناوەرۆکی چەمکی یەکتاپەرستییەوە دەردەچێت.

# فەسڵی پێنجەم
# چەمکی سیاسەت لە مەرجەعیەتی رەوت و
# ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ دا

سەرەڕای ئەوەی ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ ئاماژەیە بە راڤەیەکی سیاسییانەی ئیسلام، ئەم راڤەکردنە سیاسییەش بۆ ئیسلام لای بیرمەندانی وەکو (مەودودی) و (سید قطب) دەگاتە ترۆپکو ئاستێکی مەترسیدار[1].

[1] لەم رووەوە بگەڕێرەوە بۆ: أبو الحسن علي الحسني الندوي، التفسير السياسي للأسلام، دار البشائر، بيروت، ٢٠١٤.

خەمی سەرەکی جوڵانەوەی ئیسلامی نوێ خـەمێکی سیاسـی بـووە، بەڵام تا ڕادەیەکی زۆر بە عەقڵێکی ناسیاسیو ناسنامە گەرانەی زیاد لە پێویستەوە سەرەڕای گرنگییدانی زۆری جوڵانەوەو بانگەوازی ئیسلامی نوێ، بە مەسـەلە سیاسـییەکانی وەك دەسـەڵات، حکومـەت، دەوڵـەت، خەلافـەت، کەچـی نـەیتوانیوە هـیچ بەرهـەمێکی فیکـری شـایانی بـاس دەربارەی چەمکی سیاسـەت، بـە وێنـەی چـالاکییەکی مرۆیـی مـەدەنی بخاتەڕوو، زۆر بە دەگمـەن نـەبێت، ئـەدەبیاتی ئـەم تەوژمـە خـۆی لـە قـــەرەی قـــسەکردن دەربـــارەی ماهیـــەتی سیاســـەتو دەرکەوتـــەو جەبرەکانی نەداوە. گەڕانەوەی ئەو بۆ سیاسەت، بە پلـەی یەکـەم وەك پێویستییەکی ناسـنامە گەڕانـەو دووبـارە پێناسـەکردنەوەی ئیـسلام و هەمەلایەنە بوونی بووە. واتـە بـۆ ئـەوە بـوو بیـسەلمێنێت کـە ئیـسلام سیـستمێکی سـەراپا گـیری ژیـانی تێـرو تەسـەلو بـێ کـەمو کوڕییـە، سیاسەتیش بێ هیچ دوودڵییەك بەشێکە لەو و لێی جیانابێتـەوە[1]. واتـە سیاسـەت وەك چـەمك بابـەتێکی سـەربەخۆی تێڕامـانو قـسە لەسـەر کـــردنو شـــیکاریو توێژینـــەوە و هەڵـــسەنگاندن نـــەبووە. ئەمـــەش درێژەپێـدەری هەنـدێ رەهەنـدو رووی رێبـازی زانایـانی موسـڵمانە لـە مێژوودا لە هەمبەر سیاسەت، چونکە زانایانی موسڵمانان لە مێژوودا بـە سـیفەتی زانـستێکی جیـاواز و سـەربەخۆ قـسەیان لەسـەر سیاسـەت

[1] د. توفيق يوسف الواعي، الفكر السياسي المعاصر عند الأخوان المسلمين، ص٢٢-٢٣.

نەکردووە، بەڵکو وەك بەشێ لە (فقە)و لە زانستی کەلامی مشتومڕیان لەسەر کردووەو لە چوارچێوەی زانستە شەرعییەکاندا خراوەتە ڕوو[1].

(بەننا) ئاماژە بە مانای زاراوەی سیاسەت لە ڕوانگەی (برایان)ەوە دەکاتو دەڵێت: (ئێمە سیاسیین، بە واتای ئەوەی بە تەنگ کاروباری نەتەوەکەمانەوە بن، وە بیروباوەڕمان وایە هێزی ڕاپەڕاندن بەشێکە لە ڕێنوێنی (تعالیم)ە ئیسلامییەکانو دەچێتە چوارچێوەی و لە ژێر حوکمەکانیدا ریز دەگرێت، وە ئازادی سیاسیو سەربەرزی نەتەوە پایەیەکە لە پایەکانیو ئەرکێکە لە ئەرکەکانی[2]. ئێمە کار دەکەینو لە بەر ڕۆشنایی ئیسلام هەنگاو هەڵدەگرین).

لێرەدا بەننا ئاماژە بە واتاو ناوەڕۆكو ڕەهەندەکانی سیاسی بوونی خۆیان دەکات، وەڵامی ئەو کەسانەش دەداتەوە کە پێیان وابووە (برایان) بە تێکەڵ بوونیان بە سیاسەتو ململانێی سیاسی لە بازنەی بانگەوازی ئیسلامی چونەتە دەرەوەو ڕەوتی کارکردنو جۆری ناسنامەو ماهیەتی بانگەوازەکەیان گۆڕیوە. ئەم بۆچوونەی خەڵکیش لەوێوە سەرچاوەی گرتبوو کە برایان بۆ ماوەی (١٠)ساڵ لە سەرەتای کارکردنیانەوە خۆیان وەك کۆمەڵەو بانگەوازێکی ئاینی ناساندبوو، زۆر خۆیان لە قەرەی ململانێو بابەتە سیاسییەکان

---

[1] دکتور فؤاد محمد النادي، موسوعة الفکر السیاسی و نظام الحکم في الأسلام، الطبعة الأولی، جامعة صنعاء، ١٩٨٠،لا٧٢.

[2] مجموعة رسائل، ب یەکەم، لا٧٢

نەدەدا[1]. بەڵام لەڕاستیدا تەنها لەڕووی سیاسەتی ڕۆژانەو ململانێ سیاسییەکانەوە، خۆیان لە سیاسەت دوور گرتبوو، دەنا لە ئاستی فیکرو بیرکردنەوەی سیاسی دا هەر لە سەرەتاوە سیاسەت تێکەڵ بە بانگەوازو پەروەردەکەیان بوو بوو، چونکە هەڵگری بیرۆکەی ئیسلامی هەمەلایەنە بوون، کە هەڵوێستێکی دینی سیاسی بوو، بەرامبەر عەلمانیەتو ئەو فۆرمە زاڵە لە تێگەیشتنی ئیسلامیش کە لەو کاتەدا باو بووە، بەننا لەم پەرەگرافەدا دەیەوێت لە یەك کاتدا زیاد لە ئامانجێك بپێکێت، لەوانەش:

١. ئەوان هەر لە سەرەتاوە سیاسەت بەشێ بووە لە بانگەوازو پرۆژە ئیسلامییەکەیان بە دەربڕینی (عبدالقادر عودة) ــ (دەوڵەت) وەك بەرجەستەکەری بنەڕەتی سیاسەت و چوارچێوە بۆ پیادەکردنی، بەشێکە لە خودی سروشتی ئیسلام خۆی[2]. ئەمانیش بە حوکمی هەڵگرتنیان بۆ بانگەوازی ئیسلامی هەمەلایەنە، سیاسەت بەشێکی جیانەکراوەی بانگەوازەکەیان بووە.. بەڵام ستراتیژی کارکردن بە پلە بە پلەو دورگرتنی بانگەوازەکەو تێکەڵ نەبوون بە ململانێ سیاسییەکان تا خۆی دەگرێتو پێگەی بەهێز دەبێتوسیماکانی دەخەملێتو خەڵکی دەیناسن، وای کردووە قۆناغی سەرەتا سیما سیاسییەکەی زۆر نەدرەوشێتەوەو دیار نەبێت، (بەننا) زۆر پەرۆش بووە بۆ جەختکردنەوە لەوەی هەموو ئەوەی ئەوان دەیکەن، لەبەر ڕۆشنایی ئیسلامدایەو لەو دەرنەچووە.

---

[1] مجموعة رسائل، ب یەکەم، لا١١٨

[2] عبدالقادر عودة، الأسلام و أوضاعنا السیاسیة، لا ٧٩-٨٠.

٢. چوارچێوەداركردنی تایبەتمەندی و جۆری تێگەیشتنی برایان بۆ سیاسەتو سیاسەتكردن، بە حوكمی ئەوەی كە خۆیان بە هەڵگری بانگەوازێكی ناوازەو جیاواز لە كۆی بانگەوازەكانی گۆڕەپانە فیكریو سیاسییەكەی سەردەمی خۆیان زانیوە، هەر لەو سۆنگەوە كە برایان بە پلەی یەكەم كاریان لەسەر پرسی ناسنامە كردووە، ناسنامەگەرایش بە سروشتی حاڵ بەشێكی گرنگ لە ئاماژەو خەسڵەتەكانی لە جیاواز بوون لەگەڵ بەرامبەرەكاندا وەردەگرێت. (بەننا) كە رەخنەی توندی ئاراستەی سیاسییەكانی وڵاتەكەی دەكردو لە بڕگەیەكی مێژووی سیاسیدا بەوە تاوانباری دەكردن كە جڵەویان داوەتە دەستی داگیركەری بێگانەو هێندەی خەریكی خۆیانو بەرژەوەندییەكانیانن خەریكی گەلەكەیان نین، لە ئیدارەدانی وڵات شكستیان خواردووەو بەڵاو ناڕەحەتیان بەسەر خەڵكیدا هێناوە[1].

بە كورتی (بەننا) دەیەوێت بڵێ (برایان) سیاسین، بەڵام نەك وەك سیاسییەكانی تر. سیاسەت بەشێكە لە پرۆژەو بانگەوازەكەیان، بەڵام تێگەیشتنیان بۆ دەركەوتەو بابەتەكانیو جۆری پیادەكردنی جیاوازە. بەوەش پێناسەی سیاسەتو سیاسی بوون دەكاتەوەو، ئەم پرسە دەكات بە مەیدانێكی تری خستنەڕووی جیاوازیو زەرورەتی (برایان) بۆ (دەوڵەت) لە یەك كاتدا.

---

[1] مجموعة رسائل، ب. دووەم،ص١١٤

**ماناى سياسى بوونيش هەروەك لە دەقەكەدا هاتووە بەم شتانەى خوارەوە لەقەڵەم دەدات:**

١. بە تەنگەوەبوونى كاروبارى نەتەوە: واتە كەمتەرخەم نەبوون‌و وازهێنان لە دۆخى تەماشاكەرى و هەڵوێستى نەرێنى‌و بێباكى لە بەرامبەر چارەنووس‌و خەم‌و كاروبارەكانى گەل‌و نەتەوەو كارلێك لەگەڵيان‌و بەتەنگەوە بوونيان.

٢. جەختكردنەوە لەوەى كە (حكومەت) ياخود دەسەڵاتى راپەڕاندن، بەشێكى جيانەكراوەى ئيسلامەو لەچوارچێوەى ئەحكامەكانى دەرناچێت. لە كاتێكدا خەڵكێكى زۆر ئەم قەناعەتەيان نييەو بەو جۆرە (حكومەت) ناكەن بە پێويستييەكى ئيسلامى‌و لە چوارچێوەى ئەودا بيرى لێ ناكەنەوە.

٣. سەربڵندى نەتەوەيى‌و ئازادى سياسى پايەو ئەركێكى ئيسلامييە، ديارە ئێمە دەبێت هەموو ئەم چەمكانە (سەربەرزى) (ئازادى سياسى) لە چوارچێوەى مەرجەعيەتى ئيسلامى‌و جۆرى تێگەيشتنى برايان بۆ ئەو مەرجەعيەتە و سروشتى ئيسلام‌و پەيوەندى ئەو بە سياسەت‌و ژيانى گشتييەوە تێبگەين. سەربەرزى (عـزّة) چەمكێكى قورئانييە، وشەى (قومية)ش لاى (برايان) و (مەودودى)ش بۆ گوزارشت دانەوە لە خودى جوڵانەوەى ئيسلامى‌و قەوارە سياسييە نێودەوڵەتييە لەدەست چووەكەى خراوەتە ڕێ، بەكار هێنراوە [١].

---

[١] أبوالأعلى المودودي، الحكومة الأسلامية.وەرگێڕانى، أحمد ادريس، دار السعودية للنشر و التوزيع، ١٩٨٤، ل٢٥٩-٣٠٥.

سەربەرزی نەتەوەیی دەشێت بە شێوەیەکی کاتی بازنەی (گەل)ی (میسر)یش بگرێتەوە. بەڵام مەبەستی بنەڕەتی لێی شانازی کردنە بە ئیسلامو ناسنامەی ئیسلامیو ئوممەتی ئیسلامەوە. مەبەست لە ئازادی سیاسیش ئەوە نییە کە لیبرالیزمو دیموکراسی پێمان دەڵێن، چونکە (بەننا) بڕوای بە فرەحیزبی نەبووە. بەڵکو مەبەستی سەرەکی لێی (رزگاری) بووە، واتە دەرچوون بووە لە سایەو هەژموونو پاشکۆیەتی ئیستیعمار، کە ئەو کاتە (میسر) و زۆربەی وڵاتانی ئیسلامی بەدەستییەوە ناڵاندوویانە، هەر لەم چوارچێوەشدا پەیمان دەدات کە ئەوان تێبکۆشن بۆ تەواوکردنی مەسەلەی رزگاربوون لە پاشماوەکانی هەژموونی ئیستعمار بەسەریانەوەو لە خەمی چاکسازی کردنیش لە دەزگای راپەڕاندندا بن.

هەڵبەت (بەننا) بەم پێناسەکردنو دیاریکردنەی بۆ مانای سیاسی بوون لەلای (برایان) جگە لە دەرخستنی جیاوازییەکانی تێگەیشتنی ئەوان بۆ سیاسەتو کاری سیاسی، بە ناڕاستەوخۆش رەخنە لە بەرامبەرەکان دەگرێت کە ئەوان کار بۆ ئەو ئامانجە ناکەنو خەریکی خۆپەرستیو بەرژەوەنییە تاکەکەسیو گروپیەکانی خۆیانو کلکایەتی بێگانەو ململانێی ناشەریفن. بە گشتیش پێناسەی بەننا بۆ سیاسەت هەڵقەیەکی ترە لە هەوڵەکانی بۆ رەتکردنەوەی (عەلمانیەت)و جیاکردنەوەی ئیسلام لە دەوڵەتو حوکمڕانیو یاسادانان[1]. چونکە

---

[1] د. يوسف القرضاوي، التربية الأسلامية و مدرسة حسن البنا، ص٨٢-٨٣.

ئـــەوەی ئـــەو بەدوایـــەوە بـــوو بـــە یەکـــەوە گرێدانـــەوەی ئیـــسـلامو سـیاسـەت بوو، سـەلماندی ئـەوەبوو، کـە هـیچ دژایەتـییەك لـەوەدا نییـە، لـە یـەك کاتـدا موسـڵمان بیـتو پێوەرەکانـت لـە ئیـسلامەوە وەربگریـتو سیاسـی بێـت. هـەوڵی گێڕانـەوەی حـوکمڕانی ئیـسلامی بدەیت، ئەگەر خەڵکانێك ناتوانن ئەم ئیسلامی بوون و سیاسەتکردنە لە چوارچێوەی بانگەوازو ڕێکخراوێکدا وێنە بکەنو تێبگەن، ئەوە کێشەی خۆیانـەو کـەمو کورتیـان لـە تێگەیـشتن لـە ئیـسلامو سروشـتە هەمەلایەنەکەیدا هەیە. گەر بە گشتی سەیری پەیامەکانی (بەننا)و (مەودودی)یش بکەین، دەبینین خۆ دەبوێرن لەوەی باسی ماهیەتی سیاسەت بکەن. بەتایبەتیش لە چوارچێوەی واقیعە نوێکاندا و ئەو جەبرانەی مۆدێرنەی سیاسی بۆ ئەم چەمکەو شێوەی پیادەکردنی دروستی کردووە.

بەڵکو ئەوەی کاریان لەسەر کردووە جگە لە مەسەلەی بەستنەوەی ئیسلام بە سیاسەتەوە، ئەویش بە شێوەیەکی گشتیو بە زمانێکی تێکەڵاوی ئاینیو مۆدێرنە، ئەم پرسانەی خوارەوە بوون:

(أ) **هۆشیاری سیاسی**: واتە هۆشیارکردنەوەی ئەندامانو کۆمەڵگە بەرامبەر سروشتی سیاسیانەی ئیسلامو پرسە سیاسییەکانو هێزو تەوژمو بانگەوازەکانی دیو، پیلانی دوژمنانی ئیسلامو ئەرکی ئەمان لە هەموو ئەم ڕووداوانە بەرامبەر نەتەوەکەیانو ئامادەبوون بۆ قوربانی دانو وازهێنـان لـە بێبـاکیو پـاڵ لێدانـەوەو خـۆ ئامـادەکردن بـۆ بەدیهێنانی ئامانجەکان.

(ب) **فیكری سیاسی**: ئەویش لە چەند مەسەلەیەكدا خۆی دەنوێنێ :

(١) ئامانجی سیاسی: واتە دیاریكردنی كۆمەڵی ئامانجی سیاسی كە پێویستە هەمیشە لەبەر چاوی تێكۆشەرانی ئیسلامخوازو هەڵگرانی بانگەوازو ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ بێتو، خۆیان بۆ بەدیهێنانی ئامادە بكەنو خەڵكی بۆ تاوبدەنو بیكەن بە ستراتیژی خۆیانو ئەندامانو رای گشتی لەسەری گۆشبكەنو لە بایەخی ئیسلامیو سیاسیان تێ بگەن لەوانەش:

(ـ) دووبارە گێڕانەوەی حوكمڕانی ئیسلامیو دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی.

(ـ) رزگاركردنی خاكی داگیركراوی ئیسلامی.

(ـ) گێڕانەوەی یەكیەتی خاكو نەتەوەی ئیسلامیو سەرەنجام خەلافەت، رزگاركردنی مرۆڤایەتی لە جەورو رەنجو تاریكیو شادكردنیان بە ژیان لە سایەی دادپەروەری و میهرەبانی ئیسلامدا.

(٢) دیاریكردنی قۆناغەكانی تێكۆشانی سیاسیو ئامرازەكانو دیاریكردنی پێویستی هەر قۆناغێك لە جۆری پەروەردەو گوتاری سیاسیو میكانیزمەكانی كاركردنو رووبەڕووبوونەوە.

(٣) دروشمی سیاسی، لە وێنەی (قورئان دەستورمانە، جیهاد رێبازمانە و، شەهید بوون لە پێناو خوادا ئەوپەڕی ئاواتمانە...).

(٤) سروشتی ئەو سیستمو دەوڵەتەی بەننا بەنیازە دایبمەزرێنێت جۆری تێگەیشتن بۆ سەرچاوەی رەوایەتی سیاسیو چۆنیەتی سپاردنی دەسەڵات بە حوكمڕانەكانو پێكهاتەی دەسەڵاتو پەیوەندی نێوان

دەسەڵاتەکانو ئازادییەکانو پێگەی تاكو وەرگرتن یان رەتکردنەوەی چەمکی هاوڵاتیو هەڵوێست بەرامبەر چەمكو رێبازە فیکرییە نوێکانو وڵاتانو کۆمەڵەی نێودەوڵەتیو مافی پێکهاتە ئاینییەکانو میکانیزمەکانی مومارەسەکردنی سیاسەتو پیادەکردنی دەسەڵات.

بە گشتیش هەموو ئەم بازنانە لە ئەدەبیاتی جوڵانەوەی ئایدۆلۆژی ئیسلامی نوێدا لە خزمەت پرۆژەی بە ئیسلامی کردنەوەی ژیانو گێڕانەوەی حوکمڕانی ئیسلامیو یەکیەتی جیهانی ئیسلامیو خەلافەتدایە. دەوڵەت وەك دەرکەوتووترین دامەزراوەی سیاسەت ئامێرێکە بۆ پیادەکردنی شەریعەتو ئەحکامەکانی ئیسلام.

سیاسەت لە سایەی دەوڵەتی وێناکراوی ئیسلامی جوڵانەوەی ئیسلامی نوێدا هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد، تا رادەیەکی زۆر تۆتالیتارو هەمەلایەنە خوازە. پارتە سیاسییەکان قەدەغە دەکرێنو دەبێت هەڵسوڕاوی سیاسی لە چوارچێوەی حوکمدا لە بیر ببرێتەوە. ئەوەی رێگای پێ دەدرێت تاکە یەك هێزو دەسەڵاتی سیاسییە، بە سروشتی حاڵ رێگا بە هیچ فیکرو تەوژمێکی نائیسلامیش نادرێت بانگەشە بۆ دیدگاو روانگەیەکی جیاوازی سیاسی بکات، کە لەگەڵ خوێندنەوی فەرمی و باڵادەست بۆ ئیسلامو دەوڵەتو پەیوەندی نێوانیانو مۆدێلی حوکمڕانی جیاواز بێت، سیاسەت لەم مۆدێلەدا پانتاییەکی بێلایەنو هاوبەش نییە جێگای هەموو بیرو بۆچوونەکانی تیادا ببێتەوە و تیایدا گفتوگۆ بکەن. بەڵکو یەك هێزو فیکرو تەوژم بۆی هەیە مومارەسەی بکاتو لە چوارچێوەیدا دەسەڵات پەیدا بکاتو ژیانی

گشتی ڕێکبخات لە قۆناغی تێکۆشانیشدا بۆ گەیشتنە دەسەڵاتو دەوڵەت، گەر فەرمانڕەواکان ئامادەبوون واز لە دیدگای فیکریو سیاسییەکانی خۆیان بهێنن‌و پرۆژەی ئیسلامی هەمەلایەنە لە پێگەی دەسەڵاتدا پیادە بکەن‌و دەستکارییەکی قوڵو رادیکاڵانەی شێوازی ژیانکردنی خۆیان بکەن، ئەوا لای (بەننا) بواری ئەوەی تێدایە سازشیان لەگەڵ بکرێت‌و رەوایەتیان پێ بدرێت‌و سپاردەی پیادەکردنی شەریعەتیان پێ بسپێردرێت[1]. بەڵام لای (مەودودی) ئەم ئەگەرەش زۆر بوونی نییە، بە حوکمی ئەوەی سروشتی دەوڵەتی ئیسلامی فیکرییەو لەسەر بناغەی فیکرو ئایدۆلۆژیایەکی دیاریکراو دادەمەزرێن، هەر بۆیە ئەوانەی بۆیان هەیە جڵەوی دەسەڵاتی تیادا بگرنەدەست، نەك هەر دەبێت دڵسۆزی فیکرەکە بن‌و پێی گۆشکرابن، بەڵکو دەبێت تاڵیو سوێری زۆریان لەو پێناوەدا نۆشیبێت‌و قاڵبووی رۆژگارانێکی سەخت بن‌و واقیعی حاڵو ژیان بۆ ئەو پۆستەی پاڵاوتبن‌و خەڵکی تەنها پیرۆزباییو دەستخۆشیو پشتیوانیان لەسەرە[2].

بەڵام ئەم چاوەڕوانییە بەو مەرجە قورسانەی بۆ دەسەڵاتداران‌و جۆری پێگەیشتن‌و تێگەیشتنیان دیاری کراوە، نیمچە ئەستەمە، هەر بۆیە هەوڵەکان لەم چوارچێوەدا دەچنە بازنەی (اقامة حجة)و پێ ڕاگەیاندن و لێپرسراوێتی لەکۆڵ خۆکردنەوەو خەڵکی کردن بە شایەت، دەنا هەروەك چۆن پەیامەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ (هێرقل و کیسرا)

---

[1] مجموعة رسائل،

[2] أبو الأعلى المودودي، نظرية الأسلام و هديه، ص٤٧ و ٦٥-١٢٦.

که تیایاندا هاتبوو: موسڵمان بە، بێوەی دەبیتو دەسەڵاتت بەسەر رەعیەتەکدا پارێزراو دەبێت)، بێ وەڵامی ئیجابی مانەوە، پەیامو چاوەڕوانییەکانی بەنناش لە دەسەڵاتدارانی ئەو کاتەی میسر هەر بەو جۆرە بوو. بۆیە سەرەنجام لە ڕێگەی ئیسلاحخوازی بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیو پێکهێنانی حکومەت ئیسلامیو ئەنجامدانی پرۆژە ریفۆرمخوازییەکەی نائومێد دەبێتو لەگەڵ هاوبیرەکانی دەگەنە ئەو قەناعەتەی کە حکومەتێ لە ئارادا نییە وەڵام بە خواستەکانیان بداتەوە[1]. گەر تا ئەو کاتەش دروشمیان پاڵپشتی کردنی ئیسلامو بانگەوازەکەیان بووبێت بە حوکمڕانەکانو وایان خستبێتە ڕوو کە ئەوان عەودالّی حوکمڕانی و دەسەڵات نینو ئامانجیان حوکمڕانی ئیسلامییە هەرکەسێك بەرپای بکات دەبنە سەربازو پشتیوانی، ئەوان دوێی ئەوە رایدەگەیەنن کە ئەگەر ئەوە نەبوو ئەوا گەیشتنە دەسەڵات بەشێکی سەرەکی بەرنامەی برایانەو بۆی هەوڵ دەدەنو تێدەکۆشن لەوەی دەسەڵات لە چنگی هەر حکومەتێك دەر بێنن کە فەرمانەکانی خودا جێبەجێ ناکات، بەڵام (برایان) لەوە عاقڵترن پێش ئەوەی ڕێبازی برایان بڵاوبێتەوەو باڵادەست بێت وە گەل فێر بێت چۆن بەرژەوەندی گشتی دەخاتە پێش بەرژەوەندی تایبەتییەوە، هەنگاوێکی لەو جۆرە بنێن[2]. لەدوای ئەوەشەوە مەسەلەی دیاریکردنی میکانیزمو ئامرازەکانی گەیشتن بەو ئامانجە بایەخی خۆی پەیدا دەکات. هەموو فیکرو

---

[1] مجموعة رسائل، ب. دووەم، ص٥٦.

[2] مجموعة رسائل، ب. دووەم،ص٥٥

پرۆژەیەکی سیاسیش تێگەیشتنی خۆی بۆ ئامرازەکانی گەیشتن بە ئامانجەکان دەخاتە ڕوو. چونکە سروشتی ئامرازەکان بەشێکی جیانەکراوەی سروشتی ئامانجەکانەو یەکتری تەواو دەکەن. هەر بۆ نموونە ناکرێت ئامرازی فیکرێکی رادیکاڵو شۆڕشگێڕ، هەمان ئامرازی رێبازێکی ریفۆرمخواز بێت، ناکرێت مارکسیزمی کلاسیکو شۆڕشگێڕ، تێگەیشتنی بۆ ئامرازەکانی گۆڕانکاری هەمان تێگەیشتنی سۆشیاڵ دیموکراتەکان بێت، کە لە چوارچێوەی مەرجەعیەتی دیموکراسی هەوڵ بۆ بەدیهێنانی ئامانجە سۆشیالیستیەکانیانو دادپەروەری کۆمەڵایەتی دەدەن. کە سەیری (ئامرازەکان)ی گەیشتن بە دەوڵەتی (ئیسلامی)یش لای (بەننا)و دوای ئەویش (مەودودی) بکەین، دەبینین، فرەچەشن، ئامرازو میکانیزمەکان بە گوێرەی قۆناغە دەستنیشانکراوەکان گۆڕانیان بە سەردا دێت، بۆ نموونە ئامرازەکان قۆناغی ناساندنی بانگەواز (تعریف) لای (برایان) هەمان ئامرازی قۆناغی راپەڕاندن نین. پێشم وایە برایان لە ڕووی دیاریکردنی ئامانجو جۆری تێگەیشتن لە ئیسلامو ماهیەتی ئایدۆلۆژیاو دەستنیشانکردنی ئامانجەکانەوە، ناچنە چوارچێوەی هێزە ئیسلاحخوازەکانەوە. تەنها لەو ڕووەوە نەبێت، کە ئامانجەکانیان بەسەر چەند قۆناغێکدا دابەشکردووە و بڕوایان بە پلە بەپلەی گەیشتن بە ئامانجەکانیان هەیە، بەلام ئیسلاحی بوون تەنها پلەبەندی ئامانجەکان نییە، بەڵکو تەنها دەرکەوتەکەیەتی.

بە بڕوای ئێمە (برایان) بە گشتی نە (رادیکاڵن) نە (ریفۆرمخواز) و هێڵی سێهەم لەم نێوەندەدا پێکدەهێنن، واتە شێوازی ئیش کردنو

میکانیزمـــەکانی سیاســـەتکردنیان، تێکەڵەیەکـــە لـــە ریفۆرمخـــوازیو (شۆڕشگێڕی)، یاخود (رادیکاڵ بوون) بۆ نموونە خـودی (بـەننا) لەمـەڕ وەســـیلەکانی برایـــان بـــۆ بـــەدیهێنانی ئامانجـــەکانیان ئامـــاژە بـــە بڵاوبوونەوەی رێبازەکەیان و بانگەواز و خەباتی دەستوری و پەرلەمانی دەکـات[1]. دواتـر ئامـاژە بـەوە دەکـات کـە ئەگـەر شـێوازە مـەدەنیو دەسـتوریەکان نـەیانتوانی (برایـان) بگەیەننـە دەسـەڵات ئـەوا وەك دوا چارە بـژاردەی بـەکارهێنانی هێزیـان لەبـەر دەسـتایە دوای وەدیهـاتنی پێش مـەرجو ئامادەکارییـە پێویـستییەکان[2]. خـودی (بـەننا) پلەیـەکی ئەندامێتنی بە ناوی (مجاهد) ناوناو شمشێرو قورئـانێکی کـردە رەمـزی (برایان) کە لە ژێریەوە نوسراوە (واعدّوا لهم ماسـتطعتم)، بـەڵام لەگـەڵ رەتنەکردنەوەی بەکارهێنانی (هێز) وەك بژاردەیەکی بەردەوام، (برایان) وەك دوا شێوازی ناچار، بە تونـدی دژی (شـۆڕش) دەوەسـتێتەوە وەك فۆرمێکی هاوچەرخ و جەماوەری بۆ بەکارهێنانی هێز رەتیدەکاتەوە.

بـەننا دەڵێـت: ((برایـان هـەرکاتێ زانیـان هۆکارەکـانی تـر سـوودی نــەماوە، هێـزی کـرداری بـەکاردەهێنێ، بـەڵام هەرچـی پەیوەنـدی بـە شۆڕشــەوە هەیــە، برایــان بـیری لێ ناکەنــەوە و پــشتی پــێ نابەســتنو بڕوایان بە کەڵكو سـوودی نییـە[3]. دیـارە شـێوازێکی تـری بـەکارهێنانی هێزیشیان نەخستۆتە ڕوو کە لە ڕێیەوە و لـە چوارچـێوەیدا هێـز بـەکار

[1] مجموعة رسائل، ب. دووەم، ص٣٥-٣٦.

[2] مجموعة رسائل، ب. دووەم، ص٥٠-٥١.

[3] مجموعة رسائل، ب. دووەم، ص٥٢-٥٣.

بێنن، گەرچی بە کردەوە ئـەزموونی (رژێمـی تایبـەت) یـان هەیـە، وەك باڵێکی تایبەت بە پەروەردەی سەربازیو بەکارهێنانی هێز.

ئەم تێکەڵیو پێکەڵیو ناڕۆشنییەش لە دیدی برایانـدا سـەبارەت بـە پێناسـەکردنی خۆیـانو ئـەو ڕۆڵـەی پێویـستە بیبیـنن‌و ناسـنامەی سیاسیانو میکانیزمو ڕێکارەکانی گەیشتن بـە ئامانجـەکان، بـە بـڕوای ئێمە کردنی بە یەکێ لە هێزە بێ ڕوانگەو دیدگاکانی سـەدەی بیـستەم، بە جۆرێ زۆر کـەم نـەبێت، نـەیانتوانیوە ئـەوەی پێویـستە بیکـەن. وە عەقڵیەتی قۆستنەوەی دەرفەتیان زۆر کـەم تیـابووە و بـە شـێوەیەکی گشتی لە شرۆڤەو بڕیارداندا هێزێکی ڕاڕاو ناڕۆشنو تەمومژاوی بوون.

ڕەنگـە ڕەتکردنـەوەی (شـۆڕش) لای بـەننا زیـاد لـە هۆکـارێکی لـە پشتەوە بووبێت، لەوانەش:

١. بەگوێرەی پێویست تازەنەبوونەوەی فیکـریو تێکـەڵکردنی بـە (فتنـــة)، بـــەو جـــۆرەی ئـــەزموونی مێـــژووی سیاســـی موســـڵمانان خستوویەتییە ڕوو.

٢. ترسـان لـەوەی پـێش بـەهێزبوونی پایـەکانی بانگەوازەکـەیو پێگەیشتنی هـەلو مەرجـەکان، کۆمەڵەکـەی بکەوێتـە نـاو شـەپۆلێکی شۆڕشگێڕانەی ئەوسەر لێ دیار نەبوو ناسنامەی خۆی ون بکات.

٣. ترســـان لـــە شکـــستی شـــۆڕشو ئـــەو بەرەنجامانـــەی لای دەکەوێتـــەوەو ئـــەو مەترســـیانەی ڕووبـــەڕووی بـــوونی برایـــان و بانگەوازەکەی دەبێتەوە. هەربۆیە یـەکێ لـە پاسـاوەکانی بـۆ بێـسوود بوونی شۆڕش ئـەزموونی شۆڕشـەکانی میـسر. هۆشـیاریش دەدات گـەر

بارودۆخی خراپو داڕووخاو خەڵکی ناچار بە پەنابردنە بەر شۆڕش کـرد ئەوە دەستی برایانی تێدا نییە.

٤. بەننا خاوەنی دیدو پرۆژەیەکی تایبەت بە خـۆی بـووە، کـە بـە حوکمی سروشتە ئایدۆلۆژییە هەمەلایەنییەکـەی قـابیلی ئـەوە نـەبووە، لەگەڵ بانگـەوازو ئایـدیاکانی تـر تێکـەڵ ببێـت، لەبـەر ئـەوە سروشـتی شۆڕش بەشداربوونی ئالاّو رێبازو پاکیزەیی ئایدۆلۆژیو فیکری (بەننا)و برایاندا نەگونجاوە.

د. یوسف قەرزاوی دەڵێت: ((گوێم لە پێشەوای شەهید (حسن بەننا) بوو لە یەکێ لە خوتبەکانیدا دەیـووت: هـەوڵو تێکۆشـانمان لـە دەوری دوو تەوەرە چـڕ دەبێتـەوە، رێبـازو بیرێکـی ئیـسلامی، سـەرزەمینێکی ئیسلامی، بە یەکـەوە گرێـدانی ئـەم دووانـەش ئامـاژە بـوو بـەوەی کـە فیکـرەو بیروباوەڕێـك لـە زەوییـەکی ئـازادو سـەربەخۆدا نـەبێت، کـە بەهاکانی باڵی بەسەردا کێشابێتو شەریعەتەکەی حوکمڕانی تێدا بکات، سەقامگیرو دامەزراوو بالاّدەست نابێت))[1].

لەڕاستیشدا مەسەلەکە سەبارەت بە ڕێبازو فیکری برایان بەو جۆرەیەو بە سروشتی خۆی (هاوبەش) قبوڵ ناکاتو چاوی لەوەیە کۆی دۆخەکە لـە ژێر دەستی خۆیدا بێـتو سـەراپای ژیـان وەك ئـەوەی دەیـەوێت بـێ هـیچ دەسـتێوەردانێك رەنـگ بکـات. چـونکە سیاسـەت لای برایـان بەشـێکی جیانەکراوەی خودی ئیسلامە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت ئەو فیکرو پرۆژە سیاسییەی لەم چوارچێوەدا گەلاّلە دەکرێـتو دەخـەملێنرێت، جۆرێـك لـە

[1] د. يوسف القرضاوي، أولويات الحركة الأسلامية في المرحلة القادمة، ل١٣٠.

پیرۆزیو پاکیزەیی و سامی هەیە، چونکە سەرچاوەکەی پیرۆزە، ئەم پیرۆزییەش هەندێ شتی تر دەخوازێت، لەوانەش:

(١) میکانیزمەکان تا دەکرێت دەبێت رەسەنو ئیسلامیو پاکو بێگەرد بن.

(٢) هەڵگرانی دەبێت پەروەردەکراو بن بە ئیسلامو خودان کەسێتی و ئەخلاقێکی نمونەیی بنو لە ئاست گەورەییو پیرۆزی پەیامەکەدا بن.

(٣) لە رێکخراوو رەوتێکی سەربەخۆدا بەرجەستە ببێت، بۆ ئەوەی بێگەردییەکەی بپارێزێتو تێکەڵ بە بیروباوەڕو بانگەوازی تر نەبێت، بیرۆکەی هەمەلایەنە بوونی ئیسلامیش ئەم رۆڵە دەبینێت.

هەڵبەت ئەگەر لای (بەننا) پەراوێزێ بۆ کاری سیاسیو مانەوە لەناو کۆمەڵگە و هەوڵدان بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی بوونی هەبووبێت، ئەوا لای (سید) دەگەینە قۆناغی مەرگی سیاسەت، چونکە ئەگەر مەیدانی پیادەکردنەوە دەرکەوتنی سیاسەتو درەوشانەوەیو دەرکەوتەکانی فەزای گشتی کۆمەڵگە بێت، وە سیاسەت لە بنەڕەتەوە پەیوەست بێت بە سروشتی مەدەنی مرۆڤ، ئەم سروشتەش خوازیاری بوونی کۆمەڵ بێت، هیچ کۆمەڵێکیش بێ دیاردەی سیاسی، واتە دابەشبوونی کۆمەڵو خەڵك بۆ دوو دەستە: فەرمانڕەواو فەرمان لەسەر کراو بوونی نەبێت، ئەوا (سید قطب) دەستپێکردنی میحنەی خۆی و برایان لە سایەی دەسەڵاتی سەرکوتکەری (ناصر)دا دەستپێدەکات، رەوایەتی لە کۆمەڵگەو کۆی دامو دەزگاکانی دەکێشێتەوە. کۆمەڵگە لە سایەی دابەشکردنی ئایدۆلۆژیانەی توندی ژیانو جیهان و کۆمەڵ و دنیا، بۆ

دوو بــەرەی لــە ئاشــتی نــەهاتووی (ئیــسلام) و (نــەفامی)، دەبێتــە پانتاییــەك بــۆ دەركەوتــە قێــزەونو ناشــیرینەكانی نــەفامیو زەلكــاوی داڕوخاویو ستەمو نامرۆڤایەتی.

ئیتر باسێ لە داننان بە (جیاوازی) و (گفتوگۆ)و (بـە یەكـەوە ژیـانی ئاشتیانە) و (رەخنەی سیاسی) نامێنێ، چونكە ناكرێت خوداو شەیتان، گفتوگۆ بكەنو بگەنە چارەسەری مام ناوەندیو رێكەوتن، لە جیهانبینی (سید قطب)دا سیاسەتو كۆی ژیـان لـە خمـی عەقیـدە هەڵدەكێـشرێ. باسـكردن لـە (عەقیـدە)ش باسـكردنە لـە رەهـایی و پـیرۆزیو سـازش نەكردن. عەقیدە بابـەتێك نییـە بـۆ گفتوگـۆ و رێكـەوتن هـەروەها وەك خۆی دەڵێت: لە نیـوەی رێگـادا بـە یـەك گەیـشتن، سـیفاتگەلێ كـە لـە دنیای نوێدا لە سیاسەت جیانابنەوە.

عەقیدە دەخرێتە روو بۆ باوەڕ پێهێنان. نـەك گفتوگـۆ لەسـەركردن یان بە تەواوی وەردەگیرێت یاخود بە تەواوی رەت دەكرێتەوە. چـونكە عەقیدە قابیلی بەش كـردن نییـە، پرسـی سـەرەكی لای (سـید) پرسـی (حاكمیـەتی خودایـە) دەبێـت خـەڵكیش بـۆ ئـەوە بـانگ بكـرێن، لـەم دۆخەشدا سیاسەت ئەگەر لـەم چوارچێوەشـدا هـەبێت، لـە بـەرگی ئـەو سیستمەی لەسەر بناغەی ئەم عەقیدە دادەمەزرێت، پرسێكی دواخراوە بـۆ دواڕۆژێكـی نادیـار. چـونكە ئەگـەر سیاسـەت باسـی لـە دەوڵـەتو سیستمی حوكمڕانی و یاسادانانو رێكخستنی كۆمەڵگـەو (رێكـەوتن) و پێكهێنــانی دامو دەزگاكــانی بێــت، بــۆ ئــەوەی كۆمــەڵ، لــە رووی سیاسییەوە خۆی رێكبخاتو بەڕێوە بچێت، ئەوا (سید) وروژاندنی هەر

شتی لەم رووەوە بە کارێکی هەڵەو ناپێویستو نا ئیسلامی لە قەڵەم دەدات. کە نابێت تێکۆشەرانی بۆ خودا لێبڕاوی ئیسلامخوازو هەڵگرانی بانگەوازی مەلەکوتی حاکمیەتی خودایی نەك هەر ملی پێ بدەن، بەڵکو بیریشی لێ بکەنەوە. دەبێت پێش هەموو شتێك کۆمەڵگەیەکی موسڵمان لە کەسانی پەروەردەکراو بە عەقیدەی یەکتاپەرستی دروست بکرێت، ئینجا باس لە سیستمی سیاسی بێتە پێشەوە[1]، ئەگەر مانایەك لەم نێوەندەشدا بۆ سیاسەت لای (سید) بمێنێتەوە ئەویش نەك وەك چالاکییەکی مەدەنی بەڵکو وەك چەمکێ ئاماژەیە بۆ پەیوەندی هێز، لە دوو شتدا دەردەکەوێت:

أ- پێگەیاندنی تێکۆشەرانی عەقیدی نێو جوڵانەوەی ئیسلامی لەسەر بیروباوەڕی هەمەلایەنەی ئیسلامیو پێویستی روخاندنی کۆمەڵگەی نەفامیو رابەستنی تەلاری حوکمڕانی خوایی لە جێگای ئەودا.

٢- کێشانەوەی رەوایەتی لە کۆمەڵگە.

٣- ئەو پێکدادانە حەتمییەی لە نێوان جوڵانەوەی ئیسلامیو دەسەڵاتی نەفامیدا دروست دەبێت. کە مێژوو سەلماندی زۆر کەم دەسەڵاتداری ئەوەندە غەشیم هەیە رێگا بدات (موسی)ی سەرەخۆرەی لە ناو کۆشکەکەی و لە بندەستی خۆیدا گەورە بێتو دوایی ببێت بە سەرەخۆرەیو لەناوبردنی، هەر بۆیە مێژووی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم تاکو ئێستاش بەڕوونی ئەوەیان خستە روو، کە ئەو پێکدادانەی

[1] سید قطب، معالم في الطريق، ص٣٨-٤١.

دوا ناکەوێت بۆ ساتەوەختی پێگەیشتنی هەلو مەرجەکانی کەوتنی دەسەڵاتی نەفامی، بەڵکو زوو هێزەکانی ئاسایشو دەزگاکانی تر سەرکوتی دەکەن. هەموو بەرگریو بەکارهێنانی هێزێکیش لەو نێوەندەدا، (کە بەکاردەهێنرێت لە سایەی وەهمی پارێزگاری لە بانگەوان) سەردەکێشێ بۆ توندوتیژیو تیرۆری چەند گروپێکی پەرشو بڵاوی ژێر زەمینی ئەملا ولا.

فیکری (سید)یش هەروەك (طارق بشري) دەڵێت: (فیکری پێکدادانە) هەر ئەوەش جیای دەکاتەوە لە فیکری مامۆستاکەی (بەننا) کە فیکری بڵاوبوونەوە بوو، پێکدادانەکەی دواخستبوو بۆ قۆناغێکی تر[1]. (مەودودی) کە (سید) بەڕوونی لە ژێر کاریگەری فیکرو بیروڕاکانیدا بووە، ئەویش بە هەمان شێوە لە سایەی بیرۆکەی هەمەلایەنە بوونی حاکمیەتی خودای دا، فیکرەکە لە سەر خۆ کەنارگرتنو دورەپەرێزیو دروستنەکردنی پردی پەیوەندی لەگەڵ بەرامبەری فیکری داڕێژراوە[2]. مەسەلەیەکی گرنگیش کە پێویستە لێرەدا لەبەر چاوی بگرین، نەك هەر ڕێژەیی بوونی سیاسەتە، بەڵکو ڕێژەیی بوونی فیکری ئیسلامی نوێ، بە حوکمی مرۆڤبوونیو بەرهەمی تێگەیشتنی کۆمەڵێ بیرمەندو زاناو رابەری سیاسی بۆ جەدەلیەتی نێوان دەق و واقیع، لە شوێنو زەمینێکی دیاریکراودا، ڕێژەییە. بەشێ لەو خەسڵەتانەی فیکرەکەشی

[1] المستشار طارق البشري، الملامح العامة للفكر السياسي الأسلامي في التأريخ المعاصر، دار الشروق، ص٣٣.

[2] سەرچاوەی پێشوو، ص٢٧.

پــێ ناســراوەتەوە، دیــسانەوە مێــژوویی و کــاتین. چــونکە ((زەرفــی مێژوویی و جۆری ئەو تەحەدیانەی دێنە بەردەم موسڵمانانو بانگــەوازو کۆمەڵی ئیسلامیو خودی ئیسلام، شێوازی رووبەڕووبوونــەوەو بــەرگری لە ئیسلام وەك قەوارەیەکی زیندوو دیاری دەکەن، هەر ئەویش شــێوازو ئامرازو میکانیزمەکان دیاری دەکات))[1]. هەر ئەمەیە کــار دەکاتــە ســەر ئەوەی نەورەسی و پەیامەکانی و کۆمەڵەی نوور لە (تورکیا) و (برایان) لــە (میــسر) و (کۆمەڵــەی ئیــسلامی) مــەودودی لــە نیمــچە کیــشوەری هیندســتان، بــەو جــۆرە دەربکــەون. هــیچ یــەك لەوانــە لــە بــارودۆخی رژێمەکەیانو قۆناغە مێژووییەکە دابڕاو نین. هەر بۆیە ((فیکری سیاسی ئیسلامی نوێ بەرهەمی وەڵامدانەوەیەکی مێژووییە بۆ سەدەی نوێ، وە بۆ ئەم قۆناغە لە مێژووی کۆمەڵ و و جوڵانــەوەی ئیــسلامی. بەشــێ لــە جیاوازی نێــوان کــۆڕ و کۆمــەڵ و قوتابخانــە ئیــسلامییەکانی ســەردەم، هێنــــدەی رەنگدانــــەوەی جیــــاوازی واقیعــــی مێــــژوییو سروشــــتی تەحەداکانە، ناکۆکی فیکری نییە))[2].

بۆیە دەبێــت مەســەلەی پەیوەنــدی نێــوان (بانگــەواز) و (سیاســەت) لەچوارچێوەی فیکری ئیسلامی و حەرەکی نوێدا، هەر لەم چوارچێوەدا تێبگەینو تێکەڵ بە نەگۆڕەکانو خودی ئیسلامی نەکەین، چــونکە ئــەم تێکەڵ کردنە بەم جۆرە لە (حەسەن بەننا)وە دەست پێدەکات. چونکە هــــەروەك (بــــشری) ئامــــاژەی پێــــدەکات، ئەگــــەر فیکــــری ئیــــسلامی

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ص٣٠.

[2] طارق البشري، سەرچاوەی پێشوو، ص٦٠.

بەرهەڵستکار لە مێژووی نوێ دا لەسەر دەستی (جەماڵەدینی ئەفغانی)خەملێبێت، کە بانگەشەی رابوونی جیهانی ئیسلامو موسڵمانانی دەکرد بۆ رێکخستنی ریزەکانیانو رووبەڕوو وەستانەوەی شاڵاوی داگیرکاری خۆرئاوا، ئەوا بیری ئیسلامی ریفۆرمخواز لەسەر دەستی (شیخ محمد عەبدە)دا پەرەی پێدرا، (محمد رشید رەزا)ش سەلەفییەت و ریفۆرمخوازی بە یەکەوە بەستەوە، (محمد إقبال)یش تێگەیشتنێکی فەلسەفی بۆ ئیسلام خستە روو[1]. (حسن بەننا)ش بووە هەڵگری بیرۆکەی سەراپاگیری (شمولیەت)ی ئیسلام هەر ئەویش بۆ یەکەمجار بیری لە دروستکردنی رێکخراوێك کردەوە بە مەبەستی کۆکردنەوەی خەڵکی ئیسلامخوازو رێکخستنیانو پەروەردەکردنیان و نەخشەدانان بۆ هێنانەدی ئامانجە ئیسلامییەکانی بە شێوەیەکی رێکخراوو نوێو سەردەمیانەو بەیەکەوە گرێدانی (ئاین)و سیاسەت لە چوارچێوەیدا [2].

سەرهەڵدانی تێگەیشتنی هەمەلایەنە بوون (شمولیەت)ی ئیسلامو دروستکردنی رێکخراویش لەلایەن ئەم رێبەرە ئیسلامییەوە، لە هەلو مەرجە مێژووییەکەی جیهانی ئیسلامو واقیعی وڵاتەکەی واتە (میسر) دابڕاو نییە. بەڵکو وەڵامدانەوەیە بە خواستە مێژووییەکانی قۆناغەکەی خۆی، بێ ئەوەی باس لەوە بکەین، وەڵامدانەوەکە تا چەند راست بووە یاخود نا. ئەو هۆکارانەی کاریگەری راستەوخۆشیان لەسەر فیکری

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص١٩.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٢٤-٢٦.

بـەنناو دارِشـتنی بانگەوازەکـەی‌و سـتراتیژی رێکخراوەکـەی هــەبووە، جۆراوجۆرن، لەوانەش:

(أ) روخانی سەڵتەنەت یاخود خەلافـەتی عوسمـانی، کـە شـڵەژان‌و کاردانەوەی جۆراوجـۆری بـەدوای خۆیـدا هێنـا، چـونکە موسـڵمانان لـە مێـژووی خۆیانـدا بـۆ یەکـەم جـار بـوو، رووبـەڕووی واقیعـی تیاچـوونی قەوارەی نێودەوڵەتی ئیسلام ببنەوە، دامەزراندنی (برایان)یش بە یەکێ لەو کاردانەوانە دەژمێردرێن، ئەو رووداوە بە تەواوی سێبەری بـە سـەر دەستنیشانکردنی ئامانج‌و ستراتیژەکانی برایاندا کردووە.

(ب) شـالاوی ئیـستعمارو داگیرکردنــی زۆربـەی ولاتــانی ئیـسلامی‌و دابەشکردنی خاکی ئیسلامی‌و دروستکردنی کۆمەڵی قـەوارەو دەوڵـەت، لەسـەر بناغـەی ناسـنامەیەکی جیـاواز، لـەوەی موسـڵمانان لـە سـەری راهاتبوون.

بشیری لەم رووەوە دەڵێت: ((پەروەردەی فیکـری‌و ویـژدانی برایـان تێکەڵەیەك بوو لەو زانستە ئیـسلامییەی لـە ئەزهـەر دەخوێنـدرا لەگـەڵ فیکری سۆفیگەری‌و کاریگەر بوون بە فەرهەنگی جولانەوەی نیـشتمانی دژ بە ئیستیعمار))[1].

(ج) شالاوی خۆرئاواگـەری بـۆ سـەر ژیـانی فەرهـەنگی‌و ئـەخلاقی‌و کۆمەلایەتی‌و بلاوبوونـەوەی شـێوە ژیـانی خۆرئـاوایی لـە وێنـەی بـاڕوو سەماخانەو مەیخانەکان‌و سفوری‌و هونەری نوێ بـە شـێوەیەکی خێـرا،

---

[1] طارق البشري، سەرچاوەی پێشوو، ص٢٥.

وه شوێنکەوتنی کوێرانەی موسڵمانان بۆ خۆرئاوا بەسەر مەشقدانانی. ئەم دۆخەش بە تەواوی و لە زیاد لە ئاستێکدا رەنگی بەسەر خەملێنی فیکرو بانگەوازی برایاندا داوەتەوە[1].

بەننا لەم رووەوە دەنوسێت: ((ئەوروپییەکان بە هەڵپەوە کاریان لەسەر ئەوە کردووە، کە شەپۆلی ئەم ژیانە مادیگەرایییە (مەبەستی ژیاری خۆرئاوایە) بە رواڵەتە گەندەڵەکانی و خۆرە کوشندەکانییەوە بەسەر سەرجەم ئەو وڵاتە ئیسلامیانەدا بکشێت، کە دەستیان گەیشتوێتێ و مەخابن کەوتوونەتە ژێر رکێفیان))[2].

(د) بڵاوبوونەوەی بیرۆکەی عەلمانیەت و لێکجیاکردنەوەی (ئاین) و (دەوڵەت) بە جۆرێك کە خودی بەننا دەڵێت: بە دەگمەن یەکێك دەست دەکەوێت وێنای بەیەکەوە بوونو لە یەکدانەبڕاوی (ئاین) و (دەوڵەت) بکات[3].

عەلمانیەتیش تارادەیەکی زۆر ئایدۆلۆژیو هەمەلایەنە بوو، دەیویست بە تەواوی ئیسلام لە ئاستە جیاوازەکانی ژیانو فەزای گشتی بکاتە دەرەوەو لە جوغزێکی رۆحیو سروتگەرایانەی یەکجار سنورداردا قەتیسی بدات، کە لەلایەن (بەننا) و کۆمەڵەکەیەوە کاردانەوەی توندی لێ کەوتەوە. بە جۆرێك کە ئەگەر تا دوێنێ مەسەلەی حوکمو فەرمانڕەوایی لای زانایان، لە ڕیزی (فروع)دا خرابێتە روو، لای بەننا کرا

---

[1] د. رضوان. السيد سەرچاوەی پێشوو، لا٣٥-٣٦ و مجموعة رسائل، ب یەکەم، لا٩٦.

[2] د. توفيق يوسف الواعي، سەرچاوەی پێشوو، لا٢٠.

[3] مجموعة رسائل، ب. دووەم، لا٢٣٢-٢٣٦.

به بنەما (أصول) و مەسەلەیەکی عەقیدی[1] و بەسترایەوە بە ناسنامەی موسڵمانێتی تاكو کۆمەڵی موسڵمانەوە. مەسەلەی پەیوەندی نێوان (ئاین) و (دەوڵەت)یش لە مەسەلەیەکی فیکریو مێژووییەوە کرا بە مەسەلەیەکی (دینی) پیرۆز. هەموو ئەمەش لە چوارچێوەی ئایدۆلۆژیایەکی نوێی ئیسلامی جێگای کرایەوەو رێکخرا، واتە ئەگەر کێشەی عەلمانیەتە رۆژهەلاتییەکە بە پیرۆزکردنی عەلمانیەت بووبێت، ئەوە فیکرە ئیسلامییە نوێکەش کەوتە دوای بە عەلمانی کردنی (مقدس).

دوای ئەم خستنە رووە پوختەش هەوڵدەدەین چەمکی سیاسەتو دەرکەوتەو کێشەکانی لە ئەدەبیاتی رەوتی ئیسلامی نوێدا لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا پوخت بکەینەوە:

١. ناوەرۆکی چەمکەکە لە رووی ئامازەو نێوەرۆکەوە، تێکەڵەیەکە لە مێژوو نوێگەریو بە گوێرەی پێویست نوێ نەبۆتەوە.

٢. سیاسەتکردن بە پلەی یەکەم لە پیادەکردنی دەسەڵاتو حکومەتدا کورتکراوەتەوە، کە ئەوەش رەنگدانەوەی کاریگەربوونیەتی بە نموونە مێژووییە ئیسلامییەکەو هەندێ لە نموونە هەمەلایەنە هاوچەرخەکانی سەردەم.

٣. بەپشتبەستن بە خاڵی دووەم لەم فیکرەدا زۆر کەم نەبێت شتێ بە ناوی فەزای گشتییەوە بوونی نییە بۆ گفتوگۆو رێکەوتنو گەیشتن بە

[1] مجموعة رسائل، لا ٥٤

چارەسەری مام ناوەندی و ئامادەبوونی هەمووان، بۆ ئـەوەش زیـاد لـە هۆکارێك هەبووە:

(أ) سروشـتی مێـژوویی قۆناغـە مێژووییەکـەی ناوچـەکەو بەشـێکی بەرچاو لەجیهان.

(ب) هەمەلایەنە بوونی ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نویێ.

(ج) رەتکردنەوەی ژیانی حیزبیو فرەیی سیاسی.

(د) روانینە قۆناغەکە وەك قۆنـاغی نەتـەوە سـازی کـە خوازیـاری یەکڕیزیو یەك رەنگیو یەك دەنگیو ناوەندێتیو بڕیاری بوێرانەیە.

٤. ئایدۆلۆژیای سیاسی ئیسلامییە نوێکـە جگـە لـەوە لەگـەڵ فـرە حیزبی نییە کە بە دیوی دووەمدا رەتکردنەوەی دیموکراسی هاوچەرخە، جگە لە هەندێ رواڵەتی لە چوارچێوەیەکی دابـڕاو لـە بـەهاکانی خۆیـدا کێـشەی لەگـەڵ نیـشتمانو نەتـەوە پـەروەریو دەوڵـەتی مـەدەنی و چەمکی هاولاتێتی یەکسان و بەشێ لە مافەکانی ئافرەتانیشدا هەبووە[1]، تێگەیشتنی ئامێریانەشـی بـۆ دەوڵـەتو دەسـەلات هەیـە. چـونکە وەك هۆکارو چوارچێوەو میکانیزمێکی دامەزراویی دەبینـێ بـۆ پیـادەکردنی شـەریعەتو سـەپاندنی شـێوە مـۆرکی ئیـسلام و ژیـانکردنو دووبـارە دارشـتنەوەی تـاكو کـۆی بوارەکـان لـە روانگـەی بـەهاو پێـوەرە ئایدۆلۆژییەکانەوە.

---

[1] لـەم رووەوە بگـەڕێرەوە بـۆ: ئـەبو ئـەعلای مـەودودی، نظریـة الأسـلام و هدیـە.لا ٣٣-٤٠، ٢٦٠، ٢٥٩، ٢٩٤، ٣٠٠-٣٠٤

٥. لەڕووی ئامرازەوە سیاسەتکردن زیاد لە شێوازو ئامرازێکی لەبەر دەستدایە. بەوەش ناتوانرێ بە (ریفۆرمخوان) یاخود (رادیکاڵ) پێناسە بکرێت. چونکە تێکەڵەیەکە لە هەردوکیانو ئەوەی تێی تەرازووی لایەکیشیان قورس دەکات، بارودۆخە تایبەتییەکانو بڕینی قۆناغەکان و سروشتی بەربەستو تەحەدداکانو جۆری وەڵامدانەوەی بەرامبەرەکانە بۆ خواستی بە ئیسلامی کردنی کۆی ژیانو دەسەڵاتو کۆمەڵگە.

٦. چەمکی سیاسەت لە چوارچێوەی ئایدۆلۆژیاکەدا بارگاوی کراوە بە کۆمەڵێ چەمكو ئاماژەی (فقهی) و زاراوەی مێژوویی‌و هەناسەو رۆحانیەتی سۆفی‌و هەندێ لە رەگەزو خواستەکانی فیکری سیاسی نوێ. ئەمەش وای کردووە، نەتوانێ تێگەیشتن‌و ئامرازەکانی کارکردنی بە گوێرەی پێویست پێشخاتو نوێ بکاتەوە.

٧. تێکەڵاوی مەسەلە دەعەوی و دینییە رووتەکان بە پێویستیەکانو جەبری سیاسەت لە چوارچێوەی ئایدۆلۆژیایەکی هەمەلایەنەی نوێدا، بۆتە هۆی ئەوەی دۆخی دەروون رێکخراوەیی بە شێوەیەکی گشتی ناسەقامگیر بێت، پێچڕانی چەمکی سیاسەتیش بە پرسی دامەزراوەیی بوونەوە، بەو جۆرەی فیکری سیاسی نوێ ناسیوویەتی، وای کردووە، نەمانی ڕەمزو رێبەرەکان، بۆ نموونە بەنناى (دامەزرێنەر) شلەژاوی گەورە بەدوای خۆیدا بێنێ و مەسەلەی بڕیار وەرگرتنی سیاسی لە (برایان)دا وەك پێشەنگو ئاڵاهەڵگری ئایدۆلۆژیای

ئیـــسلامی نـــوێ قـــورس بکـــات. ڕێـــش بگرێـــت لـــه نوێبوونـــه‌وه‌ی سه‌رکردایه‌تی‌و متوربه‌کردنی به‌ عه‌قڵ‌و نه‌وه‌ی نوێ.

٨. گه‌رچی بانگه‌وازو ئایدۆلۆژیای ئیـسلامی نـوێ بـه‌ پلـه‌ی یه‌کـه‌م ئایدۆلۆژیایه‌کی سیاسـی‌و به‌رهـه‌می تـه‌ئویلکردنێکی سیاسـیانه‌ی نـوێی ده‌قه‌ ئیسلامییه‌کانه‌ و ئامانجـه‌ سه‌ره‌کییه‌کانیـشی دیـسانه‌وه‌ سیاسـی بـوون، که‌چـی له‌هه‌مانکاتـدا بـه‌ هـۆی دینـی بـوون و هه‌مه‌لایه‌نـه‌بوونی ئایدۆلۆژیاکه‌و ده‌ستپێکردنی له‌ به‌رگی بانگه‌وازێکی دینـی دا، هه‌میـشه‌ رووه‌ سیاسییه‌که‌ی ئایدۆلۆژیاکه‌، به‌ده‌ست جۆرێ له‌ نه‌بوونی ره‌وایه‌تی پێویـستەوه‌ نالاندوویـه‌تی. ئه‌مـه‌ش لـه‌ژێر پاشمـاوه‌و کاریگـه‌ری بـه‌ نـه‌فره‌تکردنی سیاسـه‌ت لـه‌ ویـژدانی مرۆڤـی موسـڵماندا لـه‌ مێـژوودا، له‌لایه‌ن هه‌ندی ره‌مزه‌ گه‌وره‌و ره‌وتی سۆفیگه‌رییه‌وه‌.

ئه‌م دۆخه‌ وای کردبوو، که‌ له‌کاتێکدا بانگه‌وازه‌که‌ قوربانیی ئامانج‌و دروشمه‌ ساسییه‌کان بوو، له‌و سۆنگه‌وه‌ قه‌ده‌غه‌کراو هه‌ڵگرانی راوه‌دوو ده‌نـران‌و سـزا ده‌دران‌و زینـدانی ده‌کـران، که‌چـی هـه‌موو رووکردنـه‌ سیاسه‌تێك، به‌تایبـه‌تیش لـه‌ چوارچـێوه‌ی ئـه‌و پـه‌راوێزه‌ی لـه‌ هه‌نـدێ وڵاتدا دروست ده‌بوون، شڵه‌ژاوییه‌کی ناوخۆیی به‌ دوای خۆیدا ده‌هێنـا، مه‌ترسی ئـه‌وه‌ زه‌قده‌کرایـه‌وه‌، کـه‌ بانگه‌وازه‌کـه‌ خه‌ریکـه‌ پـاکیزه‌یی و سامی خۆی ده‌دۆڕێنێ‌و به‌شی لـه‌ بـانگخوازان بـه‌ره‌و دنیاگـه‌ری ملیـان ناوه‌و سازش له‌سه‌ر په‌یام‌و دروشمه‌کانی ده‌که‌ن!!

٩. نـاواقیعی بـوونی ئایدۆلۆژیایه‌کـه‌ له‌مـه‌ڕ خوێندنـه‌وه‌ی واقیعـی ناوخۆو ئیسلامی‌و جیهانی‌و دیاریکردنی دروشم‌و ئامانج‌و میکانیزمه‌کان،

لەبەر رۆشنایی ئەودا، بە جۆرێك کە رەوتی ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ زۆر کەم نەبێت نەتوانێ ئامانجەکانی بەدی بێنێو دەوڵەت دروست بکاتو کۆمەڵگە بەو جۆرەی نەخشەی بۆ کێشابوو وێنای کردبوو، دابڕێژێتەوەو بەڕێوەببات، کە ئەوەش ئەگەر بەشێکی بە فشارو پیلانگێڕی نەیاران لێکبدرێتەوە بەشەکەی تری پەیوەندی بە دیاریکردنی دروشمو ئامانجە سیاسییەکانی خودی رەوتەکەوە هەیە.

١٠. تێکەڵکردنی مەسەلە دەعەویو دینییە رووتەکان لەگەڵ مەسەلە سیاسییەکانو پاساودانو لێکدانەوەی ناکامیو پاشەکشە سیاسییەکانو قەیرانەکان، بە زمانو لۆژیکێکی ناسیاسی وەك سروشتی بانگەوازی ئیسلامیو پێغەمبەران (د.خ) و تاقیکردنەوەی خوداییو دڵگۆڕینی سەرکردەو ئەندامان و.. تد. کە ئەمە ئاماژەیە بە چەندین مەسەلەی نەرێنی، لەوانەش[1]:

١) تێکەڵکردنی ئەو (سنن)و رێسایانەی حوکمی هەریەك لە (بانگەوان)و (سیاسەت) دەکەن.

٢) فەرامۆشکردنی (سنن)ەکانی سەرکەوتنو ژێرکەوتنو گشتگیربوونیان بۆ گشت گەلو نەتەوەو رێبازو گروپەکان.

---

[1] بۆ نموونە لەم رووەوە خوێنەر دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ (طريق الدعوة، دار التوزيع و النشر الأسلامية، ١٩٨٩، ل٨٠) مستەفا مەشهور دەنووسێت: ئەو بەڵاو تاقیکردنەوەی بەسەر خاوەن بلانگەوازەکاندا دێت رێسایەکە لە رێساکانی خودا کە سەبارەت بە بانگەوازەکان گۆڕانی بەسەردا نایەت، نەك بە هۆی هەڵەکانەوە.

٣) سوودوەرنەگرتن لە مێژوو پەندوەرنەگرتن لە هەڵەو شکستو ناتەواوییەکان، لە سۆنگەی نەبوونی لێکدانەوەیەکی بابەتیو زانستی بۆ هۆکارەکانو عەقڵێکی رەخنەگرانەو دووبارەبوونەوەی هەڵەکان.

٤) تێکەڵکردنی بانگەوازو ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ، کە بەرهەمی رێژەییبوونی تێگەیشتنو عەقڵی مرۆڤە لەگەڵ خودی ئیسلام وەك پەیامێکی ئاسمانیو خوایی.

٥) لێپرسراوێتی لە ئەستۆنەگرتن لەبەردەم شکست و پاشەکشەکان لەلایەن سەرکردایەتییەوە، لەو سۆنگەوە کە ئەوەی بەسەر رەوتو ئەندامەکانیدا دێت، پەیوەندی بە هەڵەی سەرکردایەتییەوە نییە، بەڵکو هەڵقوڵاوو رەنگدانەوەی سروشتی بانگەوازو رێساکانی خودایە لەم بارەوە. بە جۆرێك ئەگەر کۆمەڵێکی بانگخواز دووچاری بەلاّو ئازارو چەوساندنەوە نەبن، دەبێت گومان لە خۆیانو راستی رێبازەکەیان بکەن!! بەش بەحاڵی خۆم پێم وایە ئەم لێکدانەوە جۆرێك لە پاکانە بۆ ئەو دەسەلاّتو ستەمکارانەش دەکات کە دووچاری هەموو ئەو ئازارەی کردوونو دەیانکات بە ئامرازێ بۆ رێسایەکی خودایی لەوەپێش دیاریکراو، با لە گوناهیشیان لە قیامەت کەم نەکاتەوە[1].

٦) وێناکردنی ململانێی نێوان تەوژمی ئیسلامیو بەرامبەرەکانی وەك هەق و ناهەق (الحق و الباطل) کە لە جەوهەردا پیرۆزییو رەهایدانە

---

[1] طريق الدعوة، سەرچاوەی پێشوو، ص٨٠-٨١ و ١٠١.

بە خۆو دارِنینی بەرامبەرە  لە هەموو راستیو هەقو رەوایەتییـەك، کـە روونـە هـەقو ناهـەق مەسـەلەیەکی رێژەییـەو کـاتو شـوێنو جـۆری بەرامبەرەکانو مکانیزمی ئیشکردنو زۆر شتی تر کاری تێ دەکات. ئەم دیاریکردنـەش دەرکەوتەیـەکی تـری تێکـەڵکردنی بانگـەوازی برایـانو ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێیە بە گشتی لەگەڵ خودی ئیسلامدا[1].

١١.    ئەرکی سیاسەت رواندنو دەستەبەرکردنی کلتوری سەربازییو قوربانی دانو گوێرِایەڵیو متمانە بە سـەرکردایەتیو پرسـیار کردنـە لـە (تکلیف). نەك برِیارو گومانو رەخنە  بەتایبـەتیش لـە ژیـانی  دەروون رێکخراوەیی و ریزەکـانی بانگـەوازو تێکۆشـاندا، یـەکێ لـەو میکانیزمـە دینییــە مێژووییانــەش بــۆ دەســتەبەرکردنی گوێرِایــەڵی ئەنــدامان بەکارهێنراوەو بەکاردەهێنرێ (بەیعەت)ە. لە کولتوری ئەهلی سوننە و جەماعەشدا تەنها کوفری بێ پەردە (کفـر البـواح) بەیعـەت لـە گـەردنی بەیعەتدار دادەماڵێ گوێرِایـەڵیش لـەناو جەماعـەتو رەوتـی دینیـدا بـە ئــەرکێکی ئــاینیو رێکخراوەیــی دەستنیــشانکراوە. تێکۆشــەرانی

---

[1] مجموعة رسائل، ب. دووەم، لەم رووەوە روودەکاتە برایان و دەنووسـێت: ئێـوە لـەبیرتان بێـت ئەی برایان. "ئێوە ئەو غەریبانەن لەکاتی خراپبـوونی خەڵکـدا چاکـسازی دەکـەنو چـاکە بـڵاو دەکەنەوە، عەقڵی نوێن کە خودا دەخوازێت بـۆ مرۆڤایـەتی حـەقو ناحـەقی پـێ لـە یـەکتر جیـا بکاتەوە، ئێوە بانگخوازی ئیسلامو هەڵگری قورئانو میراتگـری پێغەمبـەرو یـارانی ئـەون!! بۆیـە بانگەوازەکەتان فەزڵی بەسەر هەموو بانگەوازێکدا دراوە، مەبەستەکەتان لە هەموو مەبەستێ بڵنـد ترەو پشتان بە پاڵپشتێکی لە رووخان نەهاتوو بەستووە، ل٩٤–٩٥،

ئیسلامخواز لە ریزەکانی جوڵانەوەی دایکی ئیسلامییەکاندا، واتە برایان بەیعەت لەسەر ئەم شتانەی خوارەوە دەدەن:

تێگەیشتن وەك ئەوەبێت کە جەماعەت دەیخوازێت، دڵسۆزی، کارکردن، جیهاد، قوربانیدان، گوێڕایەڵی، خۆگریو دامەزراوەیی، لێ بڕان، برایەتی و متمانە[1]. هەموو ئەوەش دەخوازێت بە پلەی یەکەم پشت بە سۆز و جۆشو خرۆشو هاندان ببەسترێت.

---

[1] فتحي يكن، ماذا يعني انتمائي للأسلام، ص١٦٥-١٧٤.

# فەسڵی شەشەم
# دەرکەوتنی کێشەی بانگەوازو سیاسەت
# وەك دەرهاویشتەیەکی بەشداری سیاسی ڕەوتی ئیسلامی

وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد ئایدۆلۆژی ئیسلامی نوێ لە ئامرازو ئامانجو شێوەی کارکردندا گشتگیرو هەمەلایەنەیە، هاوبەش لەگەڵ خۆیدا قبوڵ ناکات، داوای گۆڕانی ریشەییو هەمەلایەنە لە کۆی واقیعی کۆمەڵگەدا دەکات، بۆ ئەوەی لە ڕوانگەی پێوەرەکانی خۆیەوە دایبڕێژێتەوە[١]. کۆمەڵگەیەکی یەك رەنگو یەکدەنگی سیاسی دەوێت، دەخوازێت کەسێتیو کۆمەڵگە بە رەنگی خۆی رەنگ بکاتو دەستوەرداتە وردو درشتی ژیانی تاکە کەسی و دەستەجەمعییەوە!!

---

[١] د. محسن عبد الحميد، المذهبية الأسلامية، ص٧٧-٨٠.. و مجموعة من الباحثين، الأسلاميون و نظام الحكم الديمقراطي ـ ص٢٣١.

ئەوەش دەخوازێت تەنها خۆی چاودێری خۆی بێت! چۆنی دەوێت بەو جۆرە کۆمەڵگە بەڕێوەبەرێت. لە سۆنگەی نەبوونی نموونەیەکی ئەزموونکراوی سیاسی چوارچێوەدار و روونیشەوە، بە کردەوە کۆمەڵگە دەکات بە کێڵگەی تاقیکردنەوەی تێزو بۆچوونەکانی. مەسەلەی بەشداری سیاسیش لە چوارچێوەی سیستمی سیاسی باودا لەگەڵ لۆژیكو پرۆژەو ئامانجەکانیدا، بە شێوەیەکی تەکنیکیو بۆ (اقامة حجة)ی سیاسیو کات بەڕێکردن نەبێت، ناگونجێت. بە حوکمی ئەوەی خۆی بە نوێنەری تاکە تێگیشتنی راست لە ئیسلامو رزگارکەر دەزانێت. بە حوکمی پێکهاتە فیکریو جیهانبینییەکیو خوێندنەوەی بۆ ئیسلامو واقیعو دیاریکردنی کێشەکانو جۆری چارەسەرەکانو خۆرئاواو مۆدێرنە، ئاسان نییە بڕوا بەوە بکات. بانگەوازو رێبازە فیکریو سیاسییەکانی تر دەتوانن. هەڵگری تێگەیشتنی راست بنو توانای بەشداریان لە چارەسەری کێشەکاندا هەبێت، خۆ ئەگەر شتێکی لەو جۆرەش بوونی هەبێت، داوای لێ دەکرێت لەگەڵ رەوتە ئیسلامییەکەدا یەکبگرێتو لەناو یەکدا بتوێنەوە. لەو سۆنگەوە کە دەبێت (هەق)و (تێگەیشتنی راست لە ئیسلام) و هەوڵی دووبارە هەڵسانەوەی ئوممەت یەك نوێنەری سیاسی رێکخراوەیی هەبێت چونکە فرەیی سیاسی زیان بە یەکڕیزی نەتەوەو پرۆژەی دووبارە بیناکردنەوەی دەدات وە ناپێویستەو بەشێکیش نییە لە پێویستیەکان کارێکی سیاسی کاملو (راشد)و پێگەیشتوو. ئەم وێنایەی پێشەوە دۆخی ئاسایی ئایدۆلۆژیو سیاسی رێکخراوەییە، کە رەوتی ئیسلامی هەڵیگرتووە و بۆی

تێدەکۆشێت و لەڕێی ئەو دنیا دەبینێتو قۆناغو شێوازەکانی خەباتو جۆری پەیوەندی بە دەوروبەرەوە دیاری دەکات، بەڵام کاتێ ئەم خەونە لەگەڵ واقیعدا پێکی دادا، کاردانەوەی لێکەوتەوە[1]، لە دۆخێکی لەم جۆرە هەندێ پاشەکشە دەکەنو نائومێد دەبن. هەندێکیش سوور دەبن لەسەر دەستگرتن بەکۆی خەونە نموونەیی کەو گوێ بە واقیعو بەربەستو داخوازیو کێشەو جۆری چاوەڕوانییەکان نادەنو پێداگری لەسەر بۆچوونەکانیان دەکەن. کە دەبێتە هۆی چوقبەستووییو کلسکردنی فیکریو وشکهەڵاتوویيو داڕوخاوی ئەخلاقی. ئەم جۆرە کەسانە جیاوازی (واقیع)و نائومێدیو دابڕانی خەون لە واقیع. لەبری ئەوەی بیانخاتە سەر کەڵکەڵەی بە خۆداچوونەوەو بەرهەمهێنانی خوێندنەوەیەکی نوێ لە واقیعو ئایدۆلۆژیاو خەونەکان، بە مەبەستی خۆگونجاندنەوەو دووبارە خۆ بیناکردنەوەو، کەچی زیاتر دەست بە تێزە کۆنە توندڕەوو توندوتیژو بیرداڕێژەرە ئیسلامییەکانەوە دەگرن. کە واقیعی ناهەمواری پەنجاو شەستەکان لە میسردا بەرهەمی هێناون، کاردانەوەی سێهەم لەم نێوەندەدا درێژەدانە بە دەستگرتن بە بەهاکان لەگەڵ دەستکاری کردنی شێوازی کارکردنو گوتاری سیاسی و تەکتیکەکان بەرجەستەی دەکات، کە ئیخوان دوای هاتنە دەرەوەیان لە زیندان لە حەفتاکاندا، هەوڵی ئەمەیاندا .

[1] الحركات الأسلامية... و اختزال الأسلام، المجلة. www. Islam Today. Net.

سـەرەتا سـودیان لـەو پـەراوێزە وەرگـرت کـە سـادات لـە سـۆنگەی پێویـستییەکانی بـەڕێوەبردنی ململانێـی نێـوان تەوژمـە فیکرییـە سیاسییەکانی کۆمەڵگەوە بۆی فەراهەم کردبوون.

لـەو چوارچـێوەدا خۆیـان ڕێکخـستەوە، پەیکـەری ڕێکخـستنەکانیان دروسـت کـردەوە، سـەرلەنوێ، کەوتنـەوە بیرکردنـەوە لـە دووبـارە داڕشتنەوەی نەخشەو ستراتیژی کارو بانگـەواز. هەڵگیرسـانی جیهـادی ئەفغانـستانو شۆڕشـی ئیـسلامی ئێـرانیش شـەپۆلێکی بـەرفراوانی ئیـسلامخوازی لەگـەڵ خۆیـدا هێنـا، کـە پێـشتر لـە سـۆنگەی شکـستە ئابڕوبەرەکـەی سـاڵی (١٩٦٧)ی ڕژێمـە ناسیونالیـستییە عەرەبەکانـە زەمینـەی بـۆ سـاز کردبـوو، چـونکە شکـستی ڕژێمـی (عبدالناصـر)و (بەعـسی سـوریا) کـە بـە دوو قـەڵای بـیری نەتەوەپەرسـتانی عـەرەب دادەنرانو دژایەتییەکی زۆری ئیسلامییەکانیان کردبوو، بەتایبەتیش لە (میـسر)دا، هـەروەها مـژدەی پەرەپێـدان و دادپـەروەریو یەکیـەتی نەتەوەییو سەربەرزیو ڕزگارکردنی فەلەستینیان بـە خەڵکەکـە دابـوو، بـەڵام جەنگەکـە و قوڵبوونـەوەی قەیرانـە ناوخۆییـەکانو سـتەمکاری (اسـتبداد)ی سیاسـی بەسـەر یەکـەوە، ئـەو ڕژێمانـەو ئایـدۆلۆژیاکانیان لەبەر چاوی بەشێکی گرنگی گەلانی ناوچەکە لەڕوو هەڵماڵی.

ڕووتێکردنی بەربڵاوی خەڵکی موسڵمانیش بۆ دووبارە دەستگرتنەوە بە شێوە ژیانو بانگەوازی ئیسلامیو بانگخوازان، کە لە دواتر بە بێداری ئیسلامی (الصحوة الأسـلامیة) نـاوزەد کـرا. هـەروەها گواسـتنەوەی لـە عەقڵیـەتی (بانگـەوان) بـە تێگەیـشتنی (قطـب)ی و (مـەودودی) کـە بـۆ

نوخبەیەکی سنورداربوو باوەشکردنەوەی پۆل پۆل (افواج) بۆ خەڵك، بۆ ئەوەی جارێکی ترو بەو جۆرەی تێی گەیشتوون‌و بانگخوازو ئیسلام خوازەکان بۆیان روون دەکەنەوە. لە چوارچێوەی ئیسلامدا رەنگ‌و بۆیەکی نویٚ بە ژیانی خۆیان بدەن، مۆرکی جەماوەری بوونی تەوژمی ئیسلامی زەق کردەوە. کە دواتر لەژێر کاریگەری (جیهادی ئەفغان)و (شۆڕشی ئیسلامی ئێران) دا بە دوو ئاراستەدا تەوزیف کرا:

یەکەم: دووبارەکردنەوەی ئەزموونی ئێرانی لە میسر و هەندیٚ وڵاتانی تردا بەوەی لەڕێی هێزو شۆڕشەوە رژێمی دەسەڵاتدار بڕوخێنرێت‌و دەوڵەتی ئیسلامی مزگێنی پێدراو دابمەزرێت‌و شەریعەتی ئیسلامی پیادە بکرێت، کە هێزگەلی وەکو (کۆمەڵی ئیسلامی‌و جیهاد) لە میسر نوێنەرایەتیان دەکرد. بەڵام رۆژگار دەریخست کە زەمینەی شۆڕش لە وڵاتەکەیاندا نییە، ئەوەی ئەوان ناویان ناوە شۆڕش راپەڕینی چەکداری گروپێکی ئایدۆلۆژی‌و سیاسی سنورداری کۆمەڵگەیە لە چوارچێوەی (تأصیل)کردنێکی کەلەپور و مێژوویانەی چەمکی (جیهاد) لە روانگەی مەنهەجیەتێکی سەلەفی نوێوە.

شۆڕش لە ئێران جیاواز بوو، شۆڕشێکی نویٚ بوو، نزیکەی سەرجەم ئایدۆلۆژیاو تەوژم‌و رەنگە جیاوازەکان، بە چەپەکانیشەوە بەشداریان تێدا کرد. شۆڕشێکی بەربڵاوی جەماوەری خەڵکبوو، کە خۆی لە روخانی رژێمی پاشایەتی پەهلەویدا دەبینییەوە. ئەوەی روویدا شتیٚ بوو، پەیوەست بوو بە قۆناغی دوای سەرکەوتنی شۆڕش‌و دەستبەسەرا گرتنی لەلایەن بەشیٚ لە شۆڕشگێڕانەوە. کە بە کردەوە بە هاوبەشی

خـەڵكانی تـر پێـشەوایەتی شۆڕشـیان كردبـوو. لەكاتێكـدا ئیـسلامییە جیهادییـەكانی (میـسر)و ناوچـەكە بـە حـوكمی داخـراوی ئایـدۆلۆژیو عەقڵی گروپیی، تەنانەت نەیاندەتوانی ئیسلامییەكانیش لە خۆ بگرن، چ جای قەناعەت بە چەپو لیبراڵەكان بكەن، ببن بە بەشێ لە شۆڕش.

دووەم: كاردانەوەی دووەم لە بازنەی (اخوان)دا بـوو كـە بەشـێ لـە ڕەوایەتی مانەوەی خۆیو پاساوی بوونی لە هەمبەر دەسەڵاتی سیاسی دا، بە دژایەتی ئیـسلامی تونـدڕەوەوە گـرێ دابـوو. پـرۆژەی شـۆڕشو هەڵگەڕانەوەشی نەبوو، چونكە هەر لە بنەڕەتـەوە خـۆی بـە گروپێكـی ریفۆرمخـوازی ناشۆڕشـگێڕ پێناسـە كردبـوو. پێكهاتـەی فیكـرو جـۆری پـــەروەردەی (اخـــوان) لەكاتێكـــدا لـــە زیـــاد لـــە ئاســـتێكدا رژێـــمو ئایدۆلۆژیاكەی رەتدەكردەوەو رەوایەتی ئیـسلامی لێ دەسـەندەوە، وە زۆرجـار ئـەم واقیعـەو سـەركوتكاری رژێمـەكان، وای كردبـوو، لەگـەڵ دەسەڵاتی سیاسی دا لـە زیـاد لـە وڵاتێكـدا پێكداداو بـەو هۆیەشـەوە، هەزاران كادری بخرێنە زیندانەكانەوەو دووچـاری ئەشـكەنجە و ئـازاری تاقەت پروكێن ببن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر لـە سـەردەمی (بـەننا)ی دامەزرێنەرەوە، بێ كەڵكو سـوودبوونی (شـۆڕش)ی، وەك رێگایـەك بـۆ گۆڕانكاری خستبووە روو![1].

(اخـوان) لــە بەرامبــەر فراوانبــوونی بازنــەی بێـداری ئیـسلامیو گۆڕانكــاری ناوچــەكەو، باوەڕنــەبوون بــە شــۆڕش وەك شــێوازێكی

[1] مجموعة رسائل،ب. دووەم، لا ٥٠-٥٣

جەماوەریو بەربڵاوو توندوتیژ بۆ هێنانەدی گۆڕانکاری، بڕیاری دا بیر لە بەشداری سیاسیو سوودوەرگرتن لەو پەراوێزە دیموکراسییە بکاتەوە، کە گۆڕانکارییە ناوخۆییو دەرەکییەکان سەپاندبوویان.

بیری لە دامەزراندنی حیزبێکی سیاسی کردەوە بۆ ئەوەی لەڕێی ئەوەوە جۆری لە رەوایەتی یاسایی بە بوونی خۆیان بدەنو بەشداری ژیانی سیاسی بکەن. بەڵام کاتێ رابەری برایان ئەم بیرۆکەیەی خستەڕوو دووچاری ناڕەزایەتییەکی بەرفراوان لە ناو خودی (نوسینگەی ئیرشاد)و (شورا)ی برایان بۆوە[1]. دوای بڕیاردان دامەزراندنی حیزبەکە دەسەڵات رێگای پێ نەدان. پێشم وایە بیرکردنەوە لە دروستکردنی حیزب سەرەڕای کولتورێکی درێژی (برایان) لەسەر رەتکردنەوەو دژایەتیکردنی کاری حیزبی، کە لە خودی (بەننا)وە دەست پێ دەکات چەند هۆکارێکی لە پشتەوە بوو، لەوانەش:

١. ئەزموون وەرگرتن لە هەورازو نشێو و رەنجو ئازاری قۆناغی رابردوو، بەرەنجامی تاڵی رەتکردنەوەی فرەحیزبیو نەبوونی دەرفەتی کاری ئاشکراو راوەدوونانی ئاسایش.

٢. وەڵامدانەوە بە خواستی واقیعی بێداری ئیسلامیو فراوانبوونی ئەندامو لایەنگرانو هەوڵدان بۆ تەوزیفیکردنیان بە قازانجی کۆمەڵو بانگەواز.

---

[1] د. محمد حبیب، الدعوي و السیاسي www.Vetogate.com سێشەممە، ٧/یونیۆ/٢٠١٦

٣. هەڵبژاردنی دۆخی سـێهەم دوای ئـەو واقیعـەی بـە سـەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی ئێرانو سەرهەڵدانی جیهادی ئەفغان هاتبووە کایەوە. دۆخی یەکەمو دووەم مانەوە بوو لە دۆخـە کۆنەکـەدا یـاخود پـەنابردن بوو بۆ شۆڕشو گۆڕانکاری خێراو ڕیشەیی. دۆخی سێهەمیش دەرچوون بوو لە دۆخی سنورداری پێـشوو، هـەنگاونان بـوو بـەرەو ئامـادەبوونو بەشداری سیاسیو بەرەوپێشچوونی خەباتی مەدەنی کە ئەوان ئەمەیان هەڵبژارد.

٤. پاراستنی پاکیو بێگەردی بانگەوازی (برایان) بۆ ئەوەی بەهۆی جـــەبرەکانی سیاســـەتو هەڵکـــشان و داکـــشانو پێویـــستییەکانی ڕاستگۆییو پاکێتی و بۆخوا بوونی دەکەوێتە ژێر پرسیارەوە.

بەڵام دەسەڵات بە بیـانووی ڕێگەنـەدان بـە حیزبێـك لەسـەر بناغـەی (ئاین) دروست بووبێت، مۆڵـەتی پـێ نـەدان. ئـەم پرۆژەیـە مایـەوە تـا سەرکەوتنی راپەڕینی گەلی میسر لە سـاڵی (٢٠١١) دامەزرانـدنی پـارتی ئازادیو دادپەروەری. ڕێگەپێنەدانی دەسەڵاتیش زیاد لە هۆکارێکی لـە پشتەوە بوو، لەوانەش:

١. هێـشتنەوەی برایـان لـە دۆخـی بەرزەخـدا، دۆخـی هــەبوونو نەبووندا، واتە بە کردەوە ڕێگایان پێدەدرا، لە سنورێکدا هەبن، بەڵام لە ڕووی یاسـاییەوە یاسـاغ بـوون. ئەمـەش پێـی دەوترێـت بـوونی لـەژێر چاودێری و کـۆنترۆڵکراو. واتـە تـۆ بـەو ئەندازەیـە هـەی کـە دەسـەڵات ڕێگەت پێدەداتو هێڵە سـوورەکانی نابـەزێنی، کاتـێ ئـەوەت تێپەڕانـد

هەڵمەتێکی راوەدوونـانو گێـچەڵ پێکـردن دەسـتپێدەکاتو دەبرێتــەوە قابلۆغەکەی جاران.

لـەڕووی زانـستی سیاسیـشەوە هێـشتنەوەی رێکخـراوە لـە قۆنـاغی یەکەمی بـوونو گەشـەکردنیدا کـە قۆنـاغی بوونـە. بـۆ ئـەوەی نەچـێتە قۆنـاغی سـەقامگیریو دواتـر گەشـەکردنەوە. دەسـەڵات لـە میسریـشدا دەیویست (برایان) بوونێکیـان هـەبێت هەمیـشە لـەژێر هەڕەشـەدا بـن، کارکردنی یاسایی تاڕادەیەك دەیخستنە دۆخـی سـەقامگیریو لـە خـەم رەخسانو دواتر گەشەکردنەوە. کە ئەوەش رێگەپێدراو نەبوو.

٢. پارێزگاریکردن لە ژیانو فرەحیزبییەکی شـکڵیو بـێ نـاوەرۆك. کـە حیزبـە چـەپو نەتەوەییـەکان نوێنەرایـەتیان دەکـرد، مـۆدێلێ لـە حیزبایەتی و فرەیی کە تەنها لەسـەر ئاسـتی پـەراوێزێکی دیـاریکراودا، توانێی کێبڕکێیان هەبێتو نوخبەیەکی حیزبـی واش حیزبـەکان بـەڕێوە ببەن، توانای دابەشـکردنی هەنـدێ رۆڵیـان لەگـەڵ رژێـم هـەبێتو هـیچ پرسیارێکی جددی لەسـەر پێگـەو دواڕۆژی دروسـت نەکـەن. لەکاتێکـدا (برایان) بـەو جـۆرە نـەبوون، قوڵاییـەکی مێـژوویی و جـەماوەریی زۆرو رێکخـستنێکی بـەرفراوانیان هـەبوو، مۆڵـەت پێـدانیان، وای لێ دەکـردن مەترسی بـۆ پـارتی دەسـەڵاتدار دروسـت بکـەن و ناچـار بـە کرانـەوەو دیموکراسـییەکی زۆرتـری بکـەن، یـاخود گـەر رژێـم پـەنای بـردە بـەر سەرکوتو لـەباربردنی پـەراوێزە دیموکراسـییەکە دووچـاری قـەیرانێکی شەرعیەتی قوڵی بکەنو بەرەو داڕوخـانی بـەرن، وەك چۆن دوایەمینـە

هەڵبژاردنی پێش شۆڕشی میسر و جۆری مامەڵە لەگەڵ (برایان) هەمان ڕۆڵی بینی.

هەڵبەت لە پەیوەندی بە هەوڵی برایان بۆ دروستکردنی حیزب دەبێت ئەزموونی ئەم کۆمەڵە لە (میسر)و دەرەوەی میسردا لە یەکدی جیا بکەینەوە، چونکە لەکاتێکدا لە چلەکان (بەننا) هێرشێکی توندی دەکردە سەرفرە حیزبیو پێی وابوو ئیسلام کاری حیزبی ڕەتدەکاتەوە.

هاوبیرەکانی لە جەزائیرو لە ساڵی (١٩٤٦)و لە سایەی ئیستعماری فەرەنسی دا حیزبێکیان بەبێ هیچ پاشگرێکی ئیسلامی بە ناوی (پارتی یەکبوونی نیشتمانی) دامەزراند، کە یەکەم هەنگاوی خۆگونجاندنی ڕێبازی برایانو پەیڕەوانی بوو، لەگەڵ واقیعی نیشتمانی جەزائیردا[1].

لە ساڵی (١٩٤٧)یش برایان لە (سوریا)دا بەشداری هەڵبژاردنەکانیان کردو تا ڕادەیەك وەك بەشێ لە سیستمی سیاسی و دیمەنە سیاسییە نیشتمانییەکان کاریان دەکرد[2]. ئەوەی ئەم ئەزموونەشی لەباربرد، لەبارچوونی ئەزموونی تازە سەرپێکەوتووی سوریاو وەیشوومەی شومی کودەتا سەربازییەکان و باڵادەستی ئایدۆلۆژیاو عەقڵیەتە نادیموکراسییەکان بوو بەسەر دەسەڵاتدا.

لە ساڵی (١٩٦١)یشدا برایان لە عێراقدا دەستپێشخەریان کردو (پارتی ئیسلامی عێراق)یان دامەزراند. کە جگە لە (برایان) هەندێ کەسی بێلایەنیش بەشداریان لە دامەزراندنیدا کردبوو، بەلام کە دواتر

[1] الأسلاميون و الحكم في البلاد العربية و تركيا، ل١٤٠.

[2] هەمان سەرچاوە، ل٢٤٦.

دەرکەوت رووکار (واجهة)یەکی برایانەو ناتوانێ لەژێر هـەژمونی ئـەوان دەربچێت، هەندێ لەوان کشانەوە[1].

بەڵکو لە سەردەمی خودی (بەننا)دا رێکخراوە خێرخوازییەکانی سەر بـە برایـان لـە جەسـتەی رێکخراوەیـی کۆمەڵەکـە جیاکرانـەوە[2]. مەسەلەیەکی تر کە پێویست بوو بەشێ نـەبێ لـە برایـانو شـڵەژاوی بـۆ خولقاند سیسمی تایبەت بوو (النظام الخاص) کە کاری گرنگی دان بـوو بـە پرسـە سـەربازییەکان، چـونکە (فقـە) و پێویـستی و پـەروەردەی هێزێکـی سیاسـی پـەروەردەیی لەگـەڵ رێکخراوێکـی سـەربازی چـەکدار جیاوازە، ئەم تێکەڵبوونە سەرەنجام بە زیانی برایان شکایەوە[3].

گەر بگەڕێینەوە بـۆ مەسـەلەی هەوڵـەکانی (برایـان) لـە میـسردا بـۆ بەشـداری لـە ژیـانی سیاسـیو کاردانـەوە فیکـریو رێکخراوەییـەکانی، هەروەك دەزانین، مۆڵەت پێنەدانی حیزب، بۆ ئەوەی لە رێگەی ئەوەوە بە ناسنامەی سەربەخۆیی خۆیانەوە بەشداری سیاسی بکەن، وازی پـێ نەهێنانو کۆڵی پێ نەدان، بـەڵکو هەوڵیانـدا بەشـی لـەو بەشـدارییە لـە ئاسـتێکی خـوارتری بـێ کێـشەتر دا بێننـە دی کـە ئـەویش خـەباتی سـەندیکایی بـوو. لـەو رێیەشـەوە جگـە لـە سـەلماندنی ئامـادەبوونی خۆیان، بەشی لە لێهاتنەکانیشیان نیشانی کۆمەڵگە بـدەن، ئـەزموون و شارەزایش لە کاری سەندیکاییدا بەدەست بێنن.

---

[1] طه جابر العلواني/ الأسلاميون بين الدعوة و الدولة urIcciyyoh.com www.vouyat

[2] طارق البشر، الحركات الأسلامية في الوطن العربي، بەرگی یەکەم، لا١٥٨.

[3] سەرچاوەی پێشوو.

هەروەها هەولیاندا لەڕێی سوودوەرگرتن لە پارتەکانی تر لەوانەش پارتی کار و پارتی (وەفد) ئامادەیی سیاسی خۆیان بخەنە روو. لە هەڵبژاردنەکانیساڵی (١٩٨٥)یش لەگەڵ لیستی پارتی وەفد پاڵێوراوەکانیان سەرکەوتنێکی گەورەیان بۆ خۆیان تۆمار کرد، کە بۆ زۆر ناوەندو دەسەڵاتیش پێشبینی نەکراوبوو[١].

برایان لە ئۆردنیش لەگەڵ ئەو کرانەوە سیاسییەی وڵات کە لە کۆتایی هەشتاکاندا بە خۆیەوە بینی، بڕیاری بەشداریکردنیان لە ژیانی سیاسی و هەڵبژاردنە پەرلەمانییەکاندا دا، بەڵام لە سەرەتاوە بڕوایان بە بەشداری لە حکومەتدا نەبوو[٢]. دوای ئەوەی لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی (١٩٨٩)دا سەرکەوتنی گەورەیان بە دەست هێناو بوون بە فراکسیۆنی یەکەمی پەرلەمان، مشتومڕێکی گەرم لە نێوان بەشێ لە سەرکردایەتی (برایان)دا دروست بوو، دەربارەی شەرعی بوونو ناشەرعی بوونی بەشداری لە حکومەتێکدا کە کار بە (شەرعی خوا) ناکات، هەندێ بۆچوونیان وابوو کە لەو سۆنگە عەقیدیو ئایدۆلۆژییەوە نابێت بەشداری حکومەت بکرێت، بەڵام سەرەنجام گفتوگۆکان بەوە شکانەوە، کە پێوەری بەشداری کردنو نەکردن بەرژەوەندیو پێوەرەکانیو واقیعی سیاسییە، نەك مەسەلەی حەرام و حەڵاڵ[٣].

---

[١] الأسلاميون و الحكم في البلاد العربية و تركيا، لا٨٨.

[٢] سەرچاوەی پێشوو / لا٢٧٢-٢٧٣.

[٣] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٢٧.

هەرچی پەیوەستە بە (سودان)یشەوە، ئەوەی پێویستە بوترێت ئەوەیە کە جوڵانەوەی ئیسلامی ئەو وڵاتە هەر لە سەرەتایەکی زۆر زووەوە تێکەڵ بە ژیانی سیاسی وڵاتەکەیان بوون.

ئەوەی جوڵانەوەی ئیسلامی سودان لە هاووێنەکانی لە زۆر لە وڵاتانی تری ناوچەکە جیا دەکاتەوە، ئەوەیە کە هەر لە سەرەتاوە وەك بەشێك لە جوڵانەوەی رزگاریخوازی نیشتمانی سودان کە لە پێناو مافی چارەنووسدا سەریانهەڵداوە، لە بەر ئەوە وەك هەندێ وڵات دووچاری پەراوێزخستنو راوەدوونانو چەوساندنەوە نەهات، مەگەر لە هەندێ کاتدا کە سەرجەم تەوژمو هێزەکان دووچاری هاتبن وەك کاتی کودەتا سەربازییەکان، بە نیمچە بەردەوامیش بەشداری ژیانی سیاسیو دەسەڵات بوون[1].

لە ساڵی (١٩٥٥)دا ئیسلامییەکانی سودان (بەرەی ئیسلامی بۆ دەستوور)یان پێکهێنان رەوتەکە لە درێژەی رەوتی کارکردنیشدا چەندین جار ناوی خۆی گۆڕیوەو بە شێوەیەکی بەرچاویش بە عەقڵی دروستکردنی بەرە ئیشی کردووە، لەبەر ئەوە لەگەڵ سنورداربوونی ئەندامەکانیشی لە سەرەتاوە، توانی دروشمی سیاسی گەورە بەرز بکاتەوەو خەڵكو هێزی تری لە دەور کۆبکاتەوە و وەك سەرکەوتوو دەربکەوێت[2]. بەڵام هەموو ئەم بەشدارییە جیاوازانە دەبێت دواتر بخرێنە چوارچێوەی (سیاق)ە مێژووییەکەی خۆیانەوە. لەبەر ئەوەی

[1] الأسلاميون و الحكم في البلاد العربية و تركيا، لا ٢١٤-٢١٥.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٢٠.

ئێمه مەبەستمانەو سەرچاوەی کێشەی مەسەلەی (بانگەوان) و (کاری سیاسی)یشە لە چوارچێوەیەکی رێکخراوەیی هاوبەشدا لە بەشدارییەکانی کۆتایی هەشتاکانو سەرەتای نەوەدەکانەوە دەست پێدەکات، وردە وردە گەورە دەبێتو ئامازەو رەهەندی نوێ بە خۆیەوە دەگرێت، تا دەگاتە قۆناغی دوای شۆڕشەکانی جیهانی عەرەبی. سەبارەت بە عەرەبەکانو سەرەتای (٢٠٠٠)ەکان سەبارەت بە تورکەکان، چونکە لە هەشتاکانو بەتایبەتیش لە کۆتاییەکانیدا گۆڕانکاری گەورە روویاندا، کە بەشێوەیەکی جیاواز کاریان کردە سەر بونیادی فیکریو شێوازی کارکردنی ئیسلامییەکان. لە گرنگترین ئەو گۆڕانکارییانەش (پرۆیسترۆکا) و هەڵوەشاندنەوەی سۆڤیەتو سەرکەوتنی دنیای لیبراڵ سەرمایەداری بوو، بەسەر سەربازگەی سۆشیالیزمدا.

هەرەسهێنانی (کۆمۆنیزم) وەك بەرجەستەکەری ئایدۆلۆژیاو سیستمێکی سیاسی گشتگیرو نادیموکراتو سەرکوتکار، وە بانگەشەکردن بۆ نەزمێکی نوێی جیهانی، رەنگدانەوەیان بەسەر کۆی جیهانو لەوانەش ناوچەی ئیسلامیو تەوژمەکانییەوە هەبوو.

داگیرکردنی کوێتو جەنگی کەنداوی یەکەمو بە لەرزە خستنییەکی لە هەرە رژێمە بەهێز و سەرکوتکەرەکانی ناوچەکەو قەلایەکی پتەوی ناسیۆنالیزمی عەرەبیش، کە مەبەست لە رژێمی بەعسە لە عێراقدا، دیسانەوە رەنگدانەوەی خۆی هەبوو. دواتر روخانی رژێم لە جەنگی کەنداوی دووەمو شکستپێهێنانی رژێمی تالیبان لە ئەفغانستانو

بانگەشەکردن بۆ شەپۆلێکی نوێی دیموکراسی لە جیهاندا، وایان کرد، ئیسلامییەکانیش لە بازنەی ئایدۆلۆژییە داخراوە قانگدراوەکان، کە ئایدۆلۆژیا شمولییەکانو سەرکوتی رژێمەکانو فەزای جەنگی سارد خولّقاندبووی، بێنە دەرەوە و بیر لە بەخۆداچوونەوە بکەنەوە.

ئەو پەراوێزانەی بۆ بەشداری سیاسیش لە هەندێ لە وڵاتەکاندا، بە مەبەستی هەناسەدان و نەتەقینەوەی دۆخەکەو (احتوا)کردنی هێزەکانو کەمکردنەوەی هەندێ فشاری کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی هاتبوونە کایەوەن، وردە وردە رەنگدانەوەی فیکریو دەروونیان لەسەر ژیانی دەروون رێکخراوەیی هێزو لایەنە سیاسییەکان دروست دەکرد.

بەشداریکردنەکان گەرچی لەسەر ئاستی فیکری ــ وەك نەریتی ئیسلامییەکان لە زۆر کاتدا ــ هیچ رەخنە لەخۆگرتنو دابڕانو نوێبونەوەیەکی فیکری قوڵی دروست نەکرد ــ بەڵکو خودی بەشداریکردنەکە دەبووە سەرچاوەی (تنظیر)ی نوێ بۆ خستنە چوارچێوەیەکی لۆژیکی وا، قابیلی بەڵگە بۆ هێنانەوەو پاساودانو بەرگری لێکردن بێت، بەڵام لەسەر ئاستی مەیدانیو کرداریدا، وردە وردە دەستکاری تێگەیشتنە باوەکانی بۆ پرۆژەو چوارچێوەی رێکخراوەییو ئایدۆلۆژی و (چەسپاوە) فیکریو رێکخراوەییەکانی دەکرد[1].

لە هەشتاکاندا گەرچی (برایان) وا خۆیان دەرخست لەڕووی فیکرییەوە دەستیان بە چەسپاوە ئایدۆلۆژییەکانیانو لەوانەش دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامیو پیادەکردنی شەریعەتەوە گرتووە،

---

[1] کۆمەڵێ توێژەر / الأسلاميون و الحكم في البلاد العربية و تركيا، لا٣٣٤-٣٣٥.

بەڵام پێویستی کاری سیاسیش ـ کە لەم ڕووەوە برایان بە پراگماتیو خۆگەنجێنەر ناسراون ـــ وای کردبوو، گوتاری سیاسییان لە بابەتی وەکو (خەلافەت) و (دەوڵەتی ئیسلامی) دوور بکەوێتەوە، ئەم دابڕانەی نێوان (فیکر) و (ممارسة) و هەڵسوڕاویی لە بواری سیاسیو سەندیکایدا، بووە سەرچاوەی دژبە یەکی (تناقض) لەناو کۆمەڵەکەدا، لەگەڵ بەرفراوان بوونی برایانو فرەجۆربوونی چالاکییەکانیشدا کە (بانگەواز) و مەسەلە سیاسییەکان تیایدا بە یەك دەگەن. هەروەها لەگەڵ جۆراوجۆریو هەمەچەشنی پاشخانی ڕۆشنبیریو کۆمەڵایەتی ئەوانەی ڕوویان تێدەکرد، ئەم کەلێنەی نێوان (فیکر)و واقیعی کرداری لە ناو برایاندا بەرفراوانتر دەبوو، بەڵام دەیتوانی سەرەڕێی ئەوە (اخوان)ی بوون لە و قۆناغەدا بکاتە چەترێكو جیاوازیو دژ بەیەکەکان لە سایەیدا کۆ بکاتەوە[١].

بەشداری سیاسی لە نێو (اخوان)ی ئۆردنیشدا مشتومڕی زۆری نایەوە، گەرچی هەر لە ساڵی (١٩٩٢)ەوە وەك وەڵامدانەوە بۆ بەشێ لە گۆڕانکارییەکانی جیهانو ناوچەکەو ئەرکەکانی قۆناغەکە پارتی (بەرەی کاری ئیسلامی)یان دامەزراندبوو، کە بە باڵی سیاسی برایان لە (ئوردن) دادەنرێت.

---

[١] کۆمەڵێ توێژەر / الأسلاميون و الحكم في البلاد العربية و تركيا، لا٣٣٥.

# فەسڵی حەوتەم:
# بەشداری سیاسی لە چوارچێوەی
# چەسپاوەکانی بانگەوازو جوڵانەوەی ئیسلامی نوێ دا
## ڕەوتی ئیسلامیی سودان وەك نموونە

بەشـداری ئیـسلامییەکان لـە پـێش هەشـتاکاندا، زۆر ناچـێتە ئـەو چوارچـێوەیەی ئـەو بابەتـەی ئێمـە دەمانـەوێت شـی بکەینـەوەو بـەرەنجامگیری لـۆژیکی و واقیعـی و مەیـدانی لێ بکـەین. گەرچـی بـە تەواویش دابڕاو نییە لێی. لێرەشـدا جوڵانـەوەی ئیـسلامی سـودان لـەم ڕووەوە وەك نموونە وەردەگرین.

جوڵانەوەی ئیسلامی سودان لە ناوەڕاستی چلەکاندا بە کاریگەری (اخوان) دروست بوو هەر زوو لە سەرەتای پەنجاکانەوە، وەك هێزێکی سودانی بەشداری ژیانی سیاسی کرد، کاتێك لە ساڵی (١٩٥٥)یشدا برایانی میسر سەردانیان کردن و داوایان لێ کردن وەك بەشێ لەوان بمێننەوە ڕەتیان کردەوە[١]. بەڵام سەرەڕای ئەوە وە بە سەرنجدان لە ئەدەبیاتی جوڵانەوەی ئیسلامی سودان هەستدەکەین، لەڕووی فیکرییەوە — نەك شێوازی ئیش کردن و تەکتیکی مەیدانی — نەیانتوانیوە لە چەسپاوە فیکرییەکانی (برایان) دەربچنو و نموونەیەکی جیاواز لە (ئامانج) و (مۆدێل) لەسەر ئاستی دەوڵەتو ڕێکخراوو پەیوەندی ئاینو سیاسەتو دەوڵەت، ئیسلامو جوڵانەوەی ئیسلامی، کۆمەڵگەو دەسەڵات، شەریعەتو یاسا پێشکەش بکەنو بخەنە ڕوو. لەچوارچێوەی ئەزموونی ئیسلامخوازانی سوداندا پرسی بانگەوازو کاری سیاسی بە بەردەوامی بەیەکەوە بوونو لە چوارچێوەیەکی ڕێکخراوەیی هاوبەشدا مامەڵەیان لەگەڵدا کراوە. (بانگەواز) لای ئەوان بەو جۆرەی لە سەرەتای ئەم بابەتەوە ئاماژەمان پێکرد، ئایدۆلۆژیا بووە، بۆ سازدانو تەییارکردنو هاوشێوەیی و بتەوکردنی ریزەکانی ڕێکخراوەیی و پاساودانی هەنگاوە سیاسییەکان سوودی لێ وەرگیراوە.

ئیسلامییەکانی سودان بە درێژایی مێژووی ژیانی سیاسی و حیزبی خۆیان چەندەها جار هاوپەیمانیەتیەکانیان گۆڕیوە. (حسن ترابی)

---

[١] کۆمەڵێ توێژەر / الأسلاميون و الحكم في البلاد العربية و تركيا، ل٢١٩.

ڕێبەریان وەك سیاسییەكی نوی پەنای بۆ جۆرەها شێوەو تەكنیكی حیزبی بردووە، زۆربەی حیزبەكانی هەندێ جار (اختراق) كردووە، مەسەلە دینییەكانی وروژاندووەو تەوزیفی سیاسی كردوون. هەر لە سەرەتاشەوە تێكەڵ بەمەسەلە نەتەوەییەكان بوون، نەبوونە پاشكۆی برایان لە (میسر)دا. ڕەوتەكە هەوڵیشی دەدا ناسنامەی ئیسلامیو نەتەوەیی بە یەكەوە ببەستێتەوە، دوای دامەزراندنی (بەرەی ئیسلامی نەتەوەیی)ش لە ساڵی (١٩٨٥)دا دەرگاكانی بۆ ناموسڵمانەكانی وڵاتەكەشی كردەوە بە مەرجی قبوڵكردنی پرۆگرامەكەی، مەبەست لەمەش ڕاكێشانی ڕای گشتی باشورییەكانی سودان بوو[1].

لەپاش كارنامە ئیسلامییەكانیانیشیاندا لە بەرامبەر كودەتا سەربازییەكاندا و لەوانەش كودەتای ساڵی (١٩٦٩) كە چەپەكانی لە پشت بوو، دروشمی پشتیوانی لە دیموكراسیو دژایەتی دیكتاتۆریەتیان بەرز دەكردەوە.

لە قۆناغەدا هەندێ دەستیشی لە پرسی بە ئیسلامی كردنی ژیانو ڕواڵەتەكانی، بەتایبەتیش لە نێو توێژی قوتابیاندا سووك كرد. سیمایەكی لیبراڵانەو دیموكراسیانەی لە خۆی نیشان دەدا. بەڵام ئەم ئاراستە لیبراڵییە كە كێبڕكێی لەگەڵ هێزەكانی تردا دەكرد لەسەر هەڵگرتنی بەهاكانی دیموكراسیو دژایەتی دیكتاتۆریەت و پاوانكردنی سیاسی، لە ساڵی (١٩٧٧)ەوە ئاڵوگۆڕێكی گەورەی بەسەردا هات. بە

---

[1] الأسلاميون و نظام الحكم الديمقراطي، اتجاهات و تجارب، لا٣٠٦.

پێـچەوانەی چـاوەڕوانییەکانو مێـژووی سیاسـیان لـەو سـاڵەوە بوونـە هاوپەیمانی (نومەیری) کە لەڕێی کودەتای سەربازییەوە دەسـەڵاتی لـە وڵاتدا بە دەستەوە گرتبوو[1]. ئەمەش بەشێکی لە بێ متمانەیی بە پارتە تەقلیدییەکانو مەترسی چەپەکانو لاوازی خۆیەوە سەرچاوەی گرتبوو، هاوکاریشی لەگەڵ ئەو هێزانەش لە رابردوودا، هاندەر نەبوو. هـەر بۆیـە داوای کرد سەرجەم هێزەکان لە چوارچـێوەیەکی هاوبەشـدا کۆببنـەوە. بەڵام ئەوەش سەری نەگرت، ناچار بیری لە بەهێزکردنی پێگە ئـابوریو سیاسـیو سەربازییەکانیـشی کـردەوە. لێـرەوە کەوتـە دروسـتکردنی چەندەها روکاری قوتابیانو لاوانو ئـابوریو خێرخوازیانـە. رێکخـستنی تایبەتیشی دروستکرد. کە کاری ئیشکردن بـوو لەسـەر دارایـی و هێـزە ئاسایشیو سەربازییەکان. کـە بەشـی زۆری سـەرکردایەتی حیزبەکـەش ئاگایان لە چالاکیو وردەکاری ئیشکردنی ئەم دەزگایە نەبوو[2]. هەڵبـەت گەیشتنە دەسەڵات بە هەر نرخێك بووە، با لەسەر حـسابی ئایـدۆلۆژیاو بەهاکانیش بێت، گەورەترین هەڵەی سیاسیو ئەخلاقی بـە جوڵانەوەکـە کرد، کە ئەویش هاوپـەیمانەتی بوو لەگەڵ (جەعفەر نومەیری) دیکتاتۆرو بەرگری کردن لە رژێمەکەیو درێژکردنەوەی تەمەنی بوو. دوای ئـەوەی نومـــەیری لـــە ســـاڵی (١٩٨٣)دا بڕیـــاری پیـــادەکردنی ئەحکامـــەکانی شەریعەتی ئیسلامی دا. لە بەرامبەر ئەوەدا زۆربەی حیزبەکان لەوانەش حیزبـــی (الأمـــة) بەڕێبەرایـــەتی (صـــادق مهـــدی) دژی هەونگاوەکـــە

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا٣٠٧-٣٠٨.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا٣١٠-٣١١.

وەستانەوە. بە حوکمی ئەوەی لە چوارچێوەکەی خۆی دابڕاوەو دەبێتە هـۆی شـێواندنی ئیـسلام[1]. بـەڵام جوڵانـەی ئیـسلامی بـە ڕابەرایـەتی (تورابی) لە دیدێکی (پراگماتی) رووتەوە پشتیوانیان لێ کرد، ئەویش لە سۆنگەی:

(أ) هەر لە زووەوە پیـادەکردنی شـەریعەت یـەکێ لـە دروشـمو داوا بنەڕەتییەکانیان بووە.

(ب) ئیحراجکردنی هێزەکانی تر بەوەی کە پشتیوانی لە بەئیـسلامی کردنی یاساکانی وڵات ناکەن.

(ج) سوود وەرگرتن لە دۆخەکە بـۆ بـەهێزکردنی پێگـەی خۆیـان و نەخشەکێشان بۆ قۆناغی داهاتوو.

ئیسلامییەکان هەموو ئەو رەخنەی لەم رووەوە لێیـان دەگـیرا بـەوە وەڵامیان دەدایەوە کە ئامانجیان پاکو بەرزە، کە ئاراسـتەکردنی وڵاتـە بەرەو ئیسلامی بوون.

هــەروەها بــە ئیــسلامی کردنــی یاســاکانیان بــە دەســتکەوتێکی ستراتیژیو بەدیهاتنییەکێ لە ئامانجەکانی خۆیان دەخستە ڕوو، پێیـان وابـوو ئەمـە بەرهـەمی هاوپەیمانیەتیانـە لەگـەڵ نومـەیری[2]. بـەڵام ئـەم دەستکەوتە تێچوونی بـۆ ئـەوان یـەکجار زۆر بـوو، چـونکە لـە تەمـەنی رژێمە سەربازییە نادیموکراسییەکەی نومەیریان درێژکردەوە و بەرگێکی

---

[1] الأسلاميون و نظام الحكم الديمقراطي، اتجاهات و تجارب، لا٣١١-٣١٢.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا٢٢٣-٢٢٤.

ئاینیان بە بەر رەفتارەکانیدا کردوو رەوایەتییەکی ئیسلامی وایان پێ بەخشی کە هەموو دژایەتی کردنێکی نومەیری‌و رژێمەکەی وێنەی دژایەتی ئیسلام‌و شەریعەتەکەی لێ بگیرێت[1]. نومەیریش لەم چوارچێوەدا تەنانەت راگەیاندنی باری لەناکاویشی دەبەستەوە بە ژیاننامەی پێغەمبەرەوە و بە ئیسلام پاساوی دەدا[2]. ئەوەی جێگای تێرامانیشە هەڵوێستی (حەسن تورابی) و ئاستی بوێری پاساودانی کردەوەکانی نومەیری بوو. تورابی لەم رووەوە گەیشتە دۆخێ جێگای باوەڕکردن نەبێت، بە جۆرێك لە وتارێکیدا لە شاری (ودمدنی) نومەیری بە تازەکەرەوەی ئاین لەو سەردەمەدا وەسفیکردو لە قەڵەم دەدا؟!.

پاساوی زیادەڕەوکردنی لە دەستبڕینی خەڵکیش لە میانەی راگەیاندنی باری لەناکاو لە ساڵی (١٩٨٤)دا دەدایەوە و بە زەرورەتێکی ئیسلامی وەسفی کرد بۆ پارێزگاری کردن لە رژێم[3].

هەڵبەت سەرەڕای هەموو ئەم شتانە نومەیری پێش کۆتایی هاتنی رژێمەکەی لە جوڵانەوەی ئیسلامی هەڵگەڕایەوەو لە پۆستەکان دەری کردن‌و بەشێ لە سەرکردەکانی خستە زیندانەوە.

---

[1] الأسلاميون و نظام الحكم الديمقراطي، اتجاهات و تجارب، لا٢٢٤.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا٢٢٥.

[3] هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا٢٢٤

تـورابی لـەدوای روخـانی رژێمەکـەی نومـەیری هـەوڵی پاسـاودانی هاوپەیمانی جوڵانەوەکەی لەگەڵیدا دەداو دەڵێت: "بەشداری کردنـی رژێمـێ کـە بـە گەنـدەڵکاری و سـتەم نـاوزەد دەکـرا، لەسـەر شـانی جوڵانەوەی ئیسلامی یەکجار قورس بوو، ئەو تێکەڵییە ئازاری ناوبـانگی بانگـەوازی دەداو دەرگـای بـۆ تانـەو تەشـەر و هێرشـی نـەیاران دەکردەوە..ئەوەی پاڵی بە ئێمەشـەوە نـا بـۆ ئـەو کـارە زەرورەتێکـی ستراتیژی بوو، کە نەدەکرا لەبەر نەیارەکان بەڕوونی باس بکرێت"[1].

ئـەوەی گـرنگ بێـت لـە خوێندنـەوەی رەوتـی گەشـەکردنو جـۆری مامەڵـەی جوڵانـەوەی سیاسـی ئیـسلامی سـوداندا، کودەتـاکردنی بـوو بەسەر ژیانی دیموکراسی دا، جوڵانەوەکـە گەرچـی بەشـێکی دانـەبڕاوی دیمەنو ژیانی سیاسی وڵاتەکەی بوو، کەچی دوای دەیان ساڵ لە سـاڵی (١٩٨٩)دا نەخـشەی کودەتایـەکی سـەربازی کێـشا، کودەتـای بەسـەر حکومەتێکی هەڵبژێراودا کرد، لـەڕێی هێـزەوە پـاوانی دەسـەڵاتی کـرد، بـەوەش قۆنـاغێکی نـوێی لـە ژیـانی خـۆی و گـەلی سـودانو تاڕادەیـەك ناوچەکەش دەست پێکرد.

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢٦.

## کێشەکانی بە ئیسلامی کردنی ژیان و کۆمەڵگە

جولاّنەوەی ئیسلامی سودان وەك یەکەم جولاّنەوەی ئیـسلامی سـوننی لـە ناوچـەکەدا، دەسـەڵاتی گرتەدەسـت، لەسـەر بناغـەی ملکەچـکردنی تـەواوی دامو دەزگـاو دامـەزراوە و دەسـتەکان بـۆ ئـەحکامو بـەهاکانی ئیسلام. بە جۆرێك قورئانو سوننەت ببێتە سەرچاوەو پێـوەرو دیـدگا بـۆ سیاسەتو ئەرکو شێوازەکانی کـارکردنو بەسـتنەوەی هـەموو ئەمانـە بـە مەبەستەکانی شەریعەتەوە[1].

جۆری گەیشتنە دەسەڵاتی جولاّنەوەکە ئەو دەرفەتەی بـۆ رەخـساندبوو، کە بە تەنها خۆیو بەو جـۆرەی دەخوازێـت، بڕیـار بـداتو دەسـت بکـات بـە پیـادەکردنی شـەریعەتی ئیـسلامی، کـە نـاوی پـرۆژەی ژیـاری (المـشروع الحضاري)یان لێ نابوو. پرۆژەکە وەکو پێشتر لە کارنامـەی بـەرەی ئیـسلامی نەتەوەیی دا هاتبوو، پشتی دەبەست بە ((سەروەری ئیـسلام وەك عەقیـدەو شەریعەت. عەقیدەیەك سیاسەتکردن بکاتـە خوداپەرسـتی و رزگـاری بکـاتو دابیبڕێت لە ململانێـی زۆرداری، وە شـەریعەتێك ببێتـە رێبـاز بـۆ پـەروەردەی تاك و رێکخستنی کۆمەڵگەو بنیاتنانی دەوڵەت)) کـە سیاسـەتگەلێك بـوو بـە (ئیسلامی کردن) ناوزەد کرابوو، سێ توخمو پێکهاتەشـی لـە خـۆی دەگـرت: (تأصيل) و (تمكين) و (جهاد)[2]. کە بە کورتی لە خـوارەوە ئامـاژە بـە واتـاو مەبەست لە هەریەك لەو سێ چەمکەی سەرەوە دەکەین[3].

---

[1] الأسلاميون و نظام الحكم الديمقراطي، اتجاهات و تجارب، ل٣٦١.

[2] دستور الجبهة الأسلامية القومية، الأهداف السياسية و الدستورية، المادة/١.

[3] شمس الدين الأمين/ تجربة الأسلاميين السودانيين في الحكم تطبيق الشريعة في فـضاء متعـدد ثقافيـاً و دينياً و أثنياً، ضمن كتاب الأسلاميون و الحكم الديموقراطي، ص٣٦١-٣٧٩.

## یەکەم: رەسەنسازیی (التاصیل)[1].

جولانـەوەی ئیـسلامی سـودان ئـەم چـەمکەی بـەم جـۆرە پێناسـە کردووە: ((بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی دەوڵەتو کۆمەڵگەو کۆی ژیان بە گـوێرەی ئیجتیهـادکردنێکی دەسـتەجەمعی هـەڵگوێزراو لـە بنـەماکانی ئیسلام بۆ چارەسەرکردنێکی زانستیانەی پێشهاتووەکانی واقیع)) واتە هەوڵدان بۆ بـە ئیـسلامی کردنـی کـۆی دامو دەزگـا گـشتییەکانو کایـە جۆراوجۆرەکانی ژیانو کۆمەڵگە. بۆ ئەم مەبەستەش رەوتەکە لە ساڵی چـــوارەمی حـــوکمڕانی خۆیـــدا. وەزارەتێکـــی بـــەناوی وەزارەتـــی نەخشەکێشانی کۆمەڵایـەتی دامەزرانـد. مەبەسـت تیایـدا نوێکردنـەوەو گۆڕینی هەمەلایەنەی کۆمەڵگە بوو بە گوێرەی بنەماکانی ئیسلام لـەڕێی نەخشەکێشانێکی ناوەندیو سەرپـەرشـتی راسـتەوخۆی دەوڵـەتو دامو دەزگاکانییەوە.

### ١. رەسەنسازیی ژیانی تایبەت:

پێواژێکـە سـەرجەم رواڵـەتو کایـەکانی ژیـانی گرتـەوە، بـە بـواری تایبــەتیو ژیــانی تاکــە کەسیــشەوە: لــە پــەروەردەو پاککردنــەوەی دەروونی، بەرپاکردنی دروشمەکان لە نوێـژو رۆژوو حـەجو زەکـات، بـە جۆرێك ببنە ئامرازی چاکسازیو گۆڕانی کۆمەڵایـەتی. دامو دەزگایـەکی زۆر خرایە خزمەت ئەم پرسەو هەزاران رێکخراو و کـەناڵی جۆراوجـۆری بۆ دروستکرا.

---

[1] وشەی (رەسەنسازیی)م بەرامبەر (تأصیل) داتاشیووە، نازانم چەند لە ناوەرۆکەکەی نزیك بوومەتەوە؟.

### ٢. ڕەسەنسازیی فێرکردن:

دەوڵەتو جوڵانەوەی ئیسلامی لە سۆنگەی هەستکردنیان بە ڕۆڵی هەستیاری فێرکردن، گرنگییەکی زۆریان بە زۆرکردنی ژمارەی قوتابخانەو زانکۆکاندا. پرۆگرامەکانیان بە جۆرێك داڕشتەوە (عەقیدە) ببێتە تەوەرەی ژیانو پێگەیاندنی نەوەیەکی نوێی باوەڕداری ڕاستەقینە، نەوەك ببێتە خاوەن کەسێتییەکی جیاواز لەنێو تێکڕای گەلانداو ئەرکی بنیاتنانی سودانی دواڕۆژ بگرێتە ئەستۆ.

هەموو پرۆگرامەکان بەجۆرێ داڕێژرانەوە لە ڕوانگەی خۆیانەوە بخرێنە خزمەت ئیسلامو روانگەو جیهانبینی ئیسلامی. فەرمانگەیەکیش لە وەزارەتی خوێندنی باڵا بەناوی (فەرمانگەی ڕەسەنسازیی زانستی) دامەزراو گۆڤارێکیشی بەو ناوەوە دەرکرد. روانـدنو قوڵکردنەوەی عەقیدە و ناسنامەی ئیسلامیش لای نەوەی نوێو پەروەردەکردنی لەسەری، کردە یەکێ لە مەبەستە بنەڕەتییەکانی پەروەردە.

قورئان لەبەرکردن لە پرۆگرامەکاندا چەند قات کرایەوە. هەروەها مەسەلەی جیهادی پێغەمبەر (د.خ) و هاوەڵانی زەق دەکرایەوەو پانتاییەکی زۆری پێ دەبەخشرا. هەموو ئەوەش دەبەسترایەوە بە واقیعی سودانەوە، چونکە هەر لە بنەڕەتەوە بەشێ لە ئامانجەکانی ئەم بە ئیسلامی کردنەی فەزای خوێندن بەو جۆرە سەلەفیو ڕاستەوخۆیە، پەیوەندی بە جەنگی باشوری سودانو ئامادەکردنی قوتابیانەوە بوو بۆ بەشداری کردن لە جەنگەکەدا.

جگــە لــە بەتــەوەرەکردنی مەســەلەی (عەقیــدە) لــە بەرنامــەکانی پەروەردەو فێرکردن و بەستنەوەی بە چەمکی (جیهـاد)ەوە، بەشـێکی تری سیاسەتەکانی بە ئیـسلامی کـردن لـەم کایـەدا پـەیوەسـت بـوو بـە هەڵبژاردنی پۆشاکی سەربازی بۆ قوتابیان، ناولێنانی قوتابخانەکان بوو بە ناوە ئیسلامییەکان تەنانەت لـەو ناوچـانەش کـە زۆرینـە ناموسـڵمان بوون!! بەشێ لەوەش بۆ باڵادەستکردنی رۆشنبیری عەرەبی ئیـسلامی بـوو. کـە ئـەوەش لەگـەڵ واقیعـی فـرە کولتـوری و ئـاینی سـودان و بەتایبەتیش باشوردا نەدەگونجا.

### ٣. رەسەنسازیی یاساکان:

ئەم پێواژە هەر لە ساڵی (١٩٨٣)و سەردەمی نومەیرییـەوە دەسـتی پێ کردبوو. سـاڵی (١٩٩١) دەسـەڵاتی ئیـسلامی وڵات یاسـای سـزادانی دەرکـرد. کـە حوکمـەکانی (حـدود)ی بـە حـوکمی لـە ئـاین هەڵگـەڕاوە (ردة)ەشـەوە لـەخۆ گرتبـوو. هەنـدێ مـاددەی تـریش کـە رێگـەی بـە لەسێدارەدانی منداڵو بەساڵاچـوو، لەچوارچـێوەی چـەمکی (قـصاص)و بەگوێرەی شەریعەت دەدا، هەندێ کەس بە سزاکانی (دزی) (جەردەیی، خراپە) بە دەستبڕین و قاچو دەستبڕینی پێچەوانە، لە ویلایەتی دارفور سـزا دران... بـەڵام سـزای زینـاکردن قامـچی لێـدان بـوو، کـە زۆرتـرین سزادان بە قامچی بوون بە جۆرێـك لـە سـاڵی (٢٠١٠)دا گەیـشتە قامـچی کـاری (٤٣) هــەزار ئـافرەت... بەشــی لــەم یاسـایانە پەیوەنـدی بــە ئافرەتانەوە هـەبوو، کـە ڕەنگدانـەوەی دیـدێکی فیقهـی تەقلیـدی بـوو،

فـشاری بـۆ سـەر ئـەم توێـژەی کۆمەڵگـە دروسـت دەکـرد... یاسـاکان کارکردنی ئافرەتی لەو شوێنانە قەدەغەکرد کە مەترسی بۆ سەر ژیانیان دروست دەکات، یاخود مانەوە بۆ کاتێکی زۆر لە دەرەوە دەخوازێت.. یاسایەکیـــشی تیـــابوو دەربـــارەی جـــلو بـــەرگی (ئابڕووبـــەر) کـــە دیاریکردنەکەی بۆ پۆلیس بەجێ هێڵرابوو... هـەروەك یاسـاکان هـەموو ئـەو ژنانـەی بـە سـزای زینـاکردن سـزا دەدا، کـە سـکاڵای لاقـەکردن (اغتصاب)کردنیان بکردایە، هـەروەها ڕێگـەیان بـە بەشـوودانی منـاڵ و شێت دەدا، گەر بە بەرژەوەندی بزانرێت. پۆشاکی شەرعی ئافرەتان (لە ڕوانگـــەی دەوڵەتـــەوە) بەســـەر هـــەموو داموو دەزگـــا گـــشتییەکان و قوتابخانەکانی کچاندا سەپێنرا.

٤. **ڕەسەنسازیی ئابوری:**

لـــەم بـــوارەدا کـــار لەســـەر دووبـــارە ڕێکخـــستنەوەی زەکـــات کـــراو دەزگایەکی تایبەت بە خۆی بـۆ دامـەزرێنرا. مامەڵـەکردن بـە (سـوود) قەدەغە کرا، حکومەت رووی کردە ئابوریيـەکی (رەیعـی)و بـە تایبـەتی کردنـی بەشـێ لـە خزمەتگوزاريیـەکانو کـەرتی گـشتی بـەو جـۆرەی ســـندوقی دراوی نێودەوڵـــەتی دەیخوازێـــت. بـــەڵام نـــەیتوانی نـــە جێگرەوەیەکی روونی ئابوری پێشنیار بکات نـە کەرتـە ئابورییـەکانیش پێش بخات.

### ٥. ڕەسەنسازیی ڕاگەیاندن:

دەسەڵاتی ئیسلامی بایەخی زۆری بەم بوارە دا بۆ باڵادەستکردنی کولتوری ئیسلامی بەسەر کۆمەڵگەدا بایەخی بنەڕەتی بە مەسەلە خۆجێیەکانو قورئانو لێکۆڵینەوە ئیسلامییەکانو زمانی عەرەبی دەدا، لە ٣٥ ی بەرنامەی ڕادیۆ کرا بە بابەتی ئیسلامی لە (تەفسیر) و (فقه) و.. تد. تەلەفزیۆنیش کرا بە شاشەیەك بۆ ڕەسەنسازییو پروپاگەندەی فیکریو هاندانی گیانی جیهادو سازدان بۆ شەڕی باشور.

### ٦. ڕەسەنسازیی دەستوور:

دەستوری سودان لە ساڵی (١٩٩٨)دا لە ماددەی (یەك)یدا هاتبوو: ئیسلام ئاینی زۆرینەی دانیشتوانە. زمانی عەرەبیش زمانی فەرمی وڵاتە... لەماددەی (٥)یش هاتبوو: حاکمیەت (الحاكمية) بۆ خودای بەدیهێنەری مرۆڤە، سەروەری بۆ گەلە کە وەك خوداناسی مومارەسەی دەکات... ماددەی (٧)یش باس لە جیهاد دەکات کە (واجب)و ئەرکێکی ئیسلامییە.. هەندێ ماددەی تریش باس لە پاککردنەوەی کۆمەڵگە دەکات لە مەیخۆریو ڕەفتارە دزێوەکان، وە ئەوەی کە بەپشتیوانیو برایەتی لە ڕێی دەستگرتن بە پەیمانی خواوە ناوزەد کرابوو ماددەی (٦٥) تایبەت کرا بەوەی شەریعەتو کۆدەنگی ئوممەت دوو سەرچاوەی یاسادانانن... ماددەی (١٨)ش ئەرکی ئەوانەی لە دەوڵەتو دامو دەزگاکانیدا کار دەکەن بەم جۆرە کورت کردۆتەوە و دەڵێت: "کارمەندانی دەوڵەتو ژیانی گشتی کارو دەزگاکان ملکەچی

پەرستنی خوا دەکەن، موسڵمانان هۆگری قورئانو سوننەت دەبن، هەمووان نیازی دینداری لە دڵیاندا هەڵدەگرن. ئەو گیانەش لە نەخشەو یاساو سیاسەتو کاروبارە فەرمییەکانو بوارە سیاسی و ئابوریو کۆمەڵایەتیو رۆشنبیرییەکاندا رەچاو دەکەن. بۆ پاڵپێوەنانی ژیان رووەو ئامانجەکانی و دیسپلینکردنی بەرەو دادپەروەریو سەر ڕاستی، لە پێناو گەیشتن بە رەزامەندی خودا لە دوارۆژدا ؟!.

## دووەم / توانستگەری یاخود (التمكين)[1]:

ریشەی ئەم چەمکە دەگەڕێتەوە بۆ ئایەتی: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ۚ يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا ۚ وَمَنْ كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾

مەبەست لەم چەمکە بە دەسەڵات گەیشتنی حیزبە بە جۆرێك کەسی تر لە گەڵیدا بەشدار نەبێت. واتە سەرەداوی کۆی دامو دەزگاو بڕیارو داڕشتنی سیاسەتەکانی کۆمەڵگە بەدەست خۆیەوە بێت. بۆ ئەوەی بەو جۆرەی دەیخوازێت و ئایدۆلۆژیاو تێگەیشتنە ئیسلامییەکەی داوای لێ دەکات، بەڕێوەیان بباتو ئاراستەیان بکات. بۆ ئەم مەبەستەش (٣) ئامانجی دیاریکرد:

---

[1] توانستگەری نووسەر بەرامبەر ( تمكين) دایتاشیوە.

(١) بچوککردنەوەی دامو دەزگاکانی دەوڵەت.

(٢) پاکسازییکردنی هەموو ئەو فەرمانبەرو بەرپرسانەی لە کـەرتی گشتیدا کار دەکەن و پێناسەی (نـەیار)یـان بەسـەردا دەبڕێـتو لەگـەڵ سـتراتیژی جوڵانـــەوەی ئیـــسلامی دا بـــۆ جـــۆری بـــەڕێوەبردنی کـــۆی جومگەکانی دەوڵەتداو دەسەڵات ناکۆکن.

(٣) دووبـــارە دارشـــتنەوەی دامەزرانـــدن لـــە کـــەرتی گـــشتیو فەرمانگەکانـــدا بـــەو جـــۆرەی ئامانجـــەکانی جوڵانـــەوەی ئیـــسلامی دەیخوازێت.

ئەم هەنگاوانەش تەنها گرتنە پێشی هەندێ رێکاری ئاسـایی نـەبوون لەلایەن دەسەڵاتەوە، بەڵکو رەگو ریشەیەکی قـوڵتری فیکریـان هەیـەو پەیوەستە بەبنەما فیکرییەکانو پرۆژەی جوڵانەوەوی ئیسلامی نوێ بۆ شێوازی حوکمڕانی، کە پشت بەدوو پایە دەبەستێت:

(١) بە تەوەرە کردنی شەریعەت بۆ دەوڵەتو کۆمەڵگەو کۆی کایەو رواڵەتەکانی ژیان.

(٢) بەڕێوەبردنی دامو دەزگاکانی دەوڵەت لەلایەن کەسانی دڵسۆزو فیکریی، کە لە چوارچێوەی ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێو رێکخستنەکانی جوڵانەوەی ئیسلامی دا پەروەردە کرابن، ئەوانەی ئەهلی دادپەروەریو دەستپاکیو سەرسپێریو دڵسۆزین، بەشـێ لـە مانـای ئیـسلامی بـوونی دەســـەڵاتیش بـــە دەســـتەوەگرتنی دەســـەڵاتو بـــەڕێوەبردنی دامو دەزگاکانی دەوڵەتە لەلایەن ئەوانەوە.

دیــاره ئەمــەش لــە ســۆنگەی کــەم شــارەزاییو ســنورداری توانــا ئیسلامییەکان زۆر جار دەبێتەوە بە پێوەرکردنی پێوەرە حیزبییەکان و دیاریکردنی کەسانی نالێهاتوو کار کردن بە رێسای (الولاء قبل الكفاءة)، واتە پـێش لێهـاتوویی پابەنـدیی مەرجـە، کـە هـەر ئـەوەش هۆکـارێکی سەرەکی داڕوخانو گەندەڵیو ناکارایی ئیدارییە. ناردنە ماڵەوەی دەیان هەزار کەسو خانەنشینکردنیشیان لەلایەن دەسەڵاتی نوێی سودانەوەو پڕکردنــەوەی شــوێنەکانیان بــە کــادرو لایــەنگرانی خۆیــان، وەك لــە داهاتوودا بینرا، سودانی بەرەو لێواری داڕووخان برد.

**سێهەم**: جیهاد:

یەکی لـە کلـۆڵیو کێـشەکانی ئـەزموونی ئیـسلامخوازانی سـودان لـە دەسـەڵاتدا، پەیوەسـتە بـە جـۆری تێگەیـشتنو مامەڵـەکردنیان لەگـەڵ چەمکی (جیهاد)دا، ئـەوان لـە پـێش دەسـەڵاتدا زیـاتر ئـەم چـەمکەیان دەبەستەوە بە دژایەتی ستەمکاری سیاسیو خۆسەپاندن و زەوتکردنی ئیرادەی گەلەوە.

بەڵام دوای بـە دەسەڵاتگەیـشتنیان بەسـتیانەوە بـە میکانیزمـەکانی پیادەکردنی دەسەڵاتو جۆری بـەڕێوەبردنی شـەڕو ململانێکـان لەگـەڵ باشـوور و بزوتنــەوە چـەکدارییەکەیان. هـەر ئـەوەش رەهەنـدی نـوێی خوێناویو نێودەوڵەتی خستە سەر کێشەکەیان.

دەســـەڵاتی ئیـــسلامی وڵات هێـــشتا ســـاڵێك لـــە حوکمڕانیـــدا تێنەپەڕانـدبوو، بــە مەرسـومێکی کۆمــاری (یاســای بــەرگری میللــی)

دەرکـرد. بـە گـوێرەی یاسـاکەش یەکـەم سـەربازگە بـۆ مەشـقپێکردنی ئەندامانی جوڵانەوەی ئیسلامی کرایـەوە بـە ئامـانجی بەشـداریکردن لـە جەنگەکانی باشووردا، ئەم پرۆسەیە دوای بۆ خەڵکانی ئاسایش گشتگیر بـوو، بـەجۆرێك تـا سـاڵی (٢٠٠٤)و ئـاگربڕ، دەیـان هـەزار قوتـابی لـە قوتابیـانی زانکـۆ و پـەیمانگاو تـا قوتـابی ئامـادەییو دەرچـووانو پیشەوەران رەوانەی سەربازگەکانی مەشقپێکردن کرد[1].

بەشێ لە پێگەیاندن و ئامادەکردنی فیکریش لە سەربازگەکاندا (بابی جیهاد) دەبەست بەو جۆرەی لە مەنزومەی (فقهی) تەقلیدیو سەلەفیدا هاتووە، خەڵکی بە ناوی بەشداری لە شەڕێکی ئاینیو (جیهـاد)دا تـەیار دەکرانو رادیۆ و تەلەفزیۆن و رۆژنامەکانیش شـەو و رۆژ بانگەشـەیان بۆ (جیهاد) لەڕێی خوادا، لە رێی بەشداری لە شەڕی باشووردا دەکرد!

ئەو نامانەی جەنگاوەرانیش لە بەرەکانی شـەڕەوە دەیاننوسـی، بـە نیمچە تێکڕایی ئەو دروشمەیان لە خۆگرتبوو کـە دەیـووت: (چ جـوانیو بەرزییە جەستەکانی خۆمان بکەینە بەردەباز بـۆ ئـەم ئاینـە) گـۆڕینی سروشتی جەنگەکەش بۆ (ئـاینی) و تێکـەڵکردنی بـە چـەمکی (جیهـاد) وای کـرد کەنیـسەی جیهـانی زیـاتر بێتـە سـەر خـەتو رەوایـەتی بـە دەستێوەردانی زیاتر بدرێتو باشورییەکان پشتیوانی زۆرتریان بۆ پەیدا

---

[1] ساڵی (٢٠١٣) لە (خرطوم)ی پایتەختی سودان پرۆفیسۆرێکی ئەندام لە جوڵانەوەی ئیـسلامی سوداندا بە ناسۆرەوە پێی وتم: لە شەڕەکانی باشووردا (٢٧٠٠٠) بیستو حەوت هەزار رۆڵـەی جوڵانەوەی ئیسلامی تیاچوون، کە لە وەزیرەوە تاکو بەردەستی تیا بوو.

ببێت، بۆ ئەوەی بنمیچی داخوازییەکان بۆ ئاستی مافی چارەنووس و جیابوونەوە بەرز بکەنەوە.

ئەم لەسەر وەستانەمان لە سەر سودان بە پێویست زانی بۆ ئاگاداربوون لە دۆخێك کە جوڵانەوەیەکی ئیسلامی دەگاتە دەسەڵاتو لەڕێی میکانیزمەکانی ئەوەوە، دەخوازێت دروشمو بنەما فیکرییەکانی وەربگێڕێتە سەر بەرنامەیەکی حوکمڕانی و دووبارە داڕشتنەوەی ژیانو کەسێتیو کۆمەڵگەو ئەو کێشەو کەلەبەرانەی لێی دەکەوێتەوەو ئەو چارەنووسەی رووبەڕووی دەبێتەوە.

لەدوای ئەم پێناسە گشتییەی ئەزموونی جوڵانەوەی ئیسلامیش لە سودان حەز دەکەم لە چوارچێوەی خوێندنەوەی ئەم ئەزموونەو پەیوەست بە بابەتەکەی خۆمانەوە، دیدی خۆمان لەسەر کێشە فیکریو مەیدانییەکانی لە دووتوێی چەند خاڵێکدا کورت بکەینەوە و بخەینە ڕوو.

## پەندەکانی ئەزموونی دەسەڵاتداریّتی جولانەوەی ئیسلامی سودان لە چوارچیّوەی چەمکی دەوڵەتی ئیسلامی دا

رەنگە هەموومان زۆر ئاگامان لە دۆخی سودانو حاڵەتی ئابوریو سیاسیو کۆمەڵایەتی ئەو وڵاتە نەبێت، کە دوای (٢٦) ساڵ لە حوکمڕانی ئیسلامییەکانی ئەو وڵاتە گەیشتووە بە کویّ، کە لەڕاستیدا ئەم ئەزموونە بە یەکیّ لە بەرجەستەکەرانی ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێو تێگەیشتنی بۆ دەوڵەتی ئیسلامیو پیادەکردنی شەریعەت لە قەڵەم دەدرێت.

دەتوانین لەڕێی خوێندنەوەی ئەم ئەزمونەی جولانەوەی ئیسلامی سودانەوە، پەنجە لەسەر بەشێکی گرنگ لە لادانو کەلێنو کەلەبەرەکانی فیکرو ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێو ناواقیعی بوونی دابنێین. لە بەشێ لەو بانگەوازانەش تێبگەین کە لە ئێستادا داوای دووبارە بیناکردنەوەی فیکریو رێکخراوەییو سیاسی تەوژمی ئیسلامیو تێپەڕاندنی ئەو جۆرە مۆدێلانە دەکات. هەوڵیش دەدەین سەرنجەکانمان لەم رووەوە لە چەند خاڵێکدا بگوشینو بەم جۆرەی خوارەوە کورتی بکەینەوە:

١. ئەزموونی ئیسلامییەکانی سودان پێمان دەڵێت کە ئایدۆلۆژیاو جولانەوەی ئیسلامی نوێ بە دەست هەژارییەکی فیکری کوشندەوە لەمەڕ ناسینی دەوڵەتی نوێو ناوەرۆکو تایبەتمەندییەکانی دەوڵەتی ئیسلامییەوە دەناڵێنێ. هەر لە (بەننا)وە تا (مەودودی) و (سید قطب) و (قەرزاوی) و (تورابی) هەست بە بۆشاییەکی فیکریو پرسیاری

جۆراوجـــۆری بـــێ وەڵام لــــەم رووەوە دەكرێـــت.. خـــستنەڕووی ئیـــسلامییەكان بـۆ دەوڵــەتی ئیـسلامی هاوشـێوەی شـاری فەزیلــەی فەیلەسـوفە تۆباویـەكانو دۆخـی نادەوڵـەتی كۆمۆنیزمـە، كـە تیایـدا سەرچـاوەكانی ململانـێو لەوێـشەوە خۆپەرسـتیو چاوچـنۆكی مـرۆڤ وشكاییان دێتو هەمووان لەكاتێكدا بـۆ خۆیـان دەژیـن بـۆ ئـەوانی تـر دەژین!! ئەوەندەی سەرنجم لەم چەمكە دابێت ئەم دروشمـە هێنـدەی بۆمژدەپێـدانو تـەییاركردنو سـازدانە، بـەو ئەندازەیـە بـۆ پیـادەكردن نییـە. چـونكە لـە روانگـەی بانگەشـەكەرانییەوە دەوڵـەتێكی ئـەخلاق مەدارە و تیایدا مـرۆڤ هەسـت بـە قوڵاییـیەكانی كەرامـەتو مرۆڤبـوونی خۆی دەكات. بە كورتی وێنـاكردنێكی دنیایانـەی سووكە بەهەشـتێكە. باخچەیەكی دنیایی باخچەكانی بەهەشتە.

مەگـەر بەهەشـتیش شـوێنێ نییـە بـۆ گەیـشتن بـە خـوداو كـەماڵو چێژەكان؟

ئــەم دەوڵەتــە لەڕاسـتیدا هــەروەك توێـژەرو بیرمەنـدی بـەناوبانگی فەلەسـتینی (وائـل حـەللاق) بـۆی چـووە، لەبـەر ئـەخلاقی بـوونی بـەو جۆرەی بانگەشەكارانی لەم چەمكە تێگەیشتوونو لـە ئەدەبیاتـەكانیان دەخوێنرێتەوە، ناواقیعییە[1]. بۆیە هەموو هەوڵی بۆ پیادەكردنی كێشەو قەیرانی سیاسیو ئابوریو تەنانەت دینـیو ئەخلاقیـشی بـەدوادا دێـت.

[1] لەم رووەوە خوێنەر بگەڕێتەوە بۆ (وائل حـلاق/ الدولـة المستحيلة، الأسـلام والـسيادة ومـأزق الحداثة الأخلاقي) وەرگێڕانی/ عمـرو عثمـان، چـاپی سـێهەم، المركـز العربـي للأبحـاث و دراسـة السياسات، بيروت، ٢٠١٥.

لەبەر ئەوەی لەڕاستیدا شتێ نییە جگە لە دووبارە بەرهەمهێنانەوەی فۆرمێکی دەوڵەتی عەلمانی شکستخواردووی ناوچەکە[1]. سەرکردەیەکی ئیسلامییەکانی سودان لەمەڕ ناڕوونی چەمکی ناوەرۆکی دەوڵەتی ئیسلامی لای ئیسلامخوازانی وڵاتەکەی دەڵێت: "پێناسەو روانگەمان بۆ دەوڵەتی ئیسلامی بە دەست ناڕوونیو تەمو مژی زۆرەوە دەیانناڵاند. تێزگەلێك دەربارەی دەوڵەتی ئیسلامیو دامو دەزگاکانیو تەنانەت دامو دەزگاکانی دەوڵەتیش لای ئیسلامییەکان گەڵاڵە نەبووبوو، چ جای باسو خواسو پرسە ئاڵۆزەکانی تری وەك ئابوری ئیسلامی" [2].

٢. پشتبەستن بە خاڵی سەرەوە نابەرچاوڕوونی لە هەمبەر ئەو نموونە لە حوکمڕانی ئیسلامی کە پێویستە بێتە دیو تێکەڵبوونی ئەم پرسە مەعریفیو سیاسیو مێژوویییە، بە فەزایەکی دەعەویو پەروەردەییو سۆزی ئاینیو نەعرەتەی ناسنامەگەرانە، کارێکی کرد، کۆمەڵگەکان ببنە کێڵگەی ئەزموونو تاقیکردنەوە! چونکە ئیسلامییەکان لە (مەودودی)یەوە تا (تورابی) هبەوە دەکرد کە ئەوەی بانگەشەی بۆ دەکەن، کارکردنە لە چوارچێوەی جەبرەکانی دەوڵەتی نوێ بە تێزگەلێکی کۆنو بیرکردنەوەیەکی بەسەرچووی پێش نوێگەرییەوە. بانگەشەیان بۆ سیستمێکی سیاسی دەکرد، کە لە دنیاو هەموو سیستمەکانی تر جیاواز بێت، کەچی هێشتا سیماو

---

[1] ئەبوبەکر عەلی/ دەوڵەتی ئیسلامی فۆرمێکی شکستخواردووی عەلمانی ناوچەکە، گۆڤاری خال ژمارە (٧) تشرینی یەکەمی ٢٠١٦.

[2] الأسلاميون و نظام الحكم الديموقراطي/ ص٣٥٦.

ئاگادارەکانیشی بە تەواوی روون نەبوون!. (بەننا) لەم ڕووەوە لە ڕێی وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارو گومانانەوە کە لە شەقامدا بەرامبەر ئایدۆلۆژیاو بانگەوازو جوڵانەوەکەی دەوروژێنران، هەوڵی دەدا بەشێ لە سیماکانی ئەو نموونە لە حوکمڕانی بخاتە ڕوو کە بانگەشەی بۆ دەکات[1]. مەودودیش بە هەموو توانا تیۆریو فیکرییەکانیەوە هەوڵی تیۆریزەکردنی (تنظیر)ی دەوڵەتی ئیسلامی نوێ دەدا. تورابیش تازە بە تازە باسی لە دامەزراندنی فقهێکی ئیسلامی سیاسی نوێی دەکرد، بە مەبەستی ڕێکخستنی کۆمەڵگەو بەرجەستەکردنی ئیسلام لە چوارچێوەی دۆخە نوێکاندا[2]. هەمووان باس لە بایەخی ئاینیو و رۆحیو یاسایی و سیاسیو نەتەوەیی دەوڵەتی ئیسلامی دەکەن، زۆر بە دەگمەن نەبێت نایخەنە بەر تیشکی پشکنینو رەخنەو هەڵسەنگاندنەوە. بەڵکو وەك پێدراوێکی بان مێژوویی بێگەردو ئامانجێکی نەگۆڕ لە کاتو شوێنە جیاوازەکاندا سەیری دەکەن!!

کاتێ لە ئێستادا دەبینین پۆلێ لە بیرمەندو خودی تێکۆشەرە ئیسلامخوازەکان رەخنە لەم چەمکە دەگرنو گومان لە ئیسلامی بوونی دەکەن، ئاماژەیە بە پێنانە ناو قۆناغی دوای ئایدۆلۆژیاو جوڵانەوەی ئیسلامی نوێ.

دەنا لە بازنەی هەڵگرانی گوتاری دەوڵەتی ئیسلامی دا وەك بەشێکی جەوهەری لە گوتاری بانگەوازو جوڵانەوەی ئیسلامی نوێ لە ناوچەکەدا،

---

[1] لەم رووەوە خوێنەر بگەڕێتەوە بۆ هەردوو بەشەکەی (رسائل الأمام الشهيد حسن البنا).

[2] د. حسن ترابي/ خواطر في الفقه السلامي لدولة اسلامية معاصرة، الطبعة الأولى، ٢٠٠٠،ص٥.

نەك هەر ئەو هەستە رەخنەگرانەو بە خۆداچوونەوانە نابينين، بەڵكو بە پێچەوانەوە، هەست دەكرێت رۆڵێكی پێوانەی (معيار)ی بەم چەمكە دەدرێت و ئەزموونە سياسييەكانی تری جيهان، لەوانەش خۆرئاوای پێ دەخوێنرێتەوە؟!.

بۆ نموونە (تورابی) لەو كتێبەی پێشتر ئاماژەمان پێكرد بە رێبازە فيكرييە تەقليدييە ئيسلامييە باوەكە هەوڵدەدات بيسەلمێنێ، كە نموونەی ئيسلامی لە حوكمڕانی دا كێشەكانی مۆدێلە نوێكانی حوكمكردن تێدەپەڕێنێت!! نموونەی كۆماری ئيسلامی ئێرانيش لەمەڕ دەوڵەتی ئيسلامی ديسان وڵات كردن بوو بە كێڵگەی تاقيكردنەوەی كۆمەڵێ تيزی تاقينەكراوە، ئەوەی ئەم وڵاتەی لە هەندێ رووەوە لە سودان جياكردۆتەوە، پەيوەندی بە ماهيەتی دەسەڵاتەوە نييە، بەڵكو پەيوەندی بە مێژووی ئێران و ئێرانيزم و سروشتی تێكەڵاوبوونی ناسيۆناليزمی ئێرانی و ناسنامەی شيعەگەراييو ئاستی نوێبوونەوەی گەلی ئێرانو قەوارەو توانای وڵاتەكەيە. جگە لەوەی سيستم بەرهەمی شۆڕشێكی جەماوەری نوێ بوو، نەك كودەتای سەربازی. سەرەڕای هەموو ئەوانە لەدوای سەركەوتنی شۆڕشەوە دەست بۆ زۆر ڕێو شوێن برا كە دواتر پاشەكشەی لێ كراو بەشێكی تريشی لە ئێستادا بابەتی رەخنە لێگرتنو قسە لەسەر كردنی بيرمەندە ئێرانييەكانە، بە گشتی دەوڵەتی ئيسلامی لەڕوانگەی ئەزموونەكانی خۆبەخاوەنكردنييەوە لە پێگەی دەسەڵاتدا پێمان دەڵێت: كە نە توانيويەتی ئيلهام لە سەردەمی (راشيدين) وەربگرێتو نە فۆرمی تەقليدی دەوڵەتی پاش ئيستيعمار لە

ناوچەکەدا تێپەڕێنێت. ئەم نموونە لە دەوڵەت نە دەتوانێ بەتەواوی لاسایی خۆرئاوا بکاتەوەو لانی کەم لە هەندێ ئاستدا مانایەك بە بوونو دامەزراوەکانی دەوڵەتی نوێ بدات، لە وێنەی تورکیا، نە (جێگرەوە)یەکی داهێنەرو جیاوازو کاراش بخاتە ڕوو، بە جۆرێ کە دوای چەندین ساڵ دەسەڵاتی جوڵانەوەیەکی ئیسلامی نەك هەر قسەکردن لە سەر ماهیەتی دەوڵەتی ئیسلامی کۆتایی پێ نەیەت، بەڵکو زیاتر گومان لەسەر چەمکەکە بەو جۆرەی ئەدەبیاتی جوڵانەوەی ئیسلامی نوێ خستویەتییە ڕوو، سەرهەڵبداتو بانگەشەکان بۆ پێنانە دوای قۆناغی ئەو بەرزتر ببن.

٣. ئەزموونی ئیسلامییەکانی سودان پێمان دەڵێت: کە هەموو ئەوەی پێی دەوترێت چاکسازی فیکریو سیاسی لە چوارچێوەی هەمان مەرجەعیەتی تەقلیدی ئایدۆلۆژیاو جوڵانەوەو بانگەوازی ئیسلامی نوێ دا بێ سوودە، ئەوەی دەیگۆڕێتو دەستکاریشی دەکات جگە لە ڕواڵەتو شێوازی کارکردن هیچی تر نییە. هەڵگری هیچ ڕەخنەیەکی جدی نییە بەرامبەر بە چەمكو گوتەزا چەسپاوو سەرەکییەکانی ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ، بەڵکو ئەوەی هەیە گۆڕینی بەشێ لە زمانی دەربڕینو دەستپێشکردن لە ئامرازەکانو دووبارە بەرهەمهێنانەوەی چەمکەکانە بەشێوەیەکی نوێو پەراوێز نووسینە. بۆ نموونە لە نێوەندی ئیسلامییەکاندا، (تورابی) بە یەکێ لە عەقڵە کراوەو ڕێبەرە ریفۆرمخوازو بوێرەکانی ناو جوڵانەوەی ئیسلامی نوێ ناسراوە. بەڵام لە فیکرو ئەزموونی سیاسیو کرداری ئەودا دەردەکەوێت، ئاستی

نوێبوونـەوەی فیکـری ئـەو، هـەرگیز شـۆڕنابێتەوە بـۆ ئاسـتی دووبـارە بیناکردنـــەوەی چـــەمکەکانو خوێندنەوەیـــەکی نـــوێ بـــۆ چەســـپاوو ئامانجەکانی جوڵانەوەی ئیسلامیو تێپەڕاندنی بەشێکیان. دوای دەیـان ساڵ لە بانگەشە بۆکردنو خەباتکردن لە پێناویـدا، لەڕاستیـشدا کێـشە فیکرییەکانی ئایـدۆلۆژیاو جوڵانـەوەی ئیـسلامی نـوێ، بەچاکـسازی لـە چوارچـێوەی هـەمان فیکـردا چارەسـەر نابێـت، بـەڵکو پێویـستی بـە دووبارە بیناکردنەوەی فیکریو چەمكو تێـزو چارەسـەرو خوێندنـەوەو نموونەکانە. هەر بۆیە تێگەیشتنی (تـورابی) هـیچ جیاوازییـەکی وای لـە سەرکردە ئیسلامییەکانی تردا نییە، وەك ئەوان بانگەشـە بـۆ ئیـسلامی گشتگیرو هەمەلایەنە، بۆ بە دینی کردنی سیاسەت، دەوڵەتی ئیسلامی، پیادەکردنی شەریعەت،... هتد دەکات.

ئەو سێ پێکهاتە یاخود رەگەزەی دوای بەدەسەڵات گەیشتنیانو لـە چوارچێوەی سیاسەتی بە ئیسلامی کردنەوەی کۆمەڵگـەدا گرتوویانەتـە پێش، واتە رەسەنسازیی (التأصیل).. دەسـت قـایمکردن لـە دەسـەڵات (تمکین) لەگەڵ (جیهاد) گوزارشتدانەوەیەکی نوێی ئەو سێ قۆناغەیە کە (بەننا) بۆ پەروەردەو پێگەیاندنو ستراتیژی کـاری برایـان دایڕشـتبوو. کە ناوی خۆناساندن (التعریف) خۆپێگەیاندنو خۆبنیاتنـان (التکـوین)، دەسـت بـەکاربوونو جێبـەجێکردنی پـرۆژەو بـەدیهێنانی ئامانجـەکان (التنفیذ)ی لێ نابوون.

لای (تورابی)ش هاوشێوەی (بەننا) و (مەودودی) بەدیهێنانی خەونی (دەوڵـەتی ئیـسلامی) و (پیـادەکردنی شـەریعەتی ئیـسلامی) خولگـەو

پاساوی بوونی هەر جولانەوەیەکی ئیسلامییە. ئەوەی تورابی لەم رووەوە لەوان جیادەکاتەوە ئاستی پەنابردنیەتی بۆ فێڵو تەڵەکەو تاکتیكو مانۆڕی سیاسی، سڵ نەکردنەوەی لە پەنابردنە بەر هەندێ شێواز لە وێنەی هاوپەیمانی لەگەڵ دیکتاتۆرێکی سەربازی وەك نومەیریو کودەتا بۆ دەسەلات گرتنەدەستو هاوشێوەکانی. لەگەڵ دەرگا کردنەوەیەکی زیاتر بۆ ئافرەتو بەشداری ناموسڵمانەکان لە دامو دەزگاکانی حکومەتدا، کە ئەوانەش هەمووی پەیوەست نییە بە نوێکردنەوە فیکرییەکانی تورابییەوە، بەڵکو بەشێکی گرنگی دەگەڕێتەوە بۆ قۆناغە مێژووییەکەو واقیعی سودانو پێگەو رێگەی جولانەوەی ئیسلامی ئەو ولاتە لە چوارچێوەی پرۆسەی سیاسی دا.

**چوارەم** / پێداگرتنی زیادو بە شێوەیەکی ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوی داوای دەکاتو لە سودان هەولی پیادەکردنی درا، لەسەر پیادەکردنی شەریعەت، جولانەوەی ئیسلامی دووچاری جۆرەها کێشەو دژ بە یەکیو سەرئێشە دەکاتو لە بەشێ لە ناوەرۆکە سیاسیو ئەخلاقییەکەشی بەتالی دەکاتەوە. ژێرخانی فیکری ئەم بۆچوونەش لە دەستنیشانکردنی هەڵەی واقیعی موسڵمانانی سەردەمو جۆری چارەسەرکردنییەوە، سەرچاوەی گرتووە. کە هەرئەوەش جولانەوەی ئیسلامی نویو ئایدۆلۆژیاکەی لە فیکری ریفۆرمخوازی ئیسلامیی سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستەم لە دنیای ئیسلامدا جیا دەکاتەوە، ئیسلامییە ئایدۆلۆژیستەکان ماکی واقیعی ناهەموارو کێشە کەڵەکەبووانی جیهانی ئیسلام بە دوورکەوتنەوە لە (ئاین)و

پیادەنـەکردنی شـەریعەتی ئیـسلامی دادەنـێن، لەسـەر بناغـەی ئـەم بۆچوونەش چارەسەری ریشەیی‌و هەمەلایەنە لە دووبارە دەستگرتنەوە بـە ئیـسلامدا دەبیننـەوە. دروشمـی (ئیـسلام چارەسـەرە)ش کـە بـۆ چەندین ساڵ، دروشمی ناوەندی جوڵانەوەی ئیسلامی ناوچەکە بوو، لەم قەناعەتەوە سەرچاوە دەگرێت. لەکاتێکدا ریفۆرمخوازەکانی سـەدەی نۆزدە، (استبداد) واتـە زۆرداری سیاسـیان بـە نهێنـی‌و هۆکـاری پـشت دواکـەوتوویی موسـڵمانان‌و شـێواندنی نێـوەرۆکی ئیـسلام‌و پاشەکـشە ژیارییەکەیان دەزانی.

بانگەشە بۆ پیادەکردنی شـەریعەتی ئیـسلامی‌و کردنـی بـە ئامـانجی ئامانجـەکان، بـەڵکو وێنـاکردنی دەوڵـەت وەك ئامرازێـك بـۆ پرۆسـەی پیادەکردنەکەو خزمەتکاری شـەریعەت، لەکاتێکدا دەبێـت شـەریعەت‌و دەوڵەت لە خزمەتی مرۆڤ و کۆمەڵگەدا بـن نـەك بـە پێـچەوانەوە، بـووە سەرچاوەیەکی داخراوی فیکری ئیسلامی نوێ‌و پێکدادان لەگـەڵ رژێـم‌و تەوژمەکان‌و ترساندنی خۆرئاواو، خـستنەڕووی تـەوژمی ئیـسلامی وەك هەڕەشەیەکی جدی لەسـەر بـەها نوێکـان‌و جیهـان‌و تەوژمـەکانی تـری ناوخۆ لە کۆمەڵگەدا.

دوای بەرجەستەکردنی ئـەم دەوڵەتـە لـە کۆمـاری ئیـسلامی ئێـران‌و سودان و ئەفغانستاندا، دەرکەوت کە نەك هەر نابێتە هۆی چارەسـەری کێشەکان، بەڵکو خـراپ لێتێگەیـشتن و پیـادەکردنی و مامەڵـەکردنێکی مادديانـەو یاسـاییانەی رووت دەسـەڵات لـە دەوڵـەتی نوێـدا، دەیکاتـە سەرچاوەی هەندێ کێشەی نوێش. چونکە هەر لـە بنەڕەتـەوە زۆربـەی

هەرەزۆری ئەوەی ناونراوە شـەریعەتی ئیـسلامی بـە دانپیانـانی خـودی بیرمەندە  ئیسلامییەکانو هەڵگرانی ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ زۆربـەی هەرەزۆری زادەی بـیرو ئیجتیهـادی زانـاو شەرعناسـەکانەو مـەرج نییـە حوکمی خودا بێت[1].

فیقهی ئیسلامی بەرەنجامگیریو تێگەیشتنو دابەزاندنو پیادەکردنی موسـڵمانانە لـە چوارچـێوەی واقیعێکـی مێـژوویی دیاریکراودایـەو نـەمر نییە. بەتایبـەتیش کـە لـە ئێـستادا کۆمـەڵگاکان ئـاڵۆز بـوونو گـۆڕانی گەورەیان بەسەردا هاتووەو جۆری بـەڕێوەبردنیانو بەشـداری سیاسـی خەڵكو وەڵامدانەوە بە خواستی ئازادی فیقهێکی نوێ دەخوازێت[2].

حوکمی (فقە)یش یەکسان نییە بە حوکمی خودا، هاوەڵانیش پـەیان بـەو جیاوازییـەی نێـوان (حـوکمی خـودا) و (حـوکمی فیقهـی) بـردووە، (حـوکم) و (ئیجتیهـاد)یـان بـە نـاوی خاوەنەکانیانــەوە نـاو بـردووەو نەیانداوەتە پاڵ خودا، بۆ نموونە وتوویانـە: ئەمـە، ئەوەیـە (عمـر) یـان (أبوبکر) حوکمی پێ داوەو دادوەری پێ کردووە[3].

جوڵانەوەی ئیسلامی نوێ بەبێ هـیچ نوێکردنەوەیـەکی (فیقهـی) کـە خواستێکی وا بە نوێکردنەوە لە (أصول الفقە)دا دێتە دی. بەتایبـەتیش لە ئاستە سیاسییەکەیدا، کە فیقهی ئیـسلامی لـەم رووەوە هـەژارەو لـە

---

[1] دکتور محسن عبدالحمید/ المذهبیـة الأسـلامیة و الـتغیر الحـضاري، الطبعـة الرابعـة، ١٤٢٠هــ، ص٢٠.

[2] حەسەن تورابی، سەرچاوەی پێشوو، لا٤.

[3] د. محسن عبدالحمید/ سەرچاوەی پێشوو، لا٢٠.

مێژووشدا کەم لەسەری وەستاوەو ئەوەی لە کتێبە (فیقهی)یەکاندا لەم رووەوە هەیە بە حوکمی پەیوەست بوون بە واقیعی مێژوویی سنورداری جیهانی ئیسلامیو سروشتی پاساودەرانەی، ناتوانێ لە ئێستادا خزمەتی زۆرمان بکات. تەنانەت توانای ئەوەی نییە زمانێکی دەربڕینی سیاسی نوێی وامان پێ ببەخشێت، ناچار نەبین زاراوە و چەمکە خۆرئاواییەکان وەك تاکە بژاردەی نوێ بەکاربێنن[١]. پیادەکردنی فیقهی ئیسلامیش لەم چوارچێوەدا و لە سایەی لەکارکەوتنی مێژووی ئەحکامە دەستووریو بەها باڵاکانیدا، وا دەکات ئیسلامی بوون هێندەی لە سزادان لەسەر بەرەنجامو دەرهاویشتەکانی خۆی ببێتەوەو بخوێنرێتەوە پەیوەندی بە هۆکاری تاوانو خراپەکانو ریشەی ئەو کێشانەوە نەبێت، کە لە پشت بەشێ لەو تاوانانەوەن خەڵکی لەسەر سزا دەدرێت، بۆ نموونە دەستی دز دەبڕرێت، کە زۆرجار نەگبەتێکی سەرلێشێواوە، بەڵام پرسیاری ئیسلامی ئاراستەی ئەو دۆخە ناکرێت کە لە پشت ناعەدالەتی و هەژاریو نایەکسانی جۆراوجۆری کۆمەڵگاوەیە و سزا نادرێت.

ئەوەی مەسەلەی پیادەکردنی (فیقهی) ئیسلامیش لە کۆمەڵگەیەکی نوێدا بەو جۆرەی لە ئەدەبیاتی جوڵانەوەی ئیسلامی نوێدا هاتووەو لە هەندێ ئەزموونی هاوچەرخدا دەکات بە سەرچاوەی کێشەو پرسیار بەسەر خودی ئیسلامەوە، ئەم خاڵانەی خوارەوەن:

---

[١] د. فوئاد النادی/ سەرچاوەی پێشوو، لا٩-١١.. هەروەها حەسەن تورابی، سەرچاوەی پێشوو، لا٥.

١. سەیرکردنی پیادەکردنو مامەڵە لەگەڵ کردنی لە چوارچێوەی ئایدۆلۆژیاو دەوڵەتێکی هەمەلایەنەی (شمولی)ی نوێدا، کە دەسەڵات لە دەستی گروپێکدا کۆبووبێتەوەو لە سایەی رەتکردنەوەی دیموکراسیو بە دامەزراوەیی نەکردنی بەهاکانی شوراو چاکسازی ئیسلامی بەو جۆرەی دنیا دەیخوازێت، وەنەبوونی هیچ چاودێریو لێپێچینەوە و لێپرسینەوەیەکی راستەقینە بۆ ئەو کەسو دەزگایانەی لێپرسراون لە جێبەجێکردنی.

٢. دابڕانی ئەم پیادەکردنە لە بەها دەستوورییە ئیسلامییەکانو قەتیسدانی لە بواری یاسای تاکە کەسیدا، کە ئەرکی رێکخستنی پەیوەندی نێوان تاکەکانە. کە ئەمە کێشە مێژووییەکەی مێژووی ئیسلامو ئەزموونە هاوچەرخەکانی دەسەڵاتی ئیسلامییەکانو پیادەکردنی شەریعەت پێکدەهێنێت. دابڕانی ئەم دوو بوارە لە یەکتری، واتە بەها دەستوورییەکانی وەکو شورا، دادپەروەری، بەرابەری، ئیسلاح، دژایەتی گەندەڵی، کەرامەتپارێزی، ستەم دژی، لایەنگرانی بۆ توێژە بێ بەشەکانی کۆمەڵگەو هاووێنەکانیان، لە مێژوو واقیعی هاوچەرخیشدا کێشەو تاوانی زۆری لێ کەوتەوە و بە گشتی لە زیاد لە شوێنو کاتێکدا بووە بە هۆی ئەوەی ناوی دەنێم بە پیادەکردنێکی نادادپەروەرانەی (فیقە) و نایەکسانی موسڵمانان لەبەردەم یاساو حوکمەکانیدا.

ئەگەر بەشە دەستوورییەکەی شەریعەتی ئیسلامی ئاماژە بێت بۆ بنەماو بەها باڵاو گشتییەکان و (فیقهی) ئیسلامیش ئەو بەشە لە (فیقە)

بێت کە لە ئێستادا بـە یاسـای تایبـەت ناودەبرێـت و پـەیوەنـدی نێـوان هاوڵاتیان ڕێکدەخاتو لە دادگاکاندا کاری پێ دەکرێت. بەو جۆرەی کـە (د. محسن عبدالحمید) بـۆی چـووە و ئێـستاش هەنـدێ بیرمەنـد کـاری جدی لەسەر دەکەن[1]. ئەوا دەتـوانین ئاسـتی یەکـەم بـە شـەریعەت نـاو ببـەین، چـونکە کورتکردنـەوەی شـەریعەتی ئیـسلامی لـە (فیقـە)داو بارگاوی بوونی (فیقە)یـش بـە سروشـتی جـۆری بەرهـەمهێنانیو زادەی بوونی عەقڵو ئیجتیهادی زانایان لە کاتو شـوێنی جیـاوازدا، وا دەکـات کە ئەم واقیعە کە بە ڕواڵەت شەریعەتی تێـدا بـەرپا دەکرێـت، چـەندین دەرهاویشتەی خراپی لێ بکەوێتەوە، لەوانەش:

١. قەتیسمانی جێبەجێکردنی (فیقـە) بەسـەر خـەڵکی ئاسـایی داو مانــەوەی دەســەڵاتدارو حــوکمڕانو دارودەســتەکەیان لــە دەرەوەی حوکمەکانیدا، کە ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت ئەوەی بە زمانی یاسایی و دەسـتووری نـوێ بـە سـەروەری یاسـاو یەکسانی هاوڵاتیـان لەبـەردەم یاسادا ناودەبرێت، بوونی نەبێت. ئێمە لـە مێـژووی واقیعـی نوێـشدا لـە سایەی لێکدابڕانی شەریعەت لەگـەڵ (فیقـە)دا زۆر کـەم نـەبێت نـابینین دەسەڵاتداران ملکەچی یاسا ئیسلامییەکان بووبن، یـاخود بـە سـەریاندا پیادە کرابێت. سەرەڕای ئەو پرەنسیپە یاساییەی ئیـسلامییە رووتـەی کە سەرجەم موسڵمانان بەرامبەر حوکمـەکانی بـە یەکسانی دەبینێـتو کەسی یەکەمی وڵاتیش لەم رووەوە لە بنەڕەتدا هیچ (امتیاز)ێکی نییە.

[1] دکتور محسن عبدالحمید، سەرچاوەی پێـشوو، لا٢٠.. لـەو بیرمەندانـەش دکتـور (محمـد مختـار الشنقیطي) یە.

٢. (فیقه) دەبێتە ئامرازێکی کۆنترۆڵکردنی سیاسیو کۆمەڵایەتی بەتایبەتیش لە چوارچێوەی دەسەڵاتی نوێدا، هەروەها ملکەچی دەکات بۆ پێداویستییەکانی ئایدۆلۆژیاو خوێندنەوەی فەرمی دەسەڵاتو دەوڵەت بۆ (ئاین)، هەروەها لەڕێی میکانیزمی (فتوا) و تێپەڕاندنی یاساکانەوە دەکرێت بە بەشێك لە ململانێکانو پاساودانی هەندێ لە سیاسەتە نائیسلامی و نادادپەروەرییەکانی کۆمەڵگە. ئەمەش وادەکات بەهۆی هۆکاری خاڵی پێشوو، سروشتی دەسەڵاتخوازی دەسەڵاتدارانو بێلایەن نەبوونیان لە سەر زیاد لە ئاستێکدا جۆرێك لە دابڕان لە نێوان (فیقه) و (ئەخلاق)دا بێتە دی[1]. بۆ نموونە لە چوارچێوەی چەمکی فقهی و دینییەکانی وەك (مفسدون في الأرض) لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا سەرکوتی جوڵانەوەی رزگاریخوازی کوردیو سەرجەم نەیارانی و چەندین دەنگی تر کراوە. لە سودانیش وەك باسمان کرد بە ناوی شەریعەتو پیادەکردنی ئەوەوە جوڵانەوەی ئیسلامی ئەو وڵاتە بەرگری کوێرانەی لە یاسای باری لەناکاوو دەرهاویشتەکانی کردووە!!

٣. لە سەردەمی نوێدا بەزۆر سەپاندنی (فیقە) لەڕێی دامو دەزگاکانی دەوڵەتەوە دەمانخاتە بەردەم چەندەها کێشەی جۆراوجۆر، لەوانەش:

---

[1] بۆ ناسینی سروشتی پەیوەندی نێوان (فقه) و (ئەخلاق) خوێنەر دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ / أبو القاسم فنایی، اخلاق دین شناسی پژوهی در مبانی معرفتی و اخلاقی فقه/ نشر نگاه معاصر، تاران، ١٣٨٩ ك. هـ.

(أ)  لەقاڵبدانی ژیانی تایبەتیو کۆمەڵایـەتی خـەڵكو سـنورداركردنی ئازادییەكانیانو بێبەشكردنیان لـە بەشـێ لـە مافـەكانیان وەك هـاوڵاتی بەهۆی بەیاساكردنی بەشێ لەو حوكمو فتـوا فیقهیانـەی هـی سـەردەمو مێژوویەكی ترنو نـاتوانن وەڵام بـە پرسـیارو چـاوەڕوانییەكانی مرۆڤـی سەردەم بدەنەوە.

(ب) شلەژاندنی رەوتی نوێبوونەوەی ژیاریو پەرەپێـدانی سیاسـیو ئـابوریو كۆمەڵایـەتی كۆمەڵگـە، لــە سـۆنگەی پەرەپێنـەدانی هـیچ تیۆرییەكی (فیقهی) سەردەمانەی واوە، توانای لەخۆگرتنی پێشمەرجو پێویستییەكانی ئەركو ئامانجێكی لەو جۆرەی هەبێت. ئەمەش وادەكات كۆمەڵگە لە هەندێ رووەوە لە جێی خۆیدا بێـتو بـچێتو نـەتوانێ وەك پێویست هەنگاو بنێت.

(ج)  سەپاندنی (فیقە) لەڕێی دەوڵەتەوە وادەكـات (ئیـسلام) لەبـەر چـاوی ملیۆنـان كـەس لـە جیهـانو بەشـێ لـە كۆمەڵگـەی نێوخـۆییو نیشتمانیشدا دووچاری جۆرێك لە شێوانو تۆمەتباركردن ببێت. بـەوەی ئاینێكـە كێـشەی لەگـەڵ ئـازادی تـاك، دیموكراسـی، مـافی ژنـانو كەمینـەكانو مەرجەعیەتـە نێودەوڵەتییـەكانی مـافی مـرۆڤ هەیـەو لـە سـایەیدا ژیـان لـە قالـب دەدرێـتو مـرۆڤ ناتوانـێ وەك ئـەوەی هەیـە، دەیەوێت لە چوارچێوەی یاسایەكی نوێدا گوزارشت لە خۆی بداتەوە. بە كـورتی مەسـەلەی شـەریعەتو (فیقـە) و پیادەكردنیـان لـە زیـاد لـە ئاستێكدا لە سۆنگەی كۆنترۆڵنەكردنی دەسەڵاتو سنوور بۆدانانییـەوە، تێكەڵ بە جۆرەها رواڵەتی نادادپەروەریو ستەمو دواكەوتوویی دەبێت.

چونکە کاتێك مەسەلەی پیـادەکردنی شـەریعەت، لـە خـودی خۆیـدا دەبێـت بـە ئامـانج، واتـە وەك وەسـیلەو ئـامراز سـەیری ناکرێـت بـۆ چەسپاندنی بەها باڵا دەستورییە ئیسلامییەکانی وەك دادپـەروەری، وە ئەگـەر ئـاورێ لـەوەش بدرێتـەوە وە دیـاریکردنی نـاوەرۆکی چـەمکی دادپەروەری لـە پێـوەرە ئیـسلامییەکەو مەرجەعیەتـە هاوچـەرخەکانی دنیا دادەبڕێت، ئەوا ئەم پرسە، واتە پیادەکردنی شەریعەت، تێکەڵ بـە ستەمکاریو گەندەڵیو دیکتاتۆریەت دەبێت. بـەجۆرێك کـە لـە سـایەی عەقلێیـەتێکی میکـافیلی بـە ئـاین پاسـاو دراودا، گـوێ بـە وەسـیلەکان نادرێتو گرنگ ئەوە دەبێت، (فیقە) لـە دادگـا ئاسـاییەکاندا وەك یاسـا کاری پێ بکرێت!!.

هەر بۆیە لە ئـەزموونی ئیـسلامییەکانی سـوداندا ئـەم پرسـە هێنـدە گـەورە دەکرێـتو دەکرێـت بـە دروشمـی ناوەنـدی و خولگـەی کـۆی چالاکییەکان، تـا کـار دەگاتـە ئـەوەی بـە ئاسـایی بـزانن دیکتـاتۆرێکی سـەربازی مەسـەلەی پیـادەکردنی شـەریعەت بوروژێنێـتو ئـەوانیش بەرگری لێ بکەن!! یاخود لە دوای دەسەڵات هەندێ تاوان رووبدات (لە وێنەی تاوانەکانی تایبەت بە جەنگاوەرەکانی جەنجەوید لە دارفۆر) کە نەدەبوو روو بدەن.

دەبێت بوترێت بە داخەوە سودان لە سایەی دەسـەڵاتی جوڵانـەوەی ئیسلامی دا سەرۆکەکەی بـە ئەنجامـدانی تـاوانی جـەنگ تاوانبـارەو بـۆ چـەندین سـاڵیش بـەگوێرەی راپۆرتـەکانی رێکخـراوی شـەفافیەتی نێودەوڵەتی لە نێوان (٣تـا٧)مین وڵاتی گەندەڵی جیهاندا بووە!!

هەموو ئەمەش ئەو وتە بەنرخەی سەعید نەورەسیمان بیر دێنێتەوە کە ئازادیو ژیانی دەستووری دەکاتە پێشمەرجی شەریعەتو دەڵێ: "لا یمكن تطبیق الشریعة الاّ في اطار الحریة".. واتە: پیادەکردنی شەریعەت لە چوارچێوەی ئازادیدا نەبێت ناکرێت و نایەتەدی[1]. ئەم تێگەیشتنە هەموو رەوایەتییەك لە پیادەکردنی شەریعەت لە سایەی دۆخێکی زۆرداری سیاسیو نەبوونی ئازادی دەسەنێتەوە، پیادەکردنی شەریعەتیش لە سایەی ئازادیدا جیاوازە وەك لە سایەی دەسەڵاتێکی هەمەلایەنەی سیاسی نائازادا.

سێهەم/ کێشە لەگەڵ دیموکراسی:

ئایدۆلۆژیاو جوڵانەوەی ئیسلامی نوێ هەر لە سەرەتاوە کێشەی زۆری لەگەڵ دیموکراسیدا هەبووە، هەروەك ئاماژەمان پێکرد (بەننا) بڕوای بە فرەیی سیاسیو ژیانی حیزبی نەبوو، مەودودیش بە هەمان شێوەو دیموکراسی خۆرئاوایی رەتدەکردەوە. لای (سیدقطب)یش بووە دەرکەوتەیەکی نەفامی نوێ، کە دەبێت رەتبکرێتەوە[2].

لەراستیشدا کاتێ فیکرە داڕێژەر (منظر)و رێبەرانی رەوتی ئیسلامی نوێ دیموکراسیان رەتکردۆتەوە، لەگەڵ خۆیانو خەڵکیشدا راستگۆ بوون، چونکە ئەو ئایدۆلۆژیاو بانگەوازەی ئەوان دایانڕشتبوو بانگەشەیان بۆ دەکردو لە چوارچێوەی ئەودا بیریان لە ژیانو ئیسلامو گۆڕانکاریو مۆدێلی سیاسیو حوکمڕانی دەکردەوە، بە حوکمی

---

[1] الأسلام علی مفترق الطریق، رحلة في حیاة و فکر بدیع الزمان سعید النورسي،لا١٠٢.

[2] سید قطب، معالم في الطریق، لا٩٨-٩٩.

هەمەلایەنە بوون‌و نەگونجانی لەگەڵ ناسیۆنالیزم‌و نیشتمانپەروەریتی و دەوڵـەتی نیـشتمانی نـوێ، بـە سروشـتی خـۆی دژبەیـەکی لەگـەڵ دیموکراسیدا هەبوو. لەژێر کاریگەری هەندێ لـە ئایدۆلۆژیا هەمەلایەنـە نوێکانـدا، دووبـارە فیقهـی سیاسـی سـوڵتانی لـە بـەرگێکی نوێـدا داڕشتبۆوە.

(بەننا) سەرەڕای رەتکردنەوەی (شۆڕش) وەك فۆرمێکی توندوتیژ بۆ ئاڵوگۆڕی هەمەلایەنـە، ئەنـدام‌و پـەیڕەوکارانی لەسـەر گیـانی (جیهـاد) پـەروەردە دەکـرد. کاتـێ بزوتنەوەیـەکی ئیـسلامی خـاوەنی ئـەم ئایدۆلۆژیایەش، لە وڵاتێکی دیاریکراودا بـۆ نموونـە سـودان، بەربەسـتی ترس دەشکێنێ‌و وشەی دیموکراسـی دەخاتـە نێـو فەرهـەنگی سیاسـی خۆیەوەو دەشبێتە بەشێك لە ژیانی سیاسی و فـرە حیزبـی وڵاتەکـەی‌و لـەو چوارچێوەشـدا بەشـداری هەڵبـژاردن دەبێـت، ئـەوە واتـای ئـەوە ناگەیەنێت کێشە قوڵە فیکرییەکانی لەگەڵ دیموکراسی یەکلا کردۆتەوە، کێـشەی رەوتـی ئیـسلامی نـوێش لـەوەدا بـوو، پـێش (تـبنی)کردنـی دیموکراسی و خۆیەکلایی کردنەوە لەم رووەوە بەشداری ژیانی سیاسـی کـرد. بڕوابـوونی بـە دیموکراسـی‌و بـەهاکانی لەگـەڵ هێزەکـانی تـر زۆر جیاوازی نەبوو، بەو حوکمەی ئەوەی لە پەنجاکانی سەدەی رابردووەوە دیموکراسـی لای زۆربـەی تەوژمـە فیکـری‌و سیاسـییەکان، یـان وازی لێ هێنرابوو، یـاخود لـە بەشـێ لـە فـەزاو پێویـستییە فیکـری‌و دەروونـی‌و کۆمەڵایەتی‌و دامەزراوەییەکان دابڕێنرابوو، رەوتێکی ئیسلامی لەکاتێکدا سـوور بێـت لەسـەر دەسـتگرتن بـە دروشمـی دەوڵـەتی ئیـسلامی‌و

پیادەکردنی شەریعەتەوە، ناکرێت لەگەڵ (تبنی)کردنی دیموکراسیدا راستگۆ بێتو وەك تەکتیکێکی قۆناغی سەیری نەکاتو ئامادە نەبێت لە کاتی پێویستدا دەستبەرداری بێت. چونکە ئەستەمە دەوڵەتی ئیسلامی بەو مەبەستو ئامانجو رۆڵو سروشتەی لە ئەدەبیاتی ئیسلامی نوێدا بۆی دیاریکراوە بێتە دی، یاخود پیادەکردنی شەریعەت بەو جۆرەی لەو ئەدەبیاتەدا خراوەتە روو، لەچوارچێوەی گەمەی دیموکراسیو ئاڵوگۆڕی ئاشتیانەی دەسەلاتدا مەیسەر ببێت.

چونکە هەردووکیان دەخوازن رەوتی ئیسلامی دەست بەسەر کۆی جومگەکانی دەسەلاتدا بگرێت. ئەمانەتێکی ئایدۆلۆژی لەم جۆرە نادرێ بەدەست کەسانێکەوە بە گوێرەی ئەو گۆش نەکرابنو لە چوارچێوەی ئەودا بیر نەکەنەوەو ژیان نەکەنو ئامادەی پابەندیو وەفاداری نەبن بۆی. لەو سۆنگەشەوە کە ئایدۆلۆژیاو رەوتی ئیسلامی نوێ، رەسەنسازیی (تأصیل)و ناسنامە بە یەکێ لە ئامانجو کەڵکەڵە سەرەکییەکانی دادەنرێت، دەخوازێت (دیموکراسی)یش لە چوارچێوەی چەمکی (شورا) دا بگونجێنێت. وا دەکات لە ڕوویەکەوە کێشەی لەگەڵ ژێرخانە فەلسەفەیەکەی دیموکراسیدا بۆ پەیدا بێتو هەوڵی جیاکردنەوەی رەهەندە فەلسەفیو میکانیزمییەکەی بدات. سەرەنجام دیموکراسی وەك کۆمەڵێ میکانیزم وەردەگرێتو لە ژێرخانە فیکرییەکەی دایدەبڕێت[1]. لەکاتێکدا ژێرخانی فیکری دیموکراسی

[1] الأسلاميون و نظام الحكم الديمقراطي، لا٥١.

لیبرالیزمــی سیاســیو جەوهــەری ئــەویش (ئــازادی)و ســنووردارکردنی (دەســەڵات) و (ژیــانی دەســتووری)یــە. کــە دیموکراســی بــێ ئــەوان لــە ناوەرۆکەکەی بەتاڵ دەبێتەوە. یاخود زۆر کـەم نـەبێت رۆڵـی خـۆی لـە بەعەقڵانیکردنی ژیانی سیاسیدا نابینێت. لەڕوویەکی ترەوە بە حـوکمی تێگەیـشتنی هەمەلایەنـە بـۆ ئیـسلامو باڵادەسـتبوونی رەهـای بەسـەر سەرجەم ئاینو بیروباوەڕو رێبازە فەلسەفیو سیاسییەکاندا، دەخوازێت بیسەلمێنێت کە (شورا) لەکاتێکدا تەنها بنەماو بەهایەکی نادامەزراوەیی رووتە، لە دیموکراسی گەشەکردووترو بەرفراوانترە ! ![1].

هــەوڵێکی بــەردەوامیش دەدرێــت بــۆ شــێواندنی دیموکراســی لــە خۆرئاوادا، بە جۆرێك کە مرۆڤ جیاوازییەکی وا لە نێـوان دیکتاتۆریـەتو دیموکراسـیدا نـەکات. بێگــەمان بەشــێ لەمــەش وەك پێویـستییەکی ئایـدۆلۆژی و بەشـەکەی تریـشی رەنگدانـەوەی قـەیرانی فیکرییـە کـە ناتوانی ئەو بوارانە لە یەك جیا بکاتەوە، کە مرۆڤ لە رێی (دەق)و وەحی خواییـەوە دەبێـت راسـتییەکان وەربگرێـت، لەگـەڵ بـوارێکی تـر کـە راسـتییەکان بەرهــەمی ئــەزموونی دورو درێــژی گــەلانو بیرکردنــەوەی زانستیو عەقڵانین.

لەوانەش مەسەلەکانی پەیوەست بە رێکخستنی ژیـانی سیاسـیو مۆدێلــەکانی حــوکمڕانی. هۆکــارێکیش خۆدزینەوەیــە لــە بەرکەوتــە (استحقاق)ێکی دیموکراسی راستەقینە. بۆ نموونە (تورابی) لەم رووەوە

---

[1] حەسەن تورابی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٧.

لــه دەستنیــشانکردنی پەیوەنــدی نێــوان (شــورا) و (دیموکراســی)دا دەنوسێت: "بڕیاری سیاسی لە ئیسلامدا ئادابی خۆی هەیە، وەك ئــەوە نییــە لــە خۆرئــاوادا روودەدات، کــە ســتەمکارەکان (المــستبدون) ئــەو عورفانــەی بــە نێخۆیانــدا لەســەری رێکــەوتوون لەگــەڵ دەنگدانــە سەرپێییەکانی نوێنــەرەکانیان بەســەر خەڵکدا دەســەپێنن. هــەر شــتێ زۆرینەی لەگەڵ بوو دەبێتە یاساو بڕیارو کاری پێ دەکرێت، لەکاتێکدا موسـڵمانەکان کاتــێ پێــشهاتێ دێتــە پێــشیان هــەمووان بــە شــارەزاییە جۆراوجۆرەکانیانــەوە تــاوتوێی دەکــەن‌و راوێــژی لــەبارەوە دەکــەن‌و کۆدەنگی لەسەر پەیدا دەکەن. ئەمەش یەکێکە لە جیاوازییەکانی نێوان شــورای ئیــسلامی‌و دیموکراســی خۆرئــاوا، شــورا بــەدوای دروســتکردنی کۆدەنگییەوە و دیموکراسی کار بە بنەمای زۆرینە دەکات!![1].

چونکە بەڕای ئەو لە خۆرئاوادا مەسەلەکە لەسـەر هــەواو ئــارەزووە، ململانێی دەمارگیرییــەکان‌و بەرژەوەندییــە هەنوکەییــەکان دامــەزراوە، لەکاتێکدا لای موسڵمانان پێچەوانەیە، چونکە خەڵکی لە خۆیاندا هەست بە هەســتی برایــەتی دەکــەن‌و بــە دەمــارگیری کاریگــەر نــابن و بــەدوای بەرژەوەندی خێراو خۆپەرســتییەوە نــین، لەگــەڵ شەریعەتیــشدا دێــن‌و دەچن‌و بە هۆی ئەویشەوە (هەق) لـە کـوێ بێـت ئـەوان لـەوێن؟! بـەم جۆرەش هەمیشە رادەربڕینیــان لــە رەزامەنــدی‌و نیمــچە کۆدەنگییــەوە سەرچاوە دەگرێت[2].

---

[1] حەسەن تورابی، سەرچاوەی پێشوو، لا۱۷.

[2] سەرچاوەی پێشوو، لا۱۷.

مرۆڤ سەری سوڕدەمێنێ بیرمەندو ڕێبەرێکی ئیسلامی لە ئاستی (تورابی)دا تا ئەو ئاستە لە میسالیەتو ناواقیعی بوون و لێکدانەوەی لایەنگرانەو نازانستی بووندا ڕۆبچێت. چونکە نە ئەوەی ئەو باسی کردووە واقیعی دیموکراسی خۆرئاوایەو نە سەبارەت بە موسڵمانانیش ئەو وەسفیکردنە راستەو واقیع پشتڕاستی دەکاتەوە. بەش بە حاڵی خۆم نازانم (تورابی) باس لە کام ئیسلامو موسڵمانان دەکات؟ ئیسلامی پێوانەیی رووت، بەو جۆرەی بە تەعبیری هەندێ زانای بواری قورئانناسی لە (لەوحەلمەحفوز)دا تۆمار کراوە، یاخود ئەو ئیسلامەی تێکەڵ بە مێژوو و کولتور بووەو بووە بە تایپی ئاینداری و موسڵمانان لە چوارچێوەیدا ماناو ئاراستە بە ژیانیان دەدەن؟ ئەو واقیعە ئیسلامییەش لەسەر ئاستی موسڵمانانیش باسی دەکات، هەر لە بنەڕەتەوە پێناسەیەکی لەم جۆرە بۆ وەسفیکردنی ژیانی کۆمەڵایەتی ئەم دنیایە دەست نادات. چونکە زۆر زەحمەتە جگە لە خەونی فەیلەسوفەکانو شاعیرەکانو لێکدانەوەی هەندێ بیرمەندی ئایدۆلۆژیستی وەکو دکتۆر تورابی، کۆمەڵگایەك لە مێژوودا بدۆزێتەوە (بە کۆمەڵگەی پێغەمبەر (د.خ) خۆشییەوە) کە تاکە جولێنەری خەڵکەکە بە جیاوازی ئینتیمانی چینایەتیو کۆمەڵایەتیو رەگەزیانەوە (هەق) بێت و هەستکردن بە برایەتی ئیمانی وایان لێ بکات هیچ جۆرە دەمارگیرییەکیان تێدا نەمێنێتو لەسەر بەرژەوەندی ئەم دنیایە کێشەیان نەبێت!!

مەگەر قورئان چیرۆکی یەکەم خێزانی مرۆڤایەتیو رەوانەکراوێکی خۆیو باوکی مرۆڤایەتیمان (ئادەم) بۆ ناگێڕێتەوە، کە چۆن لە دۆخێکدا هێشتا کولتورو فۆرمو پێوەرو بەرژەوەندییەکان بڵاوو ئاڵۆزو تێکچڕژاو نین، برایەك لەسەر بەرژەوەندی خێرای ئەم دنیایە برایەکی تری دەکوژێ؟! یاخود قورئان باسی بەشەڕهاتنی موسڵمانان لە نێو خۆیانو سەرهەڵدانی کەڵکەڵەی دەستدرێژیو ستەمکاری لە ناو بەشێکیاندا ناکات[1]؟.

ئەم وێناکردنە ناواقیعییە بۆ ئیسلامو کۆمەڵگەی موسڵمانانو پاڵنەرەکانی رەفتاری مرۆڤ و خۆرئاواو دەرەوەی خۆ، لە پشت بەشێ لە هەڵە ستراتیژو خوێندنەوەی رووکەشەکانی روونی ئیسلامییەوە بووە. ئەم جۆرە وەسفیکردنە بە تەعبری (مەسعود محمد) تێگەیشتنە لە کۆمەڵگە لەسەر رووپەڕی کتێب نەك لە واقیعدا، ئاواتخواستنە نەك راڤەو لێکدانەوە، وێنەی لەبەرگیراوەی واقیعە نەك واقیع. بە بەهەشتکردنی دنیایە، نەك دنیا بە ئاڵۆزیو ململانێو ئازارو رەنج و خۆشیو ناخۆشییەکانیەوە. ئەم جۆرە خوێندنەوە کە خوێندنەوەیەکی دابڕاوو لاوەکی نییە و دەربڕی رێبازێکە لە بیرکردنەوەی ئیسلامی نوێو سیمایەکی گرنگی ئایدۆلۆژیای ئیسلامیو ئیسلامی هەمەلایەنە پێکدەهێنێت، ئاستی ناواقیعی بوونی هەندێ رووی ئەم ئایدۆلۆژیاو

---

[1] وەك خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا ۖ فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَىٰ فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّىٰ تَفِيءَ إِلَىٰ أَمْرِ اللَّهِ ۚ فَإِنْ فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا ۖ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ الحجرات/٩.

رەوتە دەردەخات، بیرکردنەوەکەش هێندەی سۆفیانەو سەلەفییانەی ئایدیالیستانەیە، زانستیو سیاسی نییە، وێناکردنی رۆڵی ئیسلامو واقیعی موسڵمانانیش بەو جۆرە، دەبێتە سەرچاوەی دواکەوتنی فیکری سیاسیو پەرەپێنەدانی تیۆرگەلێك بۆ بەڕێوەبردنێکی عەقلانیو دادپەروەرانەی ململانێکانو دەسەڵاتو سامان. کە بەداخەوە دواکەوتنەکە واقیعە. لەڕوویەکی ترەوە وێناکردنێکی هۆشەکی (ذهني) رووت بۆ کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی لەسەر زەویدا نەبوو، بە پێوەرکردنی بۆ شیکردنەوەی واقیعی کۆمەڵگەی ئیسلامیو بەراوردکردنی بە خۆرئاواو دەستنیشانکردنی جیاوازی نێوان (شورا) و (دیموکراسی) چەندین هەڵەی کوشندەی مەنهەجیو نادادپەروەریی ئەخلاقی لێ دەکەوێتەوە. چونکە کۆمەڵگەیەکی لەو جۆرە، نەك پێویستی بە دیموکراسی نییە بۆ رێکخستنی دەسەڵاتو بە مەدەنی کردنی ململانێکانو بەیەکەوە گونجاندنی بەرژەوەندییە جیاوازەکان. بەڵکو هەر لە بنەڕەتەوە پێویستی بە بوونی دەسەڵاتی سیاسی نییە. چونکە گەر دیدی قورئان بکەین بە پێوەر[1] یاخود تیۆری پەیمانی کۆمەڵایەتی و تەنانەت هەندێ لە خوێندنەوەکانی (مارکس)یش دەسەڵات لەو ساتە وەختەدا سەرهەڵدەدات، کە جیاوازییەکان سەرهەڵدەدەنو کەڵکەڵەی دەستدرێژی کردنە سەر یەك و مافی یەك پێشێلکردنو بە بێگارکردنی کەسانی دیو ترسان لە دۆخی پاشاگەردانیو شەڕی هەمووان دژ بە

---

[1] محمد باقر الصدر، الأسلام يقود الحياة، تاران، ١٤٠٣ ك، لا١٢٩-١٧٢

هەمووان و (بغي)و دەستدرێژی سەرهەڵدەدەن. کۆمەڵگەیەك کـەس بـە دوای بەرژەوەندی ئەم دنیایادا ڕاکە ڕاکەی نەبێت و هـەمووان وەك بـرا لەگەڵ یەکتر بجولێنەوەو کەس بـە پاڵنـەری دەمـارگیری نەجولێتـەوەو هەمووان ملیان لە موو باریکتر بێت بۆ هەق، ئیتر دەسەڵاتی بۆچییە؟!

ئەم بیرکردنەوەو رەهەندە مەهیدگەراییە لە فیکـری ئیـسلامی نوێـدا رەگـو ریـــشەی قـــوڵی هەیـــە، تێکـــەڵاوبوونی مەســـەلە دەعـــەوی‌و رۆحییەکانیش بە مەسـەلە سیاسـییەکان، درێـژەی بـە مانـەوەی داوە، فیکـری سیاسـی ئیـسلامی مێـژوویی، سـەردەمی (راشـیدین)ی کـرد بـە نموونـــە بـــەرزە ئیـــسلامییە سەرمەشـــقەکە، کـــە دەبێـــت هـــەوڵی دووپاتکردنەوەی بدرێت، هەمان شـت پەڕیوەتـە نێـو فیکـری ئیـسلامی نوێـشەوە، بـەڵام بـە تێپـەڕینی رۆژگـار رۆژ بـەرۆژ دەسـتیان شـلکردو ئامادەبوون رەوایەتی بـە هـەموو واقیعێـك بـدەن بـا لـەڕێی هێزیـشەوە سەپابێت‌و بەها باڵاکانی ئیسلامیش تیایدا پێشێلکرابن!!

گـەر هەنـدێ بـە تێڕامانیـشەوە، لـە ئایـدۆلۆژیای ئیـسلامی نـوێ وردبینـەوە، بۆمـان دەردەکـەوێت، کـە دەوڵـەتی ئیـسلامی کۆمەڵگـەی ئیسلامی دەخوازێت، واتـە پێـشتر دەبێـت کۆمەڵگەیـەکی ئامـادەکراوی موسـڵمانمان هـەبێت، بـۆ ئـەوەی دەوڵـەتی ئیـسلامی لـەخۆبگرێت‌و پیـادەکردنی شـەریعەتیش ببێتـە داخـوازی خـەڵك‌و مەسـەلەیەکی ئارەزوومەندانە بە پاڵنەری ئیمانی. واتە کۆمەڵگەی ئاسایی موسڵمانان بە کەڵکی ئەوە نایەت ئیسلامی بەسەردا پیـادە بکرێـت، چـونکە لەهـەر سـێ ئاسـتی فیکـری‌و عەقیـدەیی‌و ئەخلاقییـەوە لـەو ئاسـتەدا نییـە،

کۆمەڵگەی جێی مەبەستی ئیسلامخوازانیش، دەبێت بە سکێچو پێوەری ئایدۆلۆژی ئیسلامی نوێ بینا بکرێتەوە و بکرێت بە واقیع. بەم جۆرەش بە جۆرێ لە جۆرەکان بە پێچەوانەی واقیعی مێژوویی‌و لە ئارادابووش، گەر نەشڵێین تێکڕای کۆمەڵگە (ئەوا زۆرینـەی زۆری دەبێتـە موسـڵمانی هۆشـیارو پـەروەردەکراوو پابەنـد، بـەو جـۆرەی ئیـسلامییەکان ئەندامەکانی خۆیان پەروەردە دەکـەن‌و پێدەگەیـەنن!! کۆمەڵگەیـەکی لەو جۆرەش بە تەعبیری (نەورەسی) لـە پـەیامی ئـیخلاس‌و برایـەتی دا کۆمەڵگەی توانەوەیە لە برایەتی دا (الفناء في الأخوة) کۆمەڵگەی چاکەی رەهاو نامۆبوونی خراپەو لـە مـەنقابوونی شـەیتانە، ئـەم کۆمەڵگەیـەش هێندەی ئەخلاق‌و ئیمان بەڕێوەی دەبات (فیقه)یشی زۆر پێویست نییە، لەکاتێکـدا واقیـع مانـای پێـچەوانەمان پـێ دەبەخـشێت، چـونکە هـیچ کۆمەڵگەیەك مرۆڤە فریشتەکان پێکی ناهێنن.

کۆمەڵگـە بـە حـوکمی کۆمەڵگـەبوونی جـۆرە ململانـێ‌و بەرژەوەنـدی دژبەیەك‌و بە زمانی قورئان (تدافع)ی تیایە. کە پێویستیان بە رێکخستن‌و لەگـەڵ یەکـدا گونجانـدن‌و سـنوور بـۆ دیـاری کردنـە. (ئـاینیش) تەنانـەت لەسـەردەمی خـودی پێغەمبـەرانی خـوداو بـە پێغەمبـەری ئیسلامیـشەوە نـەیوانیوەو ناتوانێـت، ئـەو واقیعـە بـسڕێتەوە، بـوونی (٧٠) دووڕوو لـە لەشـکرەکەی پێغەمبـەردا (ﷺ) لــە جــەنگی ئوحــود و گەڕانــەوەیان، رەخنـــەگرتنی بەشـــێ لـــە هـــاوەڵانی لەســـەر جـــۆری دابەشـــکردنی دەســتکەوتەکانی جــەنگ، هەڵگەڕانــەوەی بەشــێ لــە عەرەبــەکان لــە ســـەردەمی خۆیـــداوو دواتـــر کێـــشە لەســـەر دیـــاریکردنی جێنـــشین‌و

سەرهەڵدانەوەی ململانێ خێڵەکیو ناوچەییەکان، لەسەردەمی خەلیفەی سێهەمەوەو دواتر رووخانی حکومەتی راشیدینو هاتنە سەرکاری دەسەڵاتی پاشایەتی ئەمەوییەکان، ئەو راستییەمان بۆ دەسەلمێنن، کە سیاسەتکردن پێش هەموو شتێ داننان بە کێشەکان وەك خۆیانو بیرکردنەوە لە چارەسەری واقیعی دەخوازێت، واقیعی سەردەمیش پێمان دەڵێت کە ئەوەی (بەننا) بە (کۆمەڵگەی موسڵمان)ی ناوبردبوو، واقیعی نەبوو[1]. کۆمەڵگە موسڵمانەکانی سەردەمیش بە پێچەوانەی وەسفیکردنەکەی دکتۆر تورابییەوە، نەك هەر نموونە نین بۆ کۆدەنگی، بەڵکو بە دابەشکراوو پڕکێشەترین کۆمەڵگەکانی جیهان لە قەڵەم دەدرێن. تەنانەت (تورابی) نەیتوانی لەناو خودی جوڵانەوە ئیسلامییەکەی خۆیدا ئەو سازانو کۆدەنگییە دروست بکاتو ناچار بە دەرچوونو جیابوونەوە بوو، کۆنە هاوڕێکانی بە جۆرەها لادانو خراپەکاری تاوانبار کردو ئەوانیش سڵیان لەوە نەکردەوە رێبەرە فیکریو سیاسییەکەی دوێنێی خۆیان زیاد لە جارێك بخەنە زیندانەوە.

جوڵانەوەی ئیسلامی سودان بەم بیرکردنەوەو درێژەدان بە بانگەشەکردن بۆ دەوڵەتی ئیسلامیو پیادەکردنی شەریعەتو حاکمیەتی ئیلاهی لە پێش دەسەڵات گرتنە دەستدا نەیانتوانی تاسەر بەرامبەر شێوازی دیموکراسیانەی سیاسەتکردن وەفادار بێتو پەنای بردە بەر کودەتای سەربازی بۆ گرتنەدەستی دەسەڵات. بەوەش

---

[1] لەم رووەوە بگەڕێرەوە بۆ / د. جاسم سلطان/ أزمة التنظيمات الأسلامية (الأخوان نموذجاً)، الشبكة العربية للأبحاث و النشر، چاپی یەکەم، ٢٠١٥.

سەلماندی کە تێڕوانینی بۆ دیموکراسی مەبدەئیو رەسەن نییە، بەڵکو تەنها وەك ئامرازێکە بۆ هەژموونو دەسەڵات پەیداکردن سەیری کردووە و مامەڵەی لەگەڵدا کردووە[1].

دوای سەرکەوتنی کودەتاو دەسەڵات گرتنە دەستیشیان، هەڵوێستیان بەرامبەر فرە حیزبی گۆڕانی بەسەردا هات، بەسەرچاوەی ناکۆکیو دووبەرەکیان دەزانی. لەژێر پەردەی یەکیەتیشدا حیزبەکان یاساغ کرانو سەرکردەو کادرو ئەندامەکانیان راوەدوونرانو هەندێکیشیان بەبیانووە پارێزگاریکردن لەئاسایشی گشتی بۆ ماوەیەك دەست بەسەر کران! بەڵام حیزبەکان بە نهێنی لەسەر کارو چالاکی خۆیان هەر بەردەوام بوون، ئیسلامییەکان لەوە دڵنیابوون کە تێپەڕاندنی واقیعی سیاسیو حیزبەکان لە سۆداندا هەروا کارێکی ئاسان نییە، بۆیە لە دەستوری ساڵی (١٩٩٨)دا شتێکیان بە ناوی بەدوی یەکدا هاتنی حیزبیدا هێنایە کایەوە کە چەمکێکی تەمو مژاوی بوو لە بری فرەحیزبی دانرابوو[2]. بەڵام سەرەڕای ئەوە و لە سۆنگەی کێشەی جوڵانەوەی ئیسلامی لەگەڵ دیموکراسی و سروشتی دەسەڵاتخوازانەی رژێمەکەی (عومەر حەسەن بەشیر)ەوە دوای (٢٧) ساڵ لەو مێژووە هیچ هێزێکی سیاسی نەیتوانیوە دەسەڵات بگرێتە دەست، پارتی کۆنگرەی نیشتمانی حوکمڕان بە کردەوە، لە مۆدێلی پارتی فەرمانڕەوا بە هەندێ جیاوازیو بوونی پەراوێزێك لە فرەییو دیموکراسی نزیك کردۆتەوە.

---

[1] الأسلاميون و الحكم في البلاد العربية و تركيا، ص٢٢٩.

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣٠.

ئەزموونی سودان پێمان دەڵێت کە بەشداری سیاسی ئیسلامییەکان لەگەڵ دەستگرتن بە ئامانجەکانی ئایدۆلۆژیاو رەوتی ئیسلامی نوێ، قۆناغێکەو دەبێت تێبپەڕێت. چونکە ئاماژەکانی بە ئاقاری گۆڕانکاری قوڵ لە جیهانبینیو بیرکردنەوەی ئایدۆلۆژیو سیاسی دا ناڕۆنە پێش. گەرچی دۆخەکە هەمووی پەیوەست نییە بە ئیسلامییەکانەوە، ناکاملی ئیسلامییەکان لە سایەی بوونی پەراوێزێك لە دیموکراسی لە هەشتاکانو نەوەدەکاندا، بە پلەی یەکەم پەیوەندی بە ناکاملی و کاڵو کرچی دیموکراسی ناوچەکەوە هەیە، چونکە ئیسلامییەکان لە هەندێ رووەوە رەنگدانەوەی دۆخی نەبوونی دیموکراسی و دەسەڵاتخوازی رژێمەکانو دواکەوتوویی بەشێ لە هێزو لایەنە عەلمانیەکانن، بەڵام لە هەموو حاڵەتێکدا هەموو دەرگا کردنەوەیەکی ئیسلامییەکان لە رابردوودا، گفتوگۆو مشتو مڕێکی فیکریو رێکخراوەیی بەدوادا هاتووە، دۆخی ناوخۆی ئیسلامییەکانی لە خامۆشیو سڕییەکی دەیان ساڵە گەر نەڵێین رزگار دەکات، دەخاتە قۆناغێکی نوێی پڕجوڵەترو دینامیکیترەوە. چونکە دروستکردنی حیزبو بەشداری لە ژیانی سیاسی دا، لە سایەی دۆخێکدا هیچ شانسێ بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامیو پیادەکردنی شەریعەت لە ئارادا نەبێت، بەخۆداچوونەوەیەکی کرداریو بێ دەنگو دەستبەرداربوونە لە هەندێ چەسپاوی فیکریو دەرگا کردنەوەیە بەرەو دەستو پەنجە نەرمکردن لەگەڵ (واقیع) بە پێکهاتەو ئاڵۆزییەکانییەوە. هەروەها

هەنگاونانە بـەرەو رێـژەیی بـوونی بیرکردنـەوەو جۆشـدانەمان بـە دەسـت هەندێ ئامـانجی نـاواقیعیو شـێوازی کـۆنی کـارکردنو مامەڵـەکردن. ئـەم قۆناغـە لـە بەشـداری کـردن مەسـەلەی رەوایـیو نـاڕەوایی بەشـدارییەکە لەڕووی شەرعییەوە دەوروژێنێـت، کـە لەگـەڵ سـادەبوونی مـشتومڕەکان لەو ڕووەوە ئاماژەیە بە دووبارە بیرکردنـەوە لـە دەقـەکانو گونجانـدنیان لەگـەڵ پێویـستییەکانی واقیـع[1]. ئەگـەر (برایـان)یـش وەك رەوتـی دایـك لەچوارچێوەی جوڵانەوەی ئیسلامی نوێدا بە نموونە وەربگرین. لە سایەی بەشداری ئەندەکی (جـزء)ی ئیـسلامییەکان لـە ژیـانی سیاسـی دا، کـە بـە جۆرێ لە جۆرەکان رەوایەتی دانە بە دەوڵەتی نیشتمانی نوێو رژێمو قایل بوونە بە ڕێساو پێوەرەکانی رێگا پێـدانو رێکخـستنو ئاراسـتەکردنی، بـە کردەوە. دەەوڵەتی ئیسلامیش حوکمی (خەلافەت) لە سەردەمی (بەننا)ی دامەزرێنەردا وەردەگرێت. کە چۆن کارکردن بۆ گێڕانـەوەی خەلافـەتی بـە دروشمو ئەرکێکی ئیسلامی موسڵمانان دەزانی، بەڵام پێی وابوو زەمینـەی خستنەڕووی وەك ئامانجێکی سیاسی لە ئارادا نییە و دەبێـت بـسپێردرێت بە دواڕۆژێکی نادیار[2]. دەوڵەتی ئیسلامیش گەر لـەڕووی فیکریـشەوە وازی لێ نـەهێنرێت، بـە کـردەوە، لـە ئەجینـدای رۆژی جوڵانـەوەی ئیـسلامی دەکرێتـە دەرەوەو دەکرێتـە ئامـانجێکی سـتراتیژی دوورمـەودا. بۆیـە

[1] دەربارەی ئەو مـشتومڕانە خوێنـەر دەتوانـێ بگەڕێتـەوە بـۆ/ الـدکتور عمـر سـلیمان، حکـم المشارکة في الوزارة و المجالس النیابیة، دار النفائس، عمّان،٢٠٠٨.

[2] الحرکات الأسلامیة في الوطن العربي، ل١٥٩.

لەسایەی ئەو جۆرە ئاستە لە بەشداری ئیسلامییەکاندا، مەسەلەی دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی بەو جۆرەی لە ئەدەبیاتی جوڵانەوەی ئیسلامی نوێدا خراوەتە روو، ناکرێت بە دروشمی هەڵبژاردنەکان. بەڵکو دروشمێکی گشتیو پێناسە نەکراوی وردی وەك (ئیسلام چارەسەرە) دەکرا بە دروشمی هەڵبژاردنەکان. (چارەسەری ئیسلامی)یش بە حوکمی تەرحکردنی لەچوارچێوەی رێگە پێدراوەکانی واقیعی سیاسیو راڤەکردنو ناوەرۆك پێدانی، دەبەسترێتەوە بە واقیعی دەوڵەتی نیشتمانییەوە. بە پلەی یەکەمیش دیدێکی نەرمتر بە بەراورد لەگەڵ جاران بۆ پیادەکردنی شەریعەت لە خۆدەگرێت. لەم ئاستەشدا مەسەلەی پیادەکردنی شەریعەت بەو شێوە هەمەلایەنەی لە ئایدۆلۆژیای ئیسلامی و نوێو مۆدێلە دەوڵەتو حوکمڕانییەکەیدا خراوەتە روو، مەترەح ناکرێتو بەتێپەڕبوونی کات دەبێت بە خەباتکردن بۆ ئەوەی سەرچاوەیەکی سەرەکی یاساداناني وڵات بێت!! کە بەش بە حاڵی خۆم جێکردنەوەی شەریعەت لە پانتاییەکی فراوانتردا لە سایەی دەسەڵاتە نادیموکراسی و گەندەڵەکاندا، بە دەستکەوت نازانم. چونکە رووە فقهییەکەی شەریعەت لە جەوهەرە ئەخلاقیو بەهاییەکەی دادەڕنێتو دەشکرێتە سەرچاوەیەکی رەوایەتی نوێی دەسەڵاتێکی ناڕەوا و مۆدێلێکی دواکەوتوو لە دەوڵەت، کە لە جەوهەردا هەڵگری خەسڵەتەکانی دەوڵەتی مەدەنی هاوچەرخی نییە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گەر ئەم کێشمە کێشو بەشداریو هەڵکشانو

داکشانە لەم رووەوە پرسیاری لەسەر بێت، ئەوا لەڕوویەکی ترەوە بە تێپەڕینی رۆژگارو دووپاتبوونەوەی ئەزموونەکانو گۆڕانی لە بەشدارییەکی شەرمنانەو سەرلێکردنەوە (تحفظ)و هەست بە سزای ویژدانەوە بۆ دۆخێکی نۆرمەڵو ئاسایی، دەبێتە قۆناغێکی راگوزەری گرنگ، بۆ رۆیشتن بەرەو قۆناغێکی تری ئامادەبوونی سیاسیو بەخۆداچوونەوەو بوێری لە خۆنیشاندانی زۆرتر بۆ کرانەوە بەڕووی کۆمەڵگەو سەردەمو پێداویستییەکانی کارێکی سیاسی هاوچەرخ، گرنگ ئەوەیە ئیسلامییەکان لەم رووەوە سەلماندوویانە، کە خۆگونجاندن لەگەڵ بەهاکانی دیموکراسیدا، نەك هەر لە هێزەکانی ترو سیکۆلارەکانی ناوچەکە، دوانەکەوتوون، بەڵکو لە هەندێ وڵاتیشدا لە پێش ئەوانەوەن[1].

[1] لە وێنەی (میسر، تونس، مەغریب، مالیزیا، تورکیا... هتد).

# فەسڵی هەشتەم:
# بەشداری سیاسی لەچوارچێوەیەکی نوێدا و دووبارە بیناکردنەوەی چەمکەکانی سیاسەت و بانگەواز لە مەرجەعیەتی ئیسلامییە نوێکاندا

بۆ ئەوەی بزانین باسی چی دەکەین، هەروەها چیمان دەوێت‌و لە چ رەوشێکدا داوای دەکەین؟ بەتایبەتیش لە پەیوەندی بە سەربەخۆکردنی چالاکییە وەعزیو دەعەوی‌و پەروەردە دینییە رووتەکان لە کاری سیاسی، لە چوارچێوەی رێکخراوێکدا، دەبێت ئاماژە بەو گۆڕانکاریانە بکەین، کە قۆناغی دوای ئایدۆلۆژی ئیسلامی نوێ‌و ئیسلامی سیاسی‌و بەشداریان لە پرۆسەی دیموکراسی بە سەر ئیسلامییەکان‌و ئامانج‌و شێوازی کاریاندا هاتووە.

چونکه درێژەدان بە بیرکردنەوە لە چوارچێوەی چەمك و فیکرو پێوەرەکانی ئایدۆلۆژیاو جولانەوەی ئیسلامی نوێ دا، بەڵکو دەرنەچوون لە قۆناغی ئەوەی ناوی دەنێم بە بەشداری ئەندەکی (جزء)ی لە سایەی رژێمە نادیموکرات یاخود نیمچە دیموکراتەکان و بوونی پەراوێزێکی سیاسیو بەرێوەبردنی ململانێکان لەنێوان رژێم و تەوژمی ئیسلامی لەرێی دەرگا کردنەوە بۆ بەشدارییەکی سنوردارو پاشەکشە پێکردن و دووبارە دەرگاکردنەوە، بەو جۆرەی لە میسری حوسنی موبارەك و، ئوردن و هەندێ ولاتی تردا لە ئارادابوو، رێدەگرێت لەوەی بەبێ گرژیو لایەنگری کوێرانەو تۆمەتبارکردن و گومانکردن لە نیازی بانگەشەکارانی ئەم جیاکردنەوەو سەربەخۆکردنە، لە بایەخی هەنگاوو هەوڵەکانی لەم رووەوە و پێویستبوونیان بۆ گەشەدان بە تەوژمی ئیسلامی و نوێ بوونەوە تێبگەین. قۆناغی ئێستا لە ناوچەکەدا. بە ژانی لەدایکبوونێکی نوێدا تێدەپەرێت. بەشێ لەو ژانەش پەیوەندی بە خەبات بۆ دامەزراندنی دەسەلاتە دیموکراسییەکانی ئایندەوە هەیە، ئەمەش ئیسلامییەکانی خستۆتە ناو گۆڕانکارییەکی مێژوویی فرە رەهەندەوە، گەر گۆڕانکارییەکانیش بە پلەی یەکەم کرداریو مەیدانی بن نەك فیکریو دواتر بخرێنە چوارچێوەی فیکرییەوە، گرنگ ئەوەیە ئەوەی ئێستا دەبینرێت سەبارەت بە ئیسلامییەکان خۆبیناکردنەوەو راگەیاندنێکی نوێیە، خۆیان لە پەی بردنیانەوە بۆ زەرورەتی خۆنوێکردنەوە و قوڵکردنەوەی بەشداریو ئەزموونی سیاسیان و پێشخستنی گوتارو ئامرازو میکانیزمەکانی

کارکردن‌و، لێپرسراوێتی لە ئەستۆ گرتن بەرامبەر ئێستاو ئایندەی گەل‌و وڵاتەکانیان، فۆرمە کۆنەکەی خۆیان بەجێ دەهێڵن‌و قۆناغێکی نوێی پڕ هیواو ئومێدی زیاتر لە ژیانی فیکری‌و سیاسی‌و ژیاری خۆیاندا دەست پێ دەکەن. دیارە هەموو ئیسلامییەکان لەم رووەوە بە ئاستێکی گۆڕانکاری هاوشێوەدا تێنەپەڕیوون، بەڵام پرسیار و کێشە وروژێنراوەکان وەك یەك یاخود زۆر لە یەك نزیکن. بۆ نموونە وروژاندنی کێشەی (بانگەواز) و (سیاسەت) لە چوارچێوەی رێکخراوێکی یەکگرتوودا، کێشەی سەرجەم هێزە پاشخان (اخوان)ییەکان‌و هەڵگرانی گوتاری ئیسلامی هەمەلایەنەو ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێیە. ئەو گفتوگۆیانەی لەم رووەوە لەناو هێزێکی ئیسلامی وەکو (پارتی کۆمەڵگەی ئاشتی) لە جەزائیر لەگەڵ (یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان) لە پەیوەندی بەم پرسەوە لە ئارادابوون‌و لە ئارادان. زۆر جیاوازییان نییە، چونکە هەردووکیان لە ڕووی مێژووییەوە وەك بانگەواز دەستیان پێکردووە و دواتر چوونەتە نێو کاری سیاسییەوە. یەك پاشخانی فیکریشیان هەبووە. ئەمەش وادەکات، کە سەرەڕای جیاوازی لەنێوان واقیعی جەزائیرو کوردستاندا لە هەندێ رووی فیکری‌و رێکخراوەییەوە کێشەی هاوشێوەیان هەبێت. ئەوەش دەریدەخات کە پرسی لێکجیاکردنەوەی (بانگەواز) و (سیاسەت) و نە ئاخینیان بەزۆر لە چوارچێوەی رێکخراوێکی هاوبەوشدا، مەسەلەیەکە تاکەکەسی فلان بیرمەندو سەرکردەی ئیسلامی ئەم هێز یاخود ئەوی دی نییە، پەیوەندی بە کاڵبوونەوەی ئینتمای ئیسلامی بەشێ لە

ئیسلامییەکانیـشەوە نییـە، بـەڵکو تاڕادەیـەکی زۆر دەرکەوتەیـەکی قۆناغەکەو پەیوەندی بەسروشتی هەلومەرجە مێژوویی نوێکانو گۆڕانی چوارچێوەو فەزاکانی بیرکردنەوەو کارکردن، لەسەر ئاستە نیشتمانیو ناوچەییو نێودەوڵەتییەکەوە هەیە. ئامـاژە بـە توانـای بەشـێ لـە ئیسلامییەکان لەسەر وەڵامدانەوە بە ئەو مەیدانخوازی (تەحەدا)یانەی، قۆناغە مێژووییەکە بۆی دروستکردوون، لەگەڵ بەرەوپێگەیشتنی زیاتر چـوونی عـەقڵو هۆشـیاری ئیـسلامییەکانو توانایـان لـە دووبـارە پێداچـوونەوەو هەڵسەنگاندنی فۆرمـە پێـشووەکانی فیکـرو شـێوازی کارکردنیـان. وروژانـدنی ئـەم بـاسو خواسـانە، نیـشانەیەکی دووبـارە خۆئاسـاییکردنەوەیە لەگـەڵ واقیعـی وڵاتـانو گـەلانی موسـڵماندا، دەرچـوونە لـە کولتـوری رەتکردنـەوەی واقیـعو دەوڵـەتی نـوێو دیموکراسیو نەتەوایەتیو نیشتمانێتی و شەڕی کراوەو ئەبەدی لەگـەل خۆرئاوادا.

هەوڵدان بـۆ رزگـارکردنی مەسـەلە دینییـە رووتـەکان لـە چوارچـێوە تەسکە کۆنەکانی جولانەوەی ئیسلامی، هەوڵدانێکی دابڕاو نییە لە کۆی ئەو گۆڕانکارییانەی لە پەیوەندی بە پرۆسەی دووبارە خۆبیناکردنەوەی فیکرو تـەوژمی ئیـسلامی لـە ناوچـەکەداو تێگەیشتن لـە ئەرکـە نوێیـە ئەنجامنـەدراوەکان، لـە ئـارادان. بـەرەنجامی ئـەو گۆڕانکارییانەیـە کـە قبوڵکردنی دیموکراسی لەلایەن تەوژمی ئیسلامییەوە هێناونیە کایـەوە، بـەرەنجامی دووبـارە پێناسـەکردنەوەو دارشـتنەوەی زیـاد لـە چـەمکو فـــۆرمو پەیوەندییەکـــە. بەشـــێکە لـــە دەرهاویـــشتەکانی

بەخۆداچوونەوەیەکی هەمەلایەنە کە لە حاڵی ئەنجامداندایەو هەندێ لـە ئازاری ئەنجامدانی هەنـدێکیش نەشـتەرگەری فیکـریو رێکخراوەیـی بـە سوێ، هاواریان لێ بەرز دەبێتـەوەو هۆشـیاری دەدەن لـە چارەنووسـی تەوژمەکەو رەسەنایەتی و ناسنامە مێژووییەکەی. بـەڵام هەنـدێکی تـر بـە دڵ خۆشـەوە دەچـنە ژێـر نەشـتەرگەری پزیـشكو دەزانـن هـەر کەمتەرخەمییەك لەم رووەوە یەکێ لەم دوو بەرەنجامەی بەدوادا دێت: مردن، یاخود مانەوە بە مەمرەو مەژیو کەنـەفتی. ژیانـێ کـە هێنـدەی زیندوومانەوەیـە ژیـانکردن نییـە. ئـەم بەشـە لـە بیرمەنـدو سـەرکردە ئیسلامییەکان لەوە تێگەیشتوون کە بەرگەگرتنی ئـازاری نەشـتەرگەری ئاسانترە، لە بەسەربردنی تەمەنێ بەدەم ئازارو ناتـەوانیو بـێ هێـزیو زەبوونییەوە.

مەسەلەکەش لـە ئێـستادا لـە پەیوەنـدی بـە جیـاوازی دیـدەکان لـە چوارچێوەی رەوتی ئیسلامیدا لەمەڕ بەیەکەوە هێشتنەوەی بانگـەوازو پەروەردەیی رووتی ئاینی بەیەکەوە، یاخود جیاکردنەوەیانو پێنانە ناو قۆنـاغی پـاش ئیـسلامی سیاسـیو ئیـسلامییە نوێکـان، بازنـە داخـراوە فیکرییەکانیان تێپەڕانـدووە، پرسـێ نـەماوە تـەنها لـە ڕوانگـەی بەڵگـە شەرعیو فیکریو حەرەکییەکانەوە هەڵبسەنگێنرێتو داوەری لەبارەوە بکرێت. بەڵکو بەشـێ لـە حوکمدانـەکانو کەرەسـەی یەکلاییکردنـەوەی دیـدە جیاوازەکـانو هەڵـسەنگاندنیان، بۆتــە خوێندنــەوەی ئــەزموونی سیاسی ئیسلامییەکان لـە هـەردوو فـۆرمو بانگەشـەکەدا، واتـە فـۆرمی بەیەکەوە گرێدانی مەسـەلە بانگـەوازیو سیاسـییەکان لـە چوارچـێوەی

ئیسلامو ڕێکخراوێکی ئیسلامی شمولییداو ڕەوتی ئیسلامی مێژوویی ناوچەکە، لەگەڵ فۆرمی جیاکردنەوەو سەربەخۆکردنی کایەکانو یەکتر تەواوکردنیان لە ئاستی کۆمەڵگە نەك ڕێکخراوێکی سیاسی یەکگرتوودا، واتە بیرکردنەوە لەسەر ئاستی تەوژمی ئیسلامی لەچوارچێوەی کۆمەڵگە موسڵمانە هاوچەرخەکاندا.

بەواتایەکی تر جیابوونەوەو سەربەخۆبوون، لە پێناوی پشت بە خۆبەستنو گەورەبوون، دوای ئەوە یەکتر تەواوکردن، گەر لەم ڕووەوە لەسەر ئاستی ئەزموونی ئیسلامییەکان لە هەندێ لە وڵاتانی ئیسلامیدا سەیری مەسەلەکە بکەین، دەبینین ئەو نموونانەی جۆرێ لە هیواو ئومێد دروست دەکەن و پەنجەیان بۆ رادەکێشرێت و ئاماژەن بە سەرکەوتوویيو توانای ئیسلامییەکان و وەك نموونە دەهێنرێتەوە، ئەوانەن کە بە پرۆسەی خۆبیناکردنەوەو لە یەکتری جیاکردنەوەی کایەکاندا تێپەڕبوون و دوای ئەوە هەوڵیان داوە لە دەروازەیەکی مێژوویی بەرفراوانترەوە بەشداری لە ژیانی سیاسییدا بکەن. بەشدارییەکەش لە هەندێ کۆتو بەند رزگار بکەن کە بانگەوازو ئایدۆلۆژییە ئیسلامییە کۆنەکە بۆ کاری سیاسی دروست دەکات، لەوانەش پارتی دادو گەشەپێدانی تورکیا[1]، دادو گەشەپێدانی مەغریب، نەهزەی تونسی. هەندێ نموونەی تر کە تیایاندا ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ تێکەڵ بە توخمەکانی کولتوری جوڵانەوەی رزگاری نیشتمانی

[1] پێویستە بوترێت پرۆژەی ئەم پارتە تا ساڵی (٢٠١٣) زۆر سەرکەوتوو بوو، بەڵام لەو کاتەوە لە هەندێ ڕووەوە هەست دەکرێت لادانێك لە سیاسەتکردنیدا دروست بووە.

بووه، له وێنەی (حەماس)ی فەلەستینی، (حزب الله)ی لوبنـانی[1]. گـەر جێگای شـانازی پێـوەکردنی بەشـی لـە موسـڵمانانی وڵاتـانی خۆیـان‌و دنیـاش بـن یـاخود بـووبن، شـانازییکردنەکە پەیوەسـتە بـە دۆخـی خـۆڕاگری‌و بەرهەڵـستی‌و دەسـتگرتن بـە داخـوازی‌و چەسـپاوەکانی گەلـەوە، نـەك نموونـەی حوکمڕانییـەوە. بـۆ نموونـە زۆربـەی جیهـانی ئیسلامی‌و لەوانەش نووسەری ئەم بابەتە لە هەشتاکاندا بە شـانازییەوە باسی لـە جیهـادی ئـەفغانی‌و موجاهیـدەکان‌و بەرهەڵـستی جوڵانـەوەی ئیسلامی‌و گەلی موسڵمانی ئـەو وڵاتـەمان دەکـرد، کەچـی کاتـێ ڕژێمـی کابولیان روخاند، لە سۆنگەی تەقلیدی بوون‌و نوێ نەبوونەوەی فیکری‌و ناکاملّی سیاسی و خۆپەرسـتی‌و دەمـارگیری ڕێکخراوەیـی‌و باڵادەسـتی کولتـووری (خـێڵ)و مێلیـشیاگەری، نـەك هـەر نـەیانتوانی بناغـەی سیـستمێکی حـوکمڕانی وا دابڕێـژن کـە جێگـای شـانازی گەلەکـەیان‌و موسڵمانانی جیهان بێـت، وە ئەفغانییـەکان لـە سایەیدا هەنـدێ پـشوو بدەن‌و هەست بـە لانـی کـەمی ئاسـودەیی‌و خۆشـگوزەرانی‌و کەرامـەت بکەن، بەڵکو ئەو مێژووەی لە قۆناغی جیهادی چەکدارانەشـدا تۆماریـان کردبـوو، شـێواندو، سـەرکردەکانیان بـە کـردەوە سـەلماندیان لەئاسـت لێپرسراوێتی دا نین، خستیانە روو، کە لە مردن ناترسن، بەڵام ژیانسازو بیناکەر نـین، لەکاتێکـدا ئـەوەی شـەهیدیش دەبـوو لـەپێناو ئـەوە بـوو

[1] حیزبوڵڵای لوبنانی دوای تێکەڵبوونی بە زۆنگاوی سوریاو پشتیوانی لە ڕژێمـی بەشـار ئەسـەد خۆی خستۆتە ژێر پرسیارێکی قورسی ئەخلاقییەوە و لـە ئێستادا وەك هێزێکی مەزهـەبی دەمـارگیر دەردەکەوێت، نەك بزووتنەوەیەکی بەرهەڵستی نیشتمانی.

ڕۆڵــەکانیانو وڵاتەکــەیان ملکەچــی داگیرکــاری دەرەکــیو زۆرداری و داپلۆسینی ناوخۆ نەبنو هەژاریو ئازارو بێ بەشـی بـەرۆکیان بـەرداتو وەك مرۆڤو موسڵمانێکی خاوەن کەرامەتو ماف ژیان بەسەر بەرن.

ئێستا لـە ڕوانگـەی ئـەوەی لـە پێـشەوە وتمـان هەنـدێ ئامـاژە بـە گۆڕانکارییە نوێکـانو قۆنـاغی پـاش ئایـدۆلۆژیاو جوڵانـەوەی ئیـسلامی نوێ دەکەین بۆ ئەوەی زیـاتر لـە مەبەسـتمان تێبگـەینو دەستنیـشانی پێداویستییەکانی قۆناغەکە بکەین.

## قۆناغی پاش ئیسلامی.. یاخود ئیسلامییە نوێکان

گەر ئەوەی لە بەشەکانی سەرەتای ئەم نووسـینەدا و خوێندنـەوەی ئــەزموونی سـودان خـستمانە ڕوو، پوختــەی ئایـدۆلۆژی و جوڵانــەوەی ئیسلامی نوێ بێت. کە هەڵگری گوتاری هەمەلایەنەبوون (شمولی) بوونی ئیـسلامو دەوڵـەتی ئیـسلام و پیـادەکردنی شـەریعەت بـووە، ئـەوا لـە ئێستادا فۆرمو نموونەیەکی تری ئیسلامی لە شکڵگرتنو خەملێندایە، کە ئەو فۆرمەی تێپەڕاندووە، خاوەن دیدگایەکی فیکریو لیستی لە پێشینە (أولويات)و گوتارو شێوازی کارکردنی نوێیە، پاڵنەرەکانی بۆ بەشـداری سیاسیش لە زیاد ڕوویەکەوە لە پاڵنەری بەشداری (جزء)ی جوڵانــەوەی ئیسلامی لە ژیانی سیاسی دا جیـاوازە، ئـەم مۆدێلـە نوێیـە لـە کۆتـایی هەشـتاکانو سـەرەتای نەوەدەکانـدا، واتــە لــە ســاتەوەختی ڕوخـانی دیـواری بـەرلینو شکـستی سـەربازگەی سۆشیالیـستیو پاشەکـشەی

ئایدۆلۆژیاکەی‌و بانگەشەکردن بۆ نـەزمی نـوێی جیهـان‌و گۆڕانکـاری لـە ناوچەکەدا، لەو روانگەوە دەستی پێ کردووە. لەوکاتـەوە تـاکو ئێـستا چەندین قۆناغی بڕیوە، سەرهەڵدانی پـارتی دادو گەشـەپێدانی تورکیـا. لـە سـاڵی (٢٠٠١) بـە وێـستگەیەکی گرنگـی گەشـەکردنی ئـەم مۆدێلـە ئیسلامییە نوێیە دادەنرێت سەبارەت بە دنیای عەرەبیش، شۆڕشەکانی بـــەهاری عـــەرەبی و جـــۆری بەشـــداری ئیـــسلامییەکان تیایانـــداو پێداویستییەکانی سیاسـەتکردن لـەدوای سـەرکەوتنی بەشـێکیان، ئـەو وێستگە مێژووییە گرنگە بوو، کە تـەوژمی ئیـسلامی ناوچـەکەی خـستە بەردەم واقیعێکی یەکجار جیاوازەوە، کە دەبوو بە کردەوەو لە مەیـدانا چەندەها دروشم‌و پێناسەو چەمکی ئیـسلام‌و جوڵانـەوەی ئیـسلامی لـە روانگـەی واقیعـە نوێکـەوە پێناسـە بکەنـەوە. چـونکە گۆڕانکارییـەکان هێندە کوتوپڕو گەورەبوون، بواریان بۆ ئەوە نەهێـشتبۆوە بـە شـێوازە کۆنەکانی راوێژو مشت‌ومڕی فیکری‌و بەڵگەخوازی‌و دروستکردنی بڕیاری سیاســی‌و حــەرەکی، بتــوانرێ مامەڵــەیان لەگەڵــدا بکرێــت. راســتە ئیسلامییەکان هەر لە سەرەتای نەوەدەکانەوە، دەستیان بە جوڵەیەکی بەخۆداچـوونەوە کردبـوو[١]، بەشـداری سیاسـی جوڵانـەوەی ئیـسلامیش لێرەو لەوێ لەگەڵ سنورداربوونیدا، زەمینەیـەکی بـۆ گۆڕانکـاری دواتـر خــۆش کردبــوو، روداوە تیرۆریــستییەکەی (١١) ســێپتەمبەرو ئــەو کادانەوانـەی لەسـەر ئاسـتی خـستنە ژێـر فـشاری تـەوژمی ئیـسلامی‌و

---

[١] بۆ نموونە بزوتنەوەی نەهزەی تونسی لـەوسەرو بەندەدا سـەدان لاپـەڕە رەخنـەیان لـەسـەر کارنامـەو رابردوو هەڵەکانی خۆیان لـە پێش ئەو مێژووە نووسی‌و پوختەیەکیشیان بڵاوکردەوە.

گۆڕینی هەندێ ڕژێمیش، بەدوای خۆیدا هێنای، دیسانەوە کاریگەری خۆی هەبوو لەسەر ئەوەی ئەو بەشە لە ڕەوتی ئیسلامی کە خۆی بە میانەڕەو پێناسەکردبوو، هەوڵبدات لە ئاسۆیەکی کراوەتری فیکری‌و سیاسییەوە دووبارە ئەو چەمکە پێناسە بکاتەوە، بۆ ئەوەی لە ڕوویەکەوە نەبێتە ئامانجی ئەو شاڵاوە جیهانییەی بە ناوی دژایەتی تیرۆرەوە ڕووی لە ناوچەکە کردبوو، لەلایەکی تریشەوە، خۆ ئامادە بکات. بۆ ئەوەی ئەو بۆشاییەی لەو ڕووەوە دروست دەبێت تەوزیف بکات‌و وەڵامی سیاسییانە بە هەوڵی پەراوێزخستن‌و دۆسێ تێکەڵکردنیان لەگەڵ باڵە توندوتیژو تیرۆریستەکەی حسابکراو لەسەر ڕەوتی ئیسلامی بداتەوە.

هەر لە کۆتایی هەشتاکان‌و سەرەتای نەوەدەکانیشەوە، کۆمەڵێ بیرمەندو ناوەندی فیکری‌و ئەکادیمی‌و توێژەر بەدوای ئەم تەوژمەو سروشت‌و جۆری گەشەکردن‌و گوزارشت لە خۆ دانەوەیەوە بوون. لە هەوڵی پێناسەکردن‌و دیاریکردنی جیاوازییەکانی لەگەڵ جوڵانەوەی ئیسلامی (ئیسلامی سیاسی)دا بوون، بۆ ئەم مەبەستەش سەرلەنوێ ئیسلامی بوونیان لە چوارچێوەی ئایدۆلۆژیاو جوڵانەوەی نوێدا پێناسە دەکرد، وەك بەشێ لە دیاریکردنی قۆناغی دوای ئەو، کە بە زیاد لە ناوێك ناوزەدیان کردووە، لە وێنەی: پاش ئیسلامی بوون، پاش ئیسلامی سیاسی، ئیسلامی دیموکراسی، ئیسلامییە نوێکان. کۆمەڵێ نووسەری تریش لە بەرامبەرەوە دیدێکی ڕەخنەییان بۆ ئەم خوێندنەوەیە هەبووە،

لەگەڵ هەندێ لە دەستپێك‌و وێناكردن‌و شیكردنەوەكاندا ناكۆك بوون[1].

ئەم بیرمەندو توێژەرانە زیاد لە پێناسەیەكیان بۆ رەوتی ئیسلامی كردووە، بەڵام نزیكەی هەموویان لەڕووی دیاریكردنی جەوهەری رەوتەكەوە لە یەكتر نزیكن. جیاوازییەكان هێندەی لە شێوەی دەربڕینداین لە جەوهەرو ماهیەتدا نییە. بۆ نموونە نووسەری توورك (مومتاز ئەرتوركونە) دەربارەی ئیسلامی بوون، یاخود ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ دەڵێت: "هەوڵێكە بۆ ئەوەی ئیسلام باڵ بەسەر هەموو بوارەكانی ژیاندا بكێشێ. لە فیكرەوە بۆ سیاسەت‌و كارگێڕی‌و یاسا، وە تێكۆشین بۆ دۆزینەوەی چارەسەر بۆ كێشەی وڵاتە تازە پێگەیشتووە ئیسلامییەكان لە بەرامبەر خۆرئاواوە، لە میانەی دروستكردنییەكیەتی‌و یەكتر تەواو كردن لە نێوان موسڵماناندا"[2]. (مارتن كرایمر)یش پێی وایە ئیسلامی بوون ئاماژەیە بە ئیسلام لە بەرگی ئایدۆلۆژیایەكی نوێ‌و بەرنامەیەكی سیاسییدا[3].

(فرید هالیدای)یش دەربارەی هەمان مەبەست دەڵێت: "ئەو رەوتە سیاسییە رێكخراوەیە كە بنەچە نوێكانی دەگەڕێتەوە بۆ دامەزراندنی كۆمەڵەی برایانی موسڵمان لە میسر لە ساڵی ١٩٢٨ كە هەوڵدەدات بۆ

---

[1] د. هبة رؤوف، ما بعد الأسلاميون: نظرة نقدية، areax.facebook.com.. لە بنەڕەتدا ئەم وتارە لە ژمارە (٥٢)ی (ئۆكتۆبەری ٢٠١٣)ی گۆڤاری دیموكراسی بڵاوبۆتەوە كە دامەزراوی (الأهرام) دەری دەكات.

[2] www.fekr_online.com.. اغسطس /٢٠١٤.

[3] د. محمد موختار، سەرچاوەی پێشوو.

چارەسەرکردنی کێشە ساسییە هاوچەرخەکان لە ڕێگەی گەڕانەوە بۆ دەقە ئیسلامییەکان[1].

(دکتۆر (سعدالدین ابراهیم)یش پێی وایە: "جولاَنەوە ئیسلامییەکان لە پێناو بیناکردنی سیستمێکی کۆمەڵایەتی نویّ لەسەر بناغەی ئیسلام تێدەکۆشێت"[2]. ئەم پێناسانە بە گشتی بە دەوری پرسی بە ئیسلامی کردنی (اسلمة)ی کۆی بوارەکانی ژیانو بە ئایدۆلۆژی کردنی ئیسلام، لەڕێی خەباتێکی سیاسی کۆمەڵایەتی ڕێکخراوەوە، دەخولێنەوە.

ئەوەش دەخوازێت بەشیّ لە تێگەیشتنمان بۆ تێگەیشتن لە جۆری سەرهەڵدانو پەیامو گۆڕانکارییەکانی ناوی لە ئێستادا، بە حەمکی نویّ بوونی شێوازی ئیشکردنو سەرهەڵدانی لەژێر کاریگەری دەرهاویشتەکانی مۆدێرنەدا، پەنابەرینە بەر کۆمەڵناسیو ئەو شێوازانەی سروشتو سەرهەڵدانو وەزیفەی جولاَنەوە سیاسی کۆمەڵایەتییەکانمان بۆ لێکدەدەنەوە. کۆمەڵناسی ئاینیش کە لە ناوەرۆكو سروشتە کۆمەڵایەتیو مێژووییەکەی ئاین دەکۆڵێتەوە، دەتوانێت هەندیّ خزمەتمان پیّ بکات.

بەشێوەیەکی گشتیش (٣) هۆکار رۆڵیان لە سەرهەڵدانی ڕەوتی ئیسلامی بە باڵە جیاوازییەکانیەوە هەبووە، کە لە بەلەرزەکەوتنی عەقیدە، ستەمو خراپەکاریو هەڕەشەی دەرەکی دا خۆیان دەبیننەوە.

[1] مدخل عام لفهم الحركات الأسلامية المعاصرة.

[2] سەرچاوەی پێشوو. ٢٠١٠/١/١٧

ڕەوتە ئیسلامییەکان بەگشتی بەدوای خەونی ئالوگۆڕی سیاسیو کۆمەڵایەتییەوە بوون، بارودۆخە لەئارابووەکانیان ڕەتکردۆتەوە، لەو ڕوانگەوە کە لەباری سەرنجی ئەوانەوە لە بازنەی ئیسلامی دروست دەرچوون، لەوێشەوە هەوڵەکانی لە بواری دووبارە بەرپاکردنەوەی ئیسلام وەك سیستمێکی هەمەلایەنە بۆ ژیانی کۆمەڵایەتیو سیاسی موسڵمانان چڕکردۆتەوە.

بەڵام نابێ وابزانین لە سۆنگەی ئەم ئامانجانەوە، ڕەوتی ئیسلامی ڕەوتێکی تەقلیدی پێش مێژووی نوێیە، چونکە یەکێ لە خەسڵەتە جیاکەرەوەکانی جوڵانەوەی ئیسلامییەکان، مۆدیرن بوونیانە، بزووتنەوەگەلێکن لەژێر باڵی مۆدیرنەو وەك فۆرمێکی وەڵامدانەوە بۆ تەحەداکانی ئەو سەریان هەڵداوە[1]. بەڵام لە هەمانکاتدا مۆرکێکی دژە مۆدێرنەشیان هەیە، چونکە هەندێ ڕووی ڕەتدەکەنەوەو بانگەشەی زیندووکردنەوەی هەندێ فۆرمی سیاسی پێش مۆدیرنە دەکەن. بەڵام بە تەکنیکی مۆدیرنەوە، ڕەنگە بەیەکەوە وروژاندنی پاش مۆدیرنەو پاش ئیسلامیش لەم ڕووەو بێ هودە نەبێت. بەڵام سەبارەت بە ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ لە قۆناغی پاش مۆدێرنەدا، بەڕووی مۆدیرنەدا دەکرێتەوە، بەڵام بەڕۆحی دوای مۆدیرنەوە، کە ئاماژەیە بە کۆتایی هاتنی حیکایەتە گەورەکانو کەڵکەڵەی هەژموونو کۆنترۆڵکردنو یەك ڕەنگکردنی کۆمەڵەکان و گەڕانەوە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ جیاوازییەکانو دانپیانانو ئیدارەکردنیان.

---

[1] مدخل عام لفهم الحركات الأسلامية المعاصرة.

## ئیسلامییه نوێكان و دووباره بیناكردنهوهی چهمكهكان

چـهمكی پـاش ئیـسلامی ئـاخود ئیـسلامییه نوێكـان روانگهیهكـه بـۆ دووباره ههڵسهنگاندنهوهی ئهو هێزه شاراوانهی لهپشت ئهو ئـاڵوگۆڕو گۆڕانكاریانهیه وهك له سـیاقه كۆمهڵایـهتیو سیاسـییهكاندا بهسـهریاندا هاتووه یاخود دێن[1].

بهشێ له لێكۆڵـهرهوهكان ئـهم زاراوهیـهیان وهك ئامـاژه بـۆ كۆتـایی هـاتنی قۆنـاغی ئیـسلامی جـهنگاوهرو دهسـتپێكردنی قۆنـاغێكی نـوێی ئیــسلامییهكان بــهكارهێناوه، كــه تیایــدا لــهبری بــهكارهێنانی هێــز رووده‌كه‌نه هه‌ڵبژاردنه‌كان[2].

نووسهری ئهمریكی بهڕهچهڵهك ئێرانیش (ئاسف بهیات) چهمكهكهی بهكارهێناوه بۆ ئاماژهكردن به قۆناغی دوای ئیمام خومهینی له كۆماری ئیسلامی ئێراندا. ئهو پێی وایه چهمكهكه بۆ دهربڕینی ئهو حاڵهتهیه كه رهوایهتی جوڵانهوهی ئیسلامییهكان له فۆرمه كۆنهكانیانداو به دروشمو میكانیزمـه تهقلیدییـهكانیان بـهرهو پوكانـهوه دهچـن، بۆیـه دهكهونـه خۆیان و له ههردوو رووی فیكـریو سیاسـییهوه، خۆیـان تێدهپـهڕێننو دهچنه قۆناغێكی نوێی كاركردنهوه[3].

---

[1] مابعد الأسلاميون: الأوجه المتغيرة للأسلام السياسي (كتاب) عرض: محمد مسعد العربي. Stadies eqjazeera.net، سێشهمه : ١٨/نوفهمبهر/٢٠١٤

[2] سهرچاوهی پێشوو، ئهمهڕاو پێناسهی لێكۆڵهری فهرهنسی (ئولیفیه روا)یه له كتێبـی (شكـستی ئیسلامی سیاسی)دا.

[3] سهرچاوهی پێشوو.

هەر ئەو دەڵێت: بەڵام نابێت وا تێبگەین کە پاش ئیسلامی دژایەتی ئیسلامی دەکات، یاخود نائیسلامیو عەلمانیەتە، بەڵکو پێشخستنی ناوەرۆكو ئاماژەکانی ئیسلامی بوونە، دەرخەری هەوڵێکی هۆشیارانەیە بۆ بەیەکەوە گرێدانو تێکەڵکردنی ئاینداریو کولتوری ماف، ئیمانو ئازادی، ئیسلام ئازادی تاك، فرەیی لەجیاتی تاکڕەوی، مێژوویی بوون، جەختکردنەوە لەسەر ماف لەبری ئەرکەکان، دواڕۆژی لەبری رابردوو، بەڵام لەگەڵ بانگەشەکردن بۆ دەوڵەتی مەدەنی لە بری دەوڵەتی ئیسلامی (دینی)، هەوڵی ئامادەبوونی ئاین لە بواری گشتی دا دەدات[1].

لێکۆڵەرەوە خۆرئاواییەکانیش پارتی دادو گەشەپێدان تورکیایان بە پێشەنگی ئەو پارتانە دەزانن کە ئەم چەمکە بەرجەستە دەکات. ئیسلامییە تورکەکان لەچوارچێوەی ئەزموونی پارتی دادو گەشەپێدانی تورکیادا تێکەڵ بە کاری سیاسی بوون بەناوی گەلەوە، نەك ئیسلام. خزمەتی خەڵكو خودایان بەیەکەوە گرێ دا. لە میانەی خۆجیاکردنەوەشیان لە ئیسلامی تەقلیدی رایانگەیاند کە (**ئیسلام ئایدۆلۆژیا نییە، قورئانیش دەستوور نییە**) ئیسلام وەك بەرنامەیەکی سیاسی بۆ حیزبو تەوژمێکی دیاریکراو سەیر ناکات، بەڵکو هەوڵدەدات لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، لە پەیوەندیدا بێت لەگەڵیداو لە ئاستی

---

[1] د. هبة رؤوف عزت/ الخيال السياسي للأسلاميين، ماقبل الدولة و ما بعدها، الشبكة العربية للأبحاث و النشر، ٢٠١٥، ص١١٣.

کۆمەڵگـەدا بگەشـێتەوە، لەچوارچـێوەی خـودی دەوڵەتـە عەلمانییـە دیموکراسییەکەدا کۆمەڵگەیەکی خۆپارێز پەرە پێ بدات[١].

چەمکی پاش ئیسلامی ئاماژە نییە بە (دابـڕان) بـەڵکو ئاماژەیـە بـە ئاڵو گۆڕ و گۆڕانکاری (التحول)، چەمکەکە لە نەوەدەکانەوە سوودی لێ وەرگیراوە بۆ چاودێریکردنی ئاڵو گۆڕەکانی نێـو دیـاردە و جوڵانـەوەو ناوەندە ئیسلامییەکە لە هەردوو ئاستی گوتارو پیادەکردن. بەبڕوای من مەسەلەکەش زیـاتر بـەوەی بـە شکـستی خـودی ڕەوتـە ئیـسلامییەکان لێکبدرێتەوە، بە توانای لەخۆنیشاندانی ئەوان بۆ پێنانە نـاو قۆنـاغێکی تر راڤە دەکرێت، ئەوان گەر بەمانای وشە شکستیان بخواردایە، توانـای وەڵامدانەوە بە تەحەداکانی قۆناغەکـەو خۆگونجانـدنیان لەگـەڵ ئەرکـە نوێکان نـەدەبوو. بەواتایـەکی تـر ڕەوتـی ئیـسلامی یـاخود بەشـی لـەو ڕەوتە کاتێك هەست بەوە دەکات دەستگرتن بە هەندێ دروشمو ئامانجو فۆرم هیچ پاساوێکی لۆژیکی نەماوەو لە بەرژەوەندی خۆیو کۆمـەڵگادا نییە، کار لەسەر دووبارە خۆ بیناکردنەوەی فیکـریو سیاسـی دەکـات. بــەکردەوە بــە سـیفەتی تــەوژمو ســەرمایەیەکی مرۆیــیو بنکەیــەکی جەماوەری ڕێ لەوە دەگرێـت شکـست بخـواتو مێـژوو بـەجێی بێڵێـت، چونکە شکست لەمێژوو بەجێ مانو خۆنوێکردنەوەو نەگەڕانـە بـەدوای جێگرەوەو فۆرمو شێوازی کارکردنی نـوێو تازەکردنـەوەی میکـانیزمو ئامرازەکانـدا. ڕەوتــی ئیــسلامی مێــژوویی ناوچــەکە لەســەر دەســتی

---

[١] محمد مسعد العربی،....... سەرچاوەی پێشوو.

ئیسلامییە نوێکاندا، لە دۆخی کارو کاردانەوە دەردەچێت، کە مۆرکێکی جیاکەرەوەی ئایدۆلۆژیاو جوڵانەوەی ئیسلامی نوێو تەقلیدی ناوچەکە بوو، دوای نزیکەی (١٠٠) ساڵ لە روخانی سەڵتەنەتی عوسمانی و (٢٠٠) ساڵ ئامادەبوونی خۆرئاوا و مۆدیرنە لەجیهانی ئیسلامی دا، چیدی ئەم باسو خواسانە بەو شێوەی لە ئەدەبیاتی رەوتی ئیسلامی نوێدا خراونەتە ڕوو، بۆ ئەم جێ بایەخ نینو لەو روانگەی رەتکردنەوەی پرۆسەی روخانەکەو دووبارە گێڕانەوەی ئیمپراتۆریەتو دژایەتی خۆرئاواگەرایی و نوێگەریو مۆدیرنەوە، گوتارو ئەركو دروشمو ئامانجەکانی دادەڕێژێت. بەڵکو دان بەڕاستی دەوڵەتی نوێدا دەنێتو تێگەیشتنی بۆچۆنیەتی بەدیهێنانی خواستی هاوکاری ئیسلامی و خۆرئاواگەرایی نوێ دەکاتەوە. لەبری رەتکردنەوەی نوێگەری و مۆدیرنەش هەوڵی بە ئەنجامگەیاندنی ئەرکی نوێکردنەوەی وڵاتەکان دەداتو بە بۆنو بەرامەیەکی خۆماڵیو سوودوەرگرتن لە ئەزمونگەلی وەك یابان. کە پێمان دەڵێت دەکرێت مۆدیرنەو موحافیزکاری کۆمەڵایەتی پارێزگاری لە شوناس بەیەکەوە کۆبکرێنەوە.

با لێرەدا چی تر ئەم بابەتە درێژ نەکەینەوە، بەڵکو ئاماژەیەکی کورت بە هەندێ لە دیدگا فیکرییەکانی ئیسلامییە نوێکان جیاوازیان لەگەڵ رەوتی ئیسلامی تەقلیدیدا بکەین بە مەبەستی تێگەیشتن لە بنەڕەتی بابەتەکەمان، کە پەیوەستە بە بانگەشەی سەربەخۆکردنی کاری بانگەواز لە کاری سیاسیو دووبارە دارشتنەوەی هەردووکیان لەبەر روناکی واقیعی نوێی کۆمەڵگە موسڵماننشینەکانو

پێداویستییەکانیانو پێشمەرجەکانی گەشەکردنی تەوژمی ئیسلامی خۆی... ئەو پرسانەی لێرەشدا بە کورتی ئاماژەیان پێدەکەین ئەمانەی خوارەوەن:

**یەکەم: قبوڵکردنی دیموکراسی**: رەوتی ئیسلامییە نوێکان لە ئێستادا نەك هەر دیموکراسیان وەك شێوازێکی عەقڵانیو ئەزموونکراو، بۆ کۆنترۆڵکردنی دەسەڵاتو سنووردارکردنو بەڕێوەبردنی ئاشتیانەی ململانێکانو وەلانانی توندوتیژی لە کایەی سیاسیو دەستەبەری سەرەتا، هاوڵاتێتی لە ژیانی سیاسیو فرەییو ئاڵوگۆڕی ئاشتیانەی دەسەڵات، قبوڵ کردووە، بەڵکو چاوەڕێی ئەوەیان لێ دەکرێت ببنە پێشەنگی وڵاتەکانیان بۆ گەیشتن بە ساتەوەختی ئاڵوگۆڕی راستەقینەی دیموکراسی. بە حوکمی ئەوەی بەبڕوای نووسەری ئەم بابەتە دیموکراسی کاتێك لە جیهانی ئیسلامیدا رەگ دادەکوتێ و سەقامگیر دەبێت، کە ببێتە هەڵقەیەکی گەشەکردووی خودی فیکری ئیسلامیو بەشێکی سروشتی فەرهەنگی رۆژانەی خەڵك.

قبوڵکردنی دیموکراسی فەلسەفیش نەك ئامێری، کە ئیسلامی سیاسی بڕوای پێ بوو، چەندین دەرهاویشتەی فیکریو سیاسیو رێکخراوەیی سەبارەت بە ئیسلامییە نوێکان بەدواوەیە، لەوانەش:

١. بەستنەوەی پرۆژەکەیان و ئاستی پەسەندیو رەوایەتی سیاسیان بە ئیرادەی گەلو کێبڕکێی ئازادو دروستکردنی دەوڵەتی دامەزراوەکانو سەروەری یاساوە، لە بری سەرکردەی تاقانەو تاك حیزبی.

٢. ئیشکردن لە چوارچێوەی یاسادا، کە تیایدا شێوازو میکانیزمە ڕێگاپێدراوەکانی سیاسەتکردن خراوەتە ڕوو، لەوانەش قەدەغەکردنی بەکارهێنانی زمانێکی دینی رووتو خۆ بە نوێنەری ئیسلام نیشاندان لە پرۆسەی سیاسیو کۆمەڵگەدا.

٣. پێویستی رێکەوتن لەسەر دەستوورێکی مەدەنی کە تیایدا مافو ئازادییە گشتییەکان پارێزراو بنو گەل سەرچاوەی دەسەڵات بێتو پەیوەندی نێوان دینو دەوڵەت چۆنیەتی گرتنەدەستی دەسەڵات و ئاڵوگۆڕپێکردنی روونکرابنەوە، دەستوور لەڕووی سیاسییەوە دەبێت بە (نص) کە ئیجتیهاد لە بەرامبەریەوە قبوڵ نییە.

٤. داننان بە چەمکی هاوڵاتی ئازادو یەکسان، واتە بەوەی کە تاکەکان بەدەر لە ئاینو مەزهەب و نەتەوە و زمانو پێگەی کۆمەڵایەتی و ئینتمای فیکریو سیاسیان، بە حوکمی ژیانیان لەسەر نیشتمانێك و سایەی دەسەڵاتێکی سیاسی هاوبەشدا خاوەن مافو ئەرکی وەك یەکن و نابێت هەڵاواردنیان لە نێواندا بکرێت.

٥. بەستنەوەی رەوایەتی سیاسی بە متمانەی هاوڵاتیانو دەنگی جەماوەرو گەلەوە. نەك ئاینو شەریعەت، کە لەڕێی هەڵبژاردنە خولییەکانەوە دەبەخشرێت و دەشسەنرێتەوە.

٦. رێژەیی بوونی فیکرو چارەسەرو تەرحو بۆچوونو بەرنامەی سیاسیو سەیرکردنی رەخنەی بەرامبەر، لە چوارچێوەی یاسادا، وەك مافێکی یاسایی، واتە ئیسلامییە نوێکان وەك هەڵگرانی گوتاری رەوتی ئیسلامی تەقلیدی خۆیان بە هەقی رەها نازانن.

٧. داننان به فرەیی سیاسیو فیکریو دەستهەڵگرتن له ڕێگانـەدان بـە بەرامبـەرو راسـتی لـەخۆدا کۆکردنـەوەو یەکسانکردنی فرەیـی بـە خراپەو سەرچاوەی ئاژاوەو لاوازی ئوممەت، بەو جۆرەی لە ئەدەبیاتی رەوتی ئیسلامیدا خراوەتە ڕوو.

٨. داننان بە ئازادییە تاکە کەسییەکانو جیاکردنـەوەی گوناھ لـە قەدەغـەکراوی یاسـایی و بڕوابـوون بـە مـافو ئازادییـە تایبـەتیو گشتییەکان لە چوارچێوەی دەستووری سازان لەسەر کراودا[1].

٩. جیاکردنەوەی (ئیسلام) و (ئیسلامی) لە یەکتر، کە لە نموونەی ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نویو ئیسلامی سیاسی دا بەیەکداچوونو لەگـەڵ یەکتردا بـە شـێوەیەکی نامەنهـەجی و وەك پێداویستییەکی ئایـدۆلۆژی تێکەڵ بەیەك کراون. لە نموونەی ئیسلامییە نوێکاندا، ئیسلام بۆ خەڵك ناخرێتە روو، واتە ئیسلام لە رەوتی ئیسلامیدا کـورت ناکرێتـەوەو وەك ئاینی گـشتی کۆمەڵگـە دەمێنێتـەوە، شـەریعەتیش لـە بـەرگی (فقـە)ی مێژوویی ئیسلامیدا وەك چارەسەر ناکرێت بە دروشمی هەڵبژاردن، بـەو جۆرەی رەوتی ئیسلامی لە سایەی رژێمـە نادیموکراتییـەکانی ناوچـەکە دەیکرد بە دروشمی هەڵبژاردنە سنووردارەکەی خۆی، بەڵکو بـە ئیلـهام

---

[1] لەم رووەوە خوێنەر دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ :

ـ الأسلاميون و نظام الحكم الديمقراطي، ص٤٧-٧٧.

ـ ئەبوبەکر عەلی، ئیسلامی بوون لـە قۆناغی پاش ئیسلامی دا، ل٨٧٧١٧٥٠١.

ـ دکتور جاسم عودة، بين الـشريعة و الـسياسة: أسـئلة لمرحلـة مابعـد الثـورات، الـشبكة العربيـة للأبحاث و النشر، ٢٠١٢.

وەرگـرتن لـە بـەها ئیـسلامییەکان و کولتـوری نەتـەوەیی و پێویـستی چاوەڕوانییەکانی کۆمەڵگـە، بەرنامەیـەکی هەڵبـژاردن دادەڕێـژێت و لـە روانگەی ئەوەوە متمانەی خۆیانی پێ ببەخشن.

**دووەم/ نشتمانی بوون**: رەوتی ئیسلامی لە سۆنگەی سێ هۆکـارەوە خۆی بە رەوتێکی جیهانی پێناسە کردووەو دانوی لەگەڵ نەتەوایـەتی‌و نیشتمانپەروەری نوێشدا لە سنورێکی دیاریکراودا زیاتر نەکوڵاوە، بەڵکو یەکـسانی کـردووە بـە دەمـارگیری خێڵایـەتی‌و نـەفامی[1]، ئـەو سـێ هۆکارەش ئەمانەن:

(أ) خۆتێکەڵکردن لەگەڵ ئیسلام‌و نوێنەرایەتی کردنی، کـە ئیـسلام لە بنەڕەتدا هەڵگری گوتارێکی جیهانی نەتەوەو نیشتمان برە.

(ب) وێناکردنی دوژمنە ئایدۆلۆژی‌و سیاسییەکان بە وێنەی کۆمەڵی جوڵانـەوەی جیهـانی: خاچپەرسـتی جیهـانی، زایـۆنیزمی جیهـانی، کۆمۆنیزمی جیهانی.

(ج) هەوڵـدان بـۆ گێڕانـەوەی قـەوارەی نێودەوڵـەتی ئیـسلام‌و خەلافەت، کە دان بە سنوورە نەتەوەیی‌و نیشتمانییە نوێکاندا نانێت.

هەر ئەمەش هۆکارێ بوو بۆ ئـەوەی (برایـان) لەگـەڵ ناسـیۆنالیزمی عەرەبیدا بەیەکدا بدەن‌و ئیسلامییە کوردەکان تـا هەشـتاکانی سـەدەی رابـردوو نـەتوانن رێکخـراوی ئیـسلامی سـەربەخۆ دابمـەزرێنن‌و، ببنـە هەڵگری ئامانجەکانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کوردستان.

---

[1] بۆ نموونە بڕوانە: ئەبو ئەعلای مەودودی، الحکومة الأسلامیة،

ئیسلامییه نوێکان به پێچەوانەی ئەو گوتارەوە، دەستو پەنجه لەگەڵ واقیعی نیشتمانی ولاَتەکانیان نەرم دەکەنو گوتارە ئیسلامییەکانیان، لەگەڵ گوتاری نەتەوەیی و نیشتمانیدا متوربە دەکەن، وەك بەشێ لە پێویستییەکانی خۆنوێکردنەوەی فیکریانو ئاشتبوونەوە لەگەڵ کۆمەڵگەو لەخۆگرتنی خەمەکانی، ئەمە بەبێ ئەوەی واتای ئەوە بێت ئەرکەکانیان لە بازنەی (ئیسلامی)و لەویش فراوانتر (مرۆڤایەتی)دا لەبیر بکەن. بە حوکمی ئەوەی دەمارگیریو بەسەرخۆدا داخرانی نەتەوەیی لەگەڵ بەها ئیسلامییەکانو لۆژیکی سەردەمو واقیعی جیهانگیریو بوونی سیستمێکی هاریکاری و هاوکاری نێودەوڵەتی سازگار نییە. بەلاَم ئەم هێزانە نەك هەر بەم پاساوانە واقیعی ولاَتەکانیان نادیدە بگرن، بەڵکو لە (نیشتمانی بوون)ەوە دەگەڕێنەوە بۆ ئەرکە ئیسلامیو ئینسانییەکان[1]، چونکە ئەم هێزانە وەك جاران هێزی ئایدۆلۆژی ژێر زەمینو راوەدوونراو نین، بەڵکو هێزی سیاسی گەورەو حساب بۆ کراون و، لە هەندێ ولاَتیشدا دەسەلاَتیان بەدەستەوەیە، ئەوەش ناچاریان دەکات ببنە پارێزەری بەرژەوەندی گەلەکانیانو لەو سۆنگەوە بڕواننە هاوکاری ولاَتانی تری ئیسلامیو بەئەنجامگەیاندنی ئەرکی لاکردنەوە لە بێبەشانو سزادراوانی سەر ڕووی زەمین، یاخود بەدەمەچوونی ئەو هەڕەشە هاوبەشانەی هەڕەشە لە کۆی مرۆڤایەتی دەکەنو خەمی هاوبەشی سەرجەم ولاَتانو گەلەکانن[2].

---

[1] ئەبوبەکر عەلی، ئیسلامی بوون لە قۆناغی پاش ئیسلامی دا، لا

[2] بۆ زیاتر رۆشنبوونەوەی ئەم پەیوەندییەو چۆنیەتی گونجاندنی ئەم سەرەتایە لە بەرنامەی بەشێ لە پارتە نیشتمانییە پاشخان ئیسلامییە هاوچەرخەکان بگەڕێرەوە بۆ / ئەبوبەکر عەلی، سەرچاوەی پێشوو، لا ٤٠-٥٨.

**سێهەم: کارکردن لە چوارچێوەی دەوڵەتی نیشتمانی نوێ دا:** یەکێ لە جیاکەرەوەکانی ئایدۆلۆژیای رەوتی ئیسلامی نوێ، داننەنان بووە بە دەوڵەتی نیشتمانی نوێ دا. هۆکاری ئەوەش روونە و پەیوەستە بە هەوڵی دووبارە گێڕانەوەی خەلافەتو یەکگرتوویی جیهانی ئیسلامو یەکسانکردنی سەرهەڵدانی قەوارە نوێکان بە پیلانگێڕی ئیستیعمار بۆ پارچە پارچەکردنی جیهانی ئیسلامیو دوژمنایەتیکردنی ئیسلامو گەلانی موسڵمان[1]. ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ بەشێوەیەکی کاتیو بەناچاری دان بە چوارچێوەکانی ئەم دەوڵەتەدا دەنێن، بەڵام بە قەناعەتی خۆی دوای بەتاڵکردنەوەی لە ناوەرۆکە مۆدیرنە نائیسلامییەکەی و پڕکردنەوەی بە جێگرەوەی ئیسلامیو کردنی بە ئامرازێك بۆ پیادەکردنی شەریعەتو هەوڵدان بۆ دووبارە گێڕانەوەی خەلافەتو تێپەڕاندنی. ئەم جۆرە لە دەوڵەتیش لە ئەدەبیاتی ئیسلامی نوێدا بە (دەوڵەتی ئیسلامی) ناسراوە، کە دەوڵەتێکە لەسەر بناغەی ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێو بۆ بە ئیسلامی کردنەوەی کۆی ژیانو سەپاندنی ئەخلاقو یاسای ئیسلامی بەسەر تاكو کۆمەڵگەدا دامەزراوە[2].

[1] لەم رووەوە خوێنەر دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ: ــ فتحي يكن، العالم الأسلامي و المكائد الدولية خلال القرن الرابع عشر الهجري، مؤسسة الرسالة. ـــ عبدالله ناصح علوان، القومية في ميزان الأسلام، دار السلام. ــ أنور جندي، سقوط مفهوم القومية الوافدة، دار الأنصار. ــ محمد قطب، مذاهب فكرية معاصرة، دار الكتاب الأسلامي، قم.

[2] لەبارەی چەمکی دەوڵەتی ئیسلامی لە ئەدەبیاتی ئیسلامی نوێ دا بگەڕێرەوە بۆ/ ئەبوبەکر عەلی، دەوڵەتی ئیسلامی فۆرمێکی تری بەرهەمهێنانەوەی دەوڵەتی عەلمانی شکستخواردووی

## روانگەی ئیسلامی نوێکان بۆ دەوڵەت:

بۆ بنیاتنانی دیدێکی قوڵ بۆ دەوڵەت بە سیفەتی پرۆژەیەکی تەواوکار بۆ دادپەروەریو کۆمەڵایەتیو کەرامەتی ئینسانی هەژارییەکی زۆری پێوە دیارە[1]، ئیسلامییە نوێکان بەوە دەناسرێنەوە کە دەسبەرداری دروشمی دەوڵەتی ئیسلامی بوونو پرۆژەی دەوڵەتی نیشتمانی نوێیان قبوڵ کردووەو لەچوارچێوەی رەوایەتی ئەودا دەجوڵێنەوەو پرۆژە سیاسییەکەیان دادەڕێژن. بە حوکمی ئەوەی ئەم دەوڵەتە راستییەکی ئەم قۆناغەی مرۆڤایەتیو سەراپای جیهانەو سیستمی نێودەوڵەتی لەسەر داڕێژراوە. قبوڵنەکردنی یەکسانە بە خۆبردنە دەرەوەی سیستمی نوێی جیهانیو پێوەرەکانی، بەبێ بوونی هیچ جێگرەوە (بدیل)ێك، کە جگە لە کارەسات هیچی تری بەدوادا نایەت[2].

---

ناوچەکە، خوێندنەوەیەك لە ئەدەبیاتی بریانی موسڵمان و دامەزرێنەرەکەیدا، گۆڤاری خاڵ، ژمارە/٧، تشرینی یەکەم/ ٢٠١٦. هەروەها دکتور عبدالله بلعزیز، الدولة في الفكر الأسلامي المعاصر، چاپی دووەم، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ٢٠٠٤.

وە.. أ محمد جيرون، مفهوم الدولة الأسلامية أزمة الأسس و حتمية الحداثة، المركز العربي للأبحاث و دراسة السياسات، بيروت، ٢٠١٤.... د. محمد سليم العوّا، في النظام الأسلامي للدولة الأسلامية، دار الشروق، ١٩٨٩.

[1] د. هبة رؤوف، سەرچاوەی پێشوو،ل١١٨.

[2] لەم بارەوە خوێنەر دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ / د. اسماعيل الشطي، الأسلاميون و حكم الدولة الحديثة، منشورات ضفاف، بيروت ـ لبنان، ٢٠١٣.

قبوڵکردنی پرۆژەی دەوڵەتی نوێ (کە لە زۆربەی جیهانی ئیسلامیو بە تایبەت جیهانی عەرەبیدا پرۆژەیەکی ناکاملە) واتە: رازی بوون بەوەی دەوڵەت ناوەندێکی بێلایەنی ئیجابی بێت، بۆ هەموو پێکهاتەکانی ناوی ببێتە ناوەندێك بۆ خەملاندنی ناسنامەیەکی هاوبەشو یەکگرتوو بۆ هاولاتیانو شوێنێ بۆ ئینتما، هەروەك واتای رەتکردنەوەی سەپاندنی ئایدۆلۆژیایەکی دیاریکراو بەسەر دەوڵەت و کۆنترۆڵکردنی لەلایەن تەوژمو گروپو هێزێکەوە، لەگەڵ جیاکردنەوەی سیستمی سیاسیو حکومەت لە دەوڵەت.

دەوڵەت لەم دیدە ئیسلامییە نوێیەدا پێویستییەکی وەزیفیو عەقلانییە بۆ گرێبەستێکی ئارەزوومەندانەی نێوان هاولاتیان، بۆ خزمەتکردنی بەرژەوەندییە هاوبەشەکانی نێوانیان، لە چوارچێوەیەکی جوگرافیی دیاریکراودا، نەك پێویستییەکی ئەخلاقی بێتو هەندێ حوکمی ئەخلاقی دیاریکراو بیسەپێنێت. لە چوارچێوەی ئەم دەوڵەتەدا فەزای گشتیو تایبەت لە یەکتر جیادەکرێنەوە، فەزای گشتی یاسا رێکی دەخات، بەلام فەزای تایبەت بە یاسا رێکناخرێتو بەجێ دەهێڵرێ بۆ ئاینو ئەخلاقو بیرکردنەوەی تاکەکان بۆ ژیان و دوارۆژی خۆیان، لە چوارچێوەی فەزا گشتییە رێکەوتن لەسەر کراوەکەدا[1].

---

[1] الأسلاميون و نظام الحكم الديمقراطي، ص٥٩.

## چوارەم: تێگەیشتنێکی نوێ بۆ ناوەرۆك و واتای ئیسلامی بوون:

لەسەرەتای ئەم بابەتەوە ناوەرۆکی بانگەواز و ئیسلامی بوونمان لە چوارچێوەی ئایدۆلۆژی ئیسلامی نوێدا دەگرێتەوە، تێگەیشتنی رەوتی ئیسلامی نوێ بۆ ئیسلامی بوون سیماو خەسڵەتی خۆی هەبووە، لەوانەش:

- بڕوابوون بە هەمەلایەنەبوونی ئیسلام.
- هەمەلایەنە بوونی رێکخراوو دەوڵەتی ئیسلامی.
- رەتکردنەوەی فرەیی سیاسیو فیکری.
- جیهانی بوون.
- شەریعەتمەداری.

لەم مۆدێلەدا ئیسلامیو ئیسلامی بوون، واتە تێگەیشتن لە ئیسلامو هەوڵدان بۆ بەرجەستەکردنی لە ئایدۆلۆژیاو رەوتو دامەزراوەی نوێدا، بەناویەکدا چوون، ئیسلامی بوون گوزارشتێکی نوێیە بۆ دووبارە دامەزراندنەوەی ئیسلام لە پێگەی یاساو دەسەڵاتو ئاراستەکردنیدا لە دنیای نوێ دا، بەشێکی جیانەکراوەو دینامیکیەی خودی ئیسلامە، لەم تێگەیشتنەدا ئیسلام و ژیانو مرۆڤ هیچیان قابیلی بەشکردن نین، دەبێت هەموو ژیان، هەموو مرۆڤ بە هەموو ئیسلام حوکم بکرێتو ئاراستە بکرێت؟!. هەروەك لە پێشەوە ئاماژەمان پێکرد دەرکەوتەی ئیسلامی بوون سەرەتاو کۆتایی هەیە، سەرەتاکەی لە دروستکردنی تاکی موسڵمانەوە دەست پێدەکات، بە دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامیدا تێدەپەڕێت تا مامۆستایەتیو رابەرایەتی کردنی سەراپای جیهان.

لــە دەرەوەی بەرجەســتەکردنی ئیــسلام لــە دەســەڵاتێکی تــەواو ئیسلامی دا، کە ئەرکی پیادەکردنی شەریعەتو بە موسڵمان کردنەوەی کۆی رواڵەتەکانی ژیان بگرێتە ئەستۆ، ئیسلامی بوون مانای نامێنێ.

بەڵام ئەم تێگەیشتنە بۆ ئیسلامی بوون لە بەرگی ئیسلامییە نوێکاندا گۆڕانی بەسەردا دێت، لەو سۆنگەوە کە ئیـسلامی بـوون نـاوەرۆکێکی کۆنکرێتی چەقبەستووی وای نییە، لە هەموو کاتو شوێنو سەردەمێکدا هــەمان نــاوەرۆكو ئامــاژەو دەرکەوتــەی هــەبێت، بــەڵکو بــە گــۆڕانی رەگەزەکانی سەرەوە، ئەویش گۆڕانی بەسەردا دێتو لـە فـۆرمی نوێـدا خۆی نمایشو بەرجەستە دەکات.

ئــەم تێگەیــشتنەش لــە ئیــسلامی بــوون لای ئیــسلامییە نوێکــان پەیوەستە بە دووبارە خوێندنەوەی چەمکەکە لە روانگەی واقیعی نوێی کۆمەڵگــە موسڵماننــشینەکانو جیهــانو قۆناغــە مێژووییەکــەو ئــەو گۆڕانکاریو نوێبوونــەوەی بەســەر فیکـرو گوتـاری خۆیانـدا هێناویانـە. چـونکە قبـوڵکردنی دیموکراسـی وەك سیـستمێ بـۆ حـوکمڕانی بـاشو نیـشتمانپەروەرێتی بـاشو ناسـیۆنالیزمو فرەیـی و پـرۆژەی دەوڵـەتی نوێ، دەبن بە چوارچێوە بـۆ ئیـسلامی بـوون، سـەر بـە دنیـای فیکـری ئیــسلامییە و پرســێکی نــاجێگیرو گــۆڕاوە. ئاماژەیــە بــەجۆرێکی دیاریکراوی تێگەیشتن لە ئیسلامو مەنهەجیەتێ بۆ گەڕانـەوەی بـۆ دەق وەك مەرجەعیەتێکی شارستانیو ئەخلاقی. بە واتایەکی تر تێگەیشتنی رەوتی ئیسلامی تەقلیدی بۆ ئیسلامی بـوون، بەشـێکە لـە پرۆسـەی بـە

ئایـدۆلۆژییکردنی ئیـسلام و خـۆ بـه خـاوەنکردنی و کاریگـەربوون بـه ئایدۆلۆژی هەمەلایەنەکانو هەوڵدان بۆ بەئیسلامییکردنی مۆدیرنە.

لەکاتێکدا تێگەیـشتی ئیـسلامییە نوێکـان لـه دۆخو هەلومـەرجێکی جیاوازو پێچەوانەدا بەرهەم دێت، دۆخی پرۆسـەی بـه ئایـدۆلۆژییکردنی حەرەکیو سیاسی کۆتایی پێ دێت. واتە ئیسلامو ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ لێکجیا دەکرێتەوە. ئایدۆلۆژیا هەمەلایەنە نائیـسلامییەکانیش نـەك هــەر هــی ئــەوە نــین بیانکــەین بــه سەرمەشــق، راســتەوخۆ یــاخود ناڕاســتەوخۆ، بــەڵکو بــه کــردەوە روونبــۆوە کارەســاتیان بەســەر مرۆڤایەتیـدا هێنـاو لـه ئێـستاشدا بەشـێکن لـه مێـژوو. پرۆسـەی بـه ئیسلامییکردنی مۆدیرنەش له سۆنگەی زیـاد لـه هۆکارێکـەوە شکستی خوارد، چونکە ئیسلامیش دەشێوێنێ و مۆدێرنـەشمان دەسـتناکەوێت، ئەوەی ئێستا ئیسلامییە نوێکان لەم رووەوە سـەرقاڵنی، نوێکردنـەوەی فیکـر و مەعریفـه و واقیعـی ئیـسلامییە. ئیـسلامی بـوون لـه ئێـستادا هەوڵـدان نییـه بـۆ دروسـتکردنی دەوڵـەتێکی ئیـسلامی کـه (فیقـه)ی ئیــسلامی پیــادە بکــاتو حیــزبو رەوتــەکانی تــر قەدەغــه بکــاتو ئایدۆلۆژیایەکی ئیسلامی سەرجەم جومگەکانی کۆنترۆڵ بکات.

بەڵکو هەوڵدانه بۆ گەیشتن بـه سازشـێکی مێـژوویی لەگـەڵ تـەوژمی بەرامبــەردا، لــەم میانەشــدا ئەگــەر دەســتووری عێــراقو هەنــدێ لــه دەستوورەکانی دوای شۆڕشەکانی بەهاری عەرەبی و پرۆگرامی هەنـدێ له پارتە پاشخان ئیسلامییە نوێکـان بـه نموونـه وەربگـرین، تێدەگـەین ئیسلامی بوون ئاماژەیە بە رزگارکردنی دەوڵەت له خـودی ئایـدۆلۆژیای

ئیسلامی نوێو عەلمانیەتی بە ئایدۆلۆژیاكراوی دواكـەوتووی ناوچـەكە.
ئیسلام لەم چوارچێوەدا نابێت بە گوتارێك هێزێكی سیاسی مژدەی پـێ بــداتو بیكــات بــە بابــەتی ململانێــی سیاســی، بــەڵكو دەبێتــە مەرجەعیـەتێكی بـەهایی‌و ئیـسلامی بـوونیش بەپرۆژەیـەكی سیاسـی نیـشتمانی كـە توانـای وەڵامدانـەوەی بـە خواسـتو داواكارییـەكانی كۆمەڵگـە موسـڵمانەكان هـەبێت. لـە پەیوەنـدی بـە شەریعەتیـشەوە، ئیسلامی نوێكان بەم جۆرەی خوارەوە مامەڵە لەگەڵ ئەو پەیوەندییە بە دەوڵەتو دەسەڵاتەوە دەكەن:

شەریعەت وەك یاسا سەیر ناكەن تا داوای پیادەكردنی بكەن، بـەڵكو داوا دەكـەن بنـەماكانی سەرچـاوەیەكی سـەرەكی یاسـادانان بێـت، لـە یاسادانانیـشدا رەچـاوی چەسـپاوەكان و ناسـنامەی كۆمەڵگـە بكرێـت، شەریعەتیش تەنها لە ڕووی (فیقهی) و یاساییەكەیدا كورت ناكەنەوە.

بەڵكو بە پلەی یەكەم وەك شەریعەتێكی ئـەخلاقی دەیبیـنن، هـەروەها جیـاوازی لــە نێـوان (شــەریعەتی بنــەماكان) و (شــەریعەتی ئــەحكام) دا دەكەن. مەبەست لە یەكـەم، بنـەما و سـەرەتا گشتییەكانە، هـەروەك لـە بەڵگەنامەیـەكی زانكـۆی ئەزهەریـشدا هـاتووە، كـە نـاوە زانـستییەكەی (مەبەستەكانی شەریعەتە) واتە مەبەستو بەرژەوەندی و ئامـانج و هۆكـار (علل)ەو حیكمەتەكان، كە شەریعەت هاتووە بۆ پیادەكردنو بەدیهێنانیان لـە دنیـای خەڵكیـدا مەبەسـت لـە گەڕانـەوە بـۆ بنـەماكانی شـەریعەتی ئیسلامیش، گەڕانەوەیـە بـۆ مەبەسـتەكانی ئـەو (پاراسـتنی ئـاین، گیـان، عەقڵ، نەوە و كەسێتی، مـاڵو سـامان) كـە هـەروەك (شـاطبی) ئامـاژەی

پێکردووه له نێوان هەموو میللەتاندا هاوبەشه، لەلایەکی ترەوه ئیسلامییه نوێکـان جیـاوازی لـه نێـوان (گونـاهی دینـی) و (تاوانبـارکردنی یاسـایی) دەکەن. واته مەرج نییه هـەموو گونـاهێکی دینـی سـزای یاسـایی بـەدواوه بێت، بەو جۆرەی له فیقهی تەقلیدیو تێگەیشتنی هـەلگرانی ئایـدۆلۆژیای نوێش بۆ شەریعەتو پەیوەندی به دەوڵەتەوه، هاتووه. مرۆڤ نوێژ ناکـات، یاخود، رۆژوو ناگرێت، یان سەرپۆش ناکات، ئەمانه ناچنه بواری سـزادانی یاساییەوه. بانگەوازو کۆمەڵگە کار لەسەر جێبەجێکردنی دەکەن، لـەڕێی بوژاندنـەوەی ئیمـانو هۆشـیارکردنەوەو بـەهێزکردنی پابەنـدی خـودیو خۆپارێزیو ویژدانی ئەخلاقییەوه.

لــه چوارچـێوەی ئـەم تێگەیـشتنەشدا لەگـەڵ تـەوژمی بەرامبــەر (عەلمانییــەکانو پێکهاتــەکانی تــری کۆمەڵگــه) رێکــەوتن لەســەر دەستوورێکی مەدەنی نوێ و سیستم دەکرێت. سیستمێ که ئاماژه بـێ بــۆ پێنانــه قۆنــاغی دوای ئیــسلامیو عــەلمانی تەقلیــدی ناوچــەکه. دەوڵـەتێك کـه هـەمووان تیایـدا بـه ئاشـتی پێکـەوه بـژین، لـه سـایەی دیموکراسیو رێزگرتن له ناسنامەی ئیسلامی کۆمەڵگەو چارەسەرکردنی کێـشەی (دیـن) و (دەوڵـەت) و (ئاسـایش) و (دادپـەروەری) کێبرکێـی مەدەنی له پێناو خزمەتکردنی خەڵکدا.

ئیسلامی بوون لێرەدا به تایبەتیش له بواری سیاسییدا دەبێته هێمـا بــۆ کۆکردنــەوەی موحافیزکـاری کۆمەڵایــەتیو دەســتگرتن بــه بــەها ئەخلاقیو کۆمەڵایەتیو دینییەکانەوه، لەگەڵ دیموکراسـیو قبـوڵکردنی پرۆژەی دەوڵەتی نوێ.

هەروەها ئیسلام تیایدا دەبێتە سەرچاوەیەك بۆ ویژدانی زیندووی سیاسیو بەهابەخشین بە سیاسەتو پاراستنی خودی شارستانی لەگەڵ هەوڵدان بۆ بوون بە بەشێکی گرنگو زیندوو لە شارستانێتی نوێدا.

ئەم جۆرە تێگەیشتنەش لە ئیسلامو ئیسلامی بوون، مۆدیرنەو فیکری ئیسلامی ئاشت دەکاتەوە، ئیسلام دەبێت بە پێکهێنەرێکی گرنگی ناسنامە، بەڵام نابێت بە تاکە ناسنامە، ناسنامەی تاكو کۆمەڵ لە تێگەیشتنی ئیسلامییە نوێکاندا فرە رەهەندە، ئەگەر رەهەندێکی (ئیسلام) پێکی بهێنێ رەهەندەکانی تری نەتەوە و نیشتمانو ئینسانی بوون پێکی دەهێنن، پاشان دیموکراسیش لە ئاستە سیاسیو رێکخراوەییو دامەزراوەکەیدا دەبێت بە بەشێ لە ناسنامە.

هەمەلایەنە بوونی ئیسلامیش کە ناوەرۆکی ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ بوو، لەسەر ئاستی بنەماو بەهاکانی ئیسلامو شەریعەتی ئیسلامیدا لێکدەدرێتەوە نەك ئەحکامی جوزئی و ئەندەکی فقهی ئیسلامی.

هەمەلایەنەبوونی پەیامی (ئیسلام) بە شێوەیەکی نوێ دەبەسترێتەوە بە جیهانی بوونو ئینسانی بوونییەوە. واتە تێگەیشتن لە ناوەرۆکی چەمکەکە دەبێت بەوەی، ئەم پەیامەی خودێی گەورە بۆ پێغەمبەری ناردووە (ﷺ) بۆ هەموو مرۆڤایەتییە و تایبەت بە گەلو ناوچەو برگەیەکی مێژوویی دیاریکراو نییە. ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾[1] . ئیسلام رێنمایی بۆ قۆناغە

[1] السبأ/٢٨.

جیاوازەکانی ژیانی مرۆڤ هەیە، ئیسلام بە شێوەیەکی هەمەلایەنە گرنگی بە مرۆڤ دەدات، بە عەقڵ و دەروونو روحو رەهەندە مادیو مەعنەوییەکەیو حەزوو ئارەزووەکانی، هەروەها لە بواری سیاسیو ئابوریو سەربازیدا خاوەنی بنەماو ئاراستەی ئەخلاقی تایبەت بە خۆیەتیو قسەی لەسەر ئامانجو پاڵنەرەکان هەیە. ئەم جۆرە تێگەیشتنە لەسەر ئاستی بنەما گشتییەکان (المبادیء العامة)، بەهاکانو ئەخلاقو جیهانی بوونو واقیعی بوون، نەك هەر نابێتە سەرچاوە بۆ رەتکردنەوەی دیموکراسیو فرەییو بیرکردنەوە لە سەپاندنی (فیقهی ئیسلامی) بە شێوەیەکی هەمەلایەنە لەرێی دەوڵەتەوە، بەڵکو دەبێتە هەوێن، بۆ هاوسەنگی دەروونیو، تاکێکی ئاسودەو هاوسەنگو کۆمەڵگەیەکی بەهێز و هەستانەوەیەکی شارستانی گەورە، چونکە ئەم (ئیسلامە) ئیسلامێکی (ئیمان)و (ئەخلاق) مەدارە، ئیسلام وەك پەیام سەیر دەکات نەك وەك کۆدێکی یاسایی وشكو بێ گیان، پیادەکردنی ئیسلام بە پلەی یەکەم دەبەستێتەوە بە کۆمەڵگە خۆیەوە، گومان لە ناسنامەی موسڵمانێتی کۆمەڵگە ناکات، بەڵام رەخنەی لێ دەگرێتو یارمەتی دەدات، بۆ دووبارە گەشانەوەو رەنگدانەوەیەکی زۆرتر و بانگەشەی دەکات بۆ شۆرشێکی ئەخلاقی گەورە.

## پێنجەم/ وێناکردن و مامەڵەیەکی نوێ لەگەڵ مۆدیرنە و خۆرئاوا:

یەکێ لە کێشەکانی ئایدۆلۆژیاو رەوتی ئیسلامی نوێ، رەتکردنەوەی مۆدیرنە (جگە لە رووە تەکنیکییەکەی) و کێشەی قوڵی بوو لەگەڵ خۆرئاوادا. بەو جۆرەی هەندێ ئاماژەمان پێکرد. مۆدیرنە سەبارەت بە ئەم ئایدۆلۆژیایە، سەرچاوەی بەدبەختییە، ئەو شارستانیەتەی لەسەریشی بینا کراوە لە قەیرانێکی قوڵی ئەخلاقیدا دەژیت و بۆتە سەرچاوەی دەردو ئازارو بەرەو داڕووخان دەچێت[1]. لەکاتێکدا مۆدیرنە (الحداثة) قەدەری مرۆڤایەتییە لە تێکڕای جیهاندا[2].

ئەوەی جێگای سەرنجە بە پێچەوانەی بیری ریفۆرمخوازی ئیسلامی سەدەی نۆزدەوە، بیری ئیسلامی حەرەکی نوێ، جیاوازی لە نێوان (مۆدیرنە) و (خۆرئاوا)گەرایی ناکات. پەرۆشی قوڵیشی بۆ پاراستنی ناسنامەی ئیسلامیو رزگارکردنی موسڵمانان لەو شالاوەی مۆدیلی ژیانکردنی خۆرئاوا بۆیان دروست کردووە، لەپاڵ واقیعی داگیرکراوی زۆربەی جیهانی ئیسلامیو بوونی ئیستعمارو خراپەکاریەکانی، کارێکیان کردبوو، کە بەرامبەر (وەك) دوژمنێکی مەترسیدار سەیر بکرێتو مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت.

ئەگەر فیکری ریفۆرمخوازی سەدەی نۆزدە بانگەشەکردنی بۆ نوێکردنەوەی سیستمی سیاسیو بەڕێوەبردنی دەسەڵاتەوە، بە

---

[1] مجموعة رسائل/ ب.یەکەم، لا ١٢٢، ٢٣٠، ٢٣١.

[2] هەروەك (وائل حلاّق) لە کتێبە گرنگەکەی خۆیدا (الدولة المستحيلة) بۆی چووە و باسی دەکات.

هۆکــارێکی گــەورەی رزگــارکردنی موســڵمانانو رزگاربوونیــان لــە دواکەوتوویی‌و ژێردەستەیی‌و ستەمکاری نـاوخۆ و داگیرکـاری دەرەکـی دەزانێ، فیکری حەرەکی‌و ئایدۆلۆژی ئیسلامی نوێ، رێك بە پێچەوانەی ئــەم لۆژیــكو بەرەنجامگیرییــەوە، ئــەم رووەی شارســتانی خۆرئــاوای رەتکردۆتەوەو بە سەرچاوەی نەهامەتی موسڵمانانی لە قەڵــەم دەدا!! لەکاتێکدا ئەو (دەوڵەتی ئیسلامی)یە جێگرەوەو سیستمە حوکمڕانییەی بانگەشەی بۆ دەکرد، نەیتوانیبوو سروشتو شکڵی دیاری بکات، یاخود روونی بکاتەوە، دابەشکردنی دەسەڵات لە ناویدا چۆنەو دەسەڵاتەکان چ پەیوەندییــەکیان بــە یەکــەوە هەیــەو شــێوازەکانی چـاودێری بەســەر فەرمانڕەواکانەوە چین، ئەم فەرمانڕەوایانە چۆن هەڵدەبژێرێن و ماوەی حوکمڕانیــان چــەندەو ئــەو میکانیزمــە دەســتووریانەی لەڕێیانــەوە هەڵدەبژێردرێن‌و دەستبەکار دەبن‌و لەکاردەخرێن چین[1]؟ بیرکردنەوەی ئیسلامییە نوێکان دووبارە گەڕانەوەیـە بـۆ بیرکردنـەوەی ریفۆرمخـوازە ئیسلامییە گەورەکانی سەدەی نۆزدەهەم‌و سەرەتای سەدەی بیستەم.

وەك ئەوان (خۆرئاواکان) خۆرئاوای (شارسـتانییەتو پێـشکەوتن) و (خۆرئاوای ئیستعمار و داگیرکەرو چەوسـێنەر) و (خۆرئـاوای زانـست و عەقڵانییەت) لە یەکتری جیا دەکەنەوە. کە ئەم جیاکردنەوە بەشێکە لە

[1] الأسلاميون و الحكم في البلاد العربية، ص٥٦.

لۆژیکی قورئـانی پـیرۆز[1] ناکرێـت، بـه پاسـاوی (ئیـستیعمار) و (رووه خراپەکەی دەرهاویشتەی شارستانیەتی خۆرئاوا)، هێڵێکی راستو چەپ بەســەر کـۆی ئـەو شارســتانییەتەو دەســتکەوتە جۆراوجۆرەکانیــدا بهێنرێـت، خـوداش (خۆرئـاوای) بـه (شـەیتان) نەسـپاردووه تـا ببێتـه رەمـزی تاریکییــەکی رەهـا، خۆرئـاوا هــەروەك شـوێنی سـەرهەڵدانی (کۆمــۆنیزم و فاشــیزمو نــازیزمو ئیــستعمارە) شــوێنی ســەرهەڵدانی دیموکراسـیەت و بوژاندنــەوەی عەقلانیــەت و پێـشکەوتنی زانـستی و داهێنانی جۆراوجۆریش، ئەو رەهەندانەی لە ئێستاشدا شارستانییەتی خۆرئاوا بە دەستیانەوە دەناڵێنێت، پەیوەست بـه خـودی خۆرئـاواوه نــین، هێنــدەی دەرهاویــشتەی قۆنــاغێکی دیــاریکراوی گەشــەکردنی شارستانییەتی ماددین. ئـەو شارسـتانییەتی هاوچـەرخیش جیهانییـە و هەموو جیهـان بـه فەرهەنگـه جیاوازەکانییـەوە لـه چوارچێوەی ئـەودا دەژینو هیچ گەلو ناوچەیەك ناتوانێت بێ نیاز بێت لێـی. هـیچ هێزێکـی ئیــسلامیش نییــە بــەدەر لــەرێکارە شارســتانیو پێــوەرە نوێیــە نێودەوڵەتییـەکان، توانـای دامەزرانـدنی دەوڵــەتو دەسـەڵاتێکی وای

---

[1] - قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لَسْتُمْ عَلَىٰ شَيْءٍ حَتَّىٰ تُقِيمُوا التَّوْرَاةَ وَالْإِنجِيلَ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ ۗ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَانًا وَكُفْرًا ۖ فَلَا تَأْسَ عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ المائده:٦٨.

- وَلَا تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِلَّا الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ ۖ وَقُولُوا آمَنَّا بِالَّذِي أُنزِلَ إِلَيْنَا وَأُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَإِلَٰهُنَا وَإِلَٰهُكُمْ وَاحِدٌ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ. العنكبوت:٤٦.

هەبێت، گەلەکەی لێ رازی بێتو لە جیهانیشدا دانپیانراوو رێزلێگیراو بێت.

بۆ نموونە ئەگەر پارتی (دادو گەشەپێدانی تورکیا) لە هەندێ رووەوە بە سەرکەوتووی بزانین، بەتایبەتیش لە رووە ئابورییەکەیەوە، ئەوا لە سۆنگەی ئەوەوەیە بۆتە بەشێك لە جیهانی نوێو توانیویەتی لەرێی پێشمەرجەکانی بوژاندنەوەی ئابووری لە جیهانی نوێدا، ئابووری وڵاتەکەی پێش بخاتو ئاستی ژیان بەرز بکاتەوە.

ئەگەر پارتی (دادو گەشەپێدان)ی مەغریبی لە وڵاتی خۆیدا بە نموونەیەکی سەرکەوتووی پارتە پاشخان ئیسلامییە نوێکان دادەنرێت، ئەوا پەیوەندی بە نزیکبوونەوەی ئەو پارتەوە هەیە، لە پێوەرەکانی دیموکراسی بوونو هاوچەرخێتیو بەڕێوەبردنی فرە کولتووریو مامەڵەکردن لەگەڵ دامو دەزگاکانی دەوڵەتی نوێدا. ئەمەش ئەوەمان پێ دەڵێت: کە مۆدیرنە لەسەر (ئێمە) مەترسی نییە بەڵکو (نامۆدیرن) بوونی وڵاتو هێزەکانمان گەورەترین هەڕەشەو مەترسییەو وای کردووە چەندین وڵاتی ئیسلامی بەدەست دواکەوتویی ئابوری و ستەمکاری سیاسیو هەژاریو ئاستی نزمی ژیانەوە بناڵێنیێو هەندێکیشیان ببن بە دەوڵەتی شکستخواردوو مەڵبەندێك بۆ شەڕی ناوخۆو توندوتیژیو خوێنڕێژیو دواکەوتوویی ئەخلاقی. ئیسلامییە نوێکان لە دەرك کردنیان بەم راستییەوە، خۆرئاوا وەك ئەزموونێکی فرە رەهەند سەیر دەکەنو دەیخوێننەوە و سودی لێ وەردەگرن، (ئیسلام) و (فیکری ئیسلامی) لەگەڵ (مۆدیرنە) ئاشتدەکەنەوە، کە چوونە ناو مۆدیرنە دەبەستنەوە

به دەستبەرداربوون لـە ناسـنامەو کەسـێتی ئیـسلامیو توانـەوە لـەناو فەرهەنگی خۆرئاوادا، کە لە پشت بەشێکی گرنگ لە ئێشەکانەوە. بەڵکو دەخوازن بیسەلمێنن ئێمە دەتوانین بە ناسـنامەی ئیـسلامی خۆمانـەوە بـبین بــە بەشــی لــە دنیــای شارســتانێتی مــۆدیرن. لــە دیــدێکی رەخنەگرانەشەوە مامەڵە لەگەڵ مۆدیرنەدا بکەن، واتە لەکاتێکدا لـەوە ناترسن بچنە ناو مۆدیرنەوە، هوشـیارن بـەو رەهەندانـەی مۆدیرنـە کـە هەڕەشـە بـۆ سـەر ژیـانو ئاسـودەیی و دوارۆژی مرۆڤایـەتی دروسـت دەکەن. چاویان لەوەش بڕیوە (ئیسلام) و (دنیای ئیسلام) لە داهاتوودا بەشــدار بــن لــە چارەســەرکردنی کێــشەکانی شارســتانێتی نــوێو دەرهاویـشتە خراپـەکانی بـۆ سـەر ژینگـە و (ئـەخلاق) و چارەنووسـی مرۆڤایەتی، کە ئـەم بابەتـە تەوەرەیـەکی گـەرمی مـشتومڕە فیکـریو ئەکادیمییەکانی خودی خۆرئاوایە.

لـە ڕوویـەکی تـرەوە ئیـسلامییە نوێکـان هۆشـیارن بـەوەی هـەموو رەتکردنەوەیـەکی مۆدیرنـە لـە دنیـای مۆدیرنـەدا، سـەرەنجام یەکسان دەبێــت بــە رەتکردنــەوەی رووە روونــاکو مرۆڤایــەتی و گەشــەکەی مۆدیرنــەو کاریگــەربوون بــە رەهەنــدە تاریــکو خراپەکــەی، چــونکە لەدەرەوەی مۆدیرنەوە ژیانکردن لە ئێستادا مەحاڵە. بۆ نموونـە کاتێـك ئایـدۆلۆژیای ئیـسلامی نـوێ بانگەشـەی رەتکردنـەوەی دیموکراسـیو فرەییو مافـەکانی مـرۆڤ دەکـاتو بانگەشـە بـۆ (دەوڵـەتی ئیـسلامی)و پیـادەکردنی شـەریعەت دەکـات، ئـەم کـارە بـە ناچـاری دەبێـت لـە چوارچــێوەکانی دەوڵــەتی نوێــدا ئــەنجام بــداتو خــۆ بەدەســت

جەبرەكانییـــەوە بـــدات‌و میكانیزمـــەكانی بـــەكاربهێنێت، هـــەروەك لـــە (كۆماری ئیسلامی ئێران) و (سودان) و (ئەفغانستان) بینیمان.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، كە بەم كارە بەبێ ئەوەی مەبەست بێـت، دەوڵەتی ئیسلامی لە دەوڵـەتی (هـوبز)ی نزیـك دەبێتـەوە، ئایـدۆلۆژیاو دەوڵـــەتی هەمەلایەنـــەی ئیـــسلامیش دەبێتـــە نوســـخەیەكی كـــاڵی لەبـەرگیراوەی هەنـدێ ئایـدۆلۆژیاو دەوڵـەتی هەمەلایەنـەی مـۆدیرن لـە خودی خۆرئاوادا، هەر بۆیە بانگەشەكردن بۆ قبوڵكردنی مۆدیرنەو رووە جوانەكەی كە لە دیموكراسـی‌و ژیـانی دەسـتوری‌و مافـەكانی هـاوڵاتی‌و مرۆڤ و هاوشێوەكانیدا خۆی هەوڵدانـە بـۆ رزگـاربوون لـە ڕووە خـراپ‌و تاریكەكەی مۆدێرنەو سوودوەرگرتن لە ڕووی ئەخلاقی‌و ئینسانییەكەی. ئەمـــە ئـــەو وانەیـــە هـــەموو ئیـــسلامییەك دەبێـــت جـــوان تێـــی بگـــات، رەتكردنەوەی دیموكراسی و دەوڵەتی نیشتمانی نـوێ بـەناوی خۆرئـاوا گەرایی‌و مۆدێرنەوە، تێكەڵ كردنی (ئیسلام)ە بە بەشێ لە دەرهاویشتە خراپــەكانی شارســتانێتی نــوێ‌و مۆدێرنــەو، لەقاڵبــدان‌و ســەركوتكردنی ژیان‌و مرۆڤە بە ناوی (ئیسلام)و (ناسنامە)و (پاكێتی شارستانی)یەوە.

لەكاتێكدا چوونە نێو مۆدێرنە وەك بەرهەمی هۆشـیاری‌و پـەی بـردن بە پێویستی‌و رێزگرتن لە خودی ژیاری، جگە لەوەی لەم ڕووە تاریكەی بـــە دوورمـــان دەگرێـــت، یـــاخود لانـــی كـــەم لـــە مەترســـییەكانی كـــەم دەكەینەوە، جۆرێـك لـە هاوسـەنگی نـاوخۆیش بـۆ (ئیـسلام) و (دنیـای ئیـــسلام)ی موســـڵمانان دەگێڕێتـــەوە، چـــیدی (رەســـەنایەتی) و (هاوچـەرخێتی) لـە بەرامبـەر یەكـەوە دانـانرێن، كـە جیاكردنـەوەیان

وادەکات، نوێنەرایەتی ئاینیو سیاسیو کۆمەڵایەتیو فیکریان بۆ پەیدا بێت، بەڵکو هەردووکیان لە چوارچێوەیەکی هاوبەشو بە یەکەوە گوزارشت لە دۆخی سێهەم دەکەن، کە دۆخی ئامادەبوونی هۆشیارانەیە لە جیهانو سەردەمدا، دۆخی چوونە ناو مۆدێرنەیەکی رەسەنانەیە، چونکە رەسەنایەتی شتێ نییە لە دەرەوەی مۆدێرنەوە، هەر رەسەنایەتییەك پێویستییەکی بە ژیانی سەردەم بێتو بەرگەی جوڵەو نوێکردنەوەی ژیان بگرێت، بەشێکە لە خودی مۆدێرنە. بەو مانایەی ئەو بەشەیە لە دنیای ئێمە کە شوێن پەنجەی خۆمان بە مۆدێرنەوە دادەنێتو ئەوەمان پێ دەڵێت کە دەکرێت ئێمە لە هەندێ رووەوە خاوەنی مۆدێرنەی خۆمان بین، چونکە مۆدێرنە بوون لە ئێستادا یەکسان نییە بە دووبارە لەبەرگرتنەوەی مێژووی نوێی خۆرئاوا، بە ململانێو پرسیارو قۆناغەکانییەوە.

# فەسڵی نۆهەم:
# بیناکردنەوەی چەمکی سیاسەت
# لە مەرجەعیەتی ئیسلامییە نوێکاندا

لەڕوانگەی ئەوەی لە پێشەوە ئاماژەمان پێکرد دەربارەی هەندێ خەسڵەتو سیما گشتییەکانی ئیسلامییە نوێکان. یاخود قۆناغی پاش ئایدۆلۆژی ئیسلامی نوێ، دەتوانین لەو گۆڕانکاریەی فرە رەهەندانە تێبگەین، کە لەم قۆناغەدا بەسەر ناوەرۆکی چەمکی سیاسەت لەلای ئیسلامییەکاندا دێت. سیاسەت چیدی بەو ناوەرۆکەوە نامێنێ، کە مێژووی پێش مۆدێرنە، واتە لە کەلەپوری ئیسلامیدا پێی دراوە.

هەروەها بەشێکی زۆری ئەو ئاماژەو مانایانەش لەدەست دەدات، کە ئایدۆلۆژیاو جولانەوەی ئیسلامی نوێ پێی بەخشیبوو، چونکە سەرەنجام بارگاوی کردنی سیاسەت بە بەهاو بنەماو ئاماژەو ماناکان، دەگەڕێتەوە بۆ جۆری سەیرکردنمان بۆ جۆری ناوەرۆکیو چۆنیەتی بەرجەستەکردنو پیادەکردنی، ئەوانەش لەڕێی خۆیانەوە پەیوەستن بە قوتابخانە و ڕێبازە فیکریو فەلسەفییەکانو ئەزموونەکانی حوکمڕانی، هەر ئەمەش وادەکات لە وردەکاری دیاریکردنی نێوەرۆکی چەمکی سیاسەتو پیادەکردنیدا هێزو تەوژمەکان لێکدی جوێ بکەنەوە، بۆ نموونە ئەگەر هەمووان لەسەر ئەوە کۆك بن کە سیاسەت، سەروکاری لەگەڵ هێزو دەسەڵاتو چۆنیەتی ئاراستەکردنو ڕێکخستنی کۆمەڵگەو پەیوەندییەکانو دیاریکردنی مافو پێگەو ئازادییەکاندا هەیە، ئەوە دواتر لەسەر چۆنیەتی پێناسەکردنو وێناکردنو هێنانە دیان لەیەکدی جیاواز دەبن.

چونکە جۆری پیادەکردنی دەسەڵاتو میکانیزمی پیادەکردنەکە، پەیوەستە بە دیدی هەر هێزو ڕێبازێك بۆ ماهیەتی دەسەڵاتو دەوڵەتو سروشتی پەیوەندی نێوان کۆمەڵگەو تاكو دەسەڵاتو دیاریکردنی مەرجەعیەتی بەهاکان.

لێرەشەوە سیاسەت لای ئیسلامییە نوێکانو پارتە پاشخان ئیسلامییە هاوچەرخەکان، بە بەراورد لەگەڵ قۆناغی ئیسلامی سیاسیو ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ، دەچێتە قۆناغێکی نوێوە. چونکە تێگەیشتنەکان بۆ مۆدێلی دەوڵەتو حوکمڕانی، سروشتی پەیوەندی

نێوان (بانگەواز) و (سیاسەت) و (دین) و (دەوڵەت)و پێگەی شەریعەتو جۆری پیادەکردنی، دیموکراسیو مافەکانی مرۆڤ و چەمکی هاولاتیو ناوەرۆکی چەمکی ئیسلامی بوونو چەندین شتی تر، گۆڕانی گرنگیان بەسەردا دێت. لەو سۆنگەوە کە تێگەیشتنە کۆنەکەی سیاسەت لای ئایدۆلۆژیاو رەوتی ئیسلامی نوێ کە لە سیەکانی سەدەی رابردووە وە دەستی پێکردووە، هەڵقوڵاوو رەنگدانەوەی چەند هۆکارێك بووە، لەوانەش:

١. جۆری تێگەیشتنی رەوتەکە بۆ ئیسلامو دەوڵەتو شەریعەت و خۆرئاواو نوێگەری و... هتد.

٢. واقیعی نێودەوڵەتی ئەو کاتە کە بە سێ دەرکەوتەی گرنگ دەناسرێتەوە:

(أ) بوونی ئیستعمارو داگیرکاری.

(ب) سەرهەڵدانو هەژموونی ئایدۆلۆژیا هەمەلایەنە نادیموکراسییەکان.

(ج) جەنگە جیهانییەکان.

٣. واقیعی وڵاتانی ئیسلامیو بەتایبەتیش (میسر) و موسڵمانانی نیمچە دوورگەی هیندستانو دواتر دەوڵەتی پاکستان. بە حوکمی ئەوەی دوو باوکە گەورەکەی ئایدۆلۆژیاو جولانەوەی ئیسلامی نوێ (حەسەن بەننا و مەودودی) خەڵکی ئەو دوو شوێنە بوون و (منطلق)ی بیرکردنەوەیان گەرچی جیهانی بووە لە هەندێ رووەوە مەحکوم بووە بە جەبرو رەوشە (محلی)و ناوچەیییەکان.

لەکاتێکدا سـەرهەڵدانی ئیـسلامییە نوێکـانو ئـەو گۆڕانکاریانـەی لـە سـەرەتای نەوەدەکانـەوە دەسـتی پێکـردووە، لـە ئێـستادا، لـە پەرەسـەندندایەو حـوکمی ئـەزموونی هەیـەو هێـشتا نـەبووە بـە دیاردەیـەکی سـەقامگیرو ڕەگـداکوتراوو لەخەمڕەخسیوو، لـە واقیعـی جیاوازدا بووەو هەیە.

سەرەتای نـەوەدەکان ئاماژەیـە بـە کۆتـایی هـاتنی ئایدۆلۆژیایـەکی هەمەلایەنە (شمولی) وەکو کۆمۆنیزم لە پێگـەی دەسـەڵاتدا، کـە بـووە هۆی سـەرهەڵدانی تـەوژمێکی نـوێی دیموکراسـی، ئیـستعمار لـە فۆرمـە کۆنەکەیدا کۆتایی پێ هاتووە، واقیعی موسـڵمانان و دەوڵەتەکانیـشیان دوای نزیکەی (١٠٠) ساڵ لە دەستپێکردنی جوڵانەوەی ئیـسلامی نـوێ، لە زیاد لە رووێکەوە گۆڕاوەو پێویستیان بە قسەو تێزو پـێش ئـەوەش خوێندنەوە و تێگەیشتنی نوێ هەیـە، گـۆڕانی (واقیـع) و (چـاوەڕوانیو ئەرکـەکان)و (چوارچـێوەکانی کـارکردن) گۆڕانکـاری بەسـەر شـێوازی بیرکردنەوەی ئیسلامییەکاندا هێنـاوە. لـەو سۆنگەوە کـە ئامانجـەکانی دوێنێو جوڵانەوەی ئیسلامی لە ئێستادا زیاتر وەك (خـەون) دەرکـەون نەك ئامانجی سیاسی واقیعی. ئەوەی (بەننا) لەکاتی خـۆی نـاوی نـابوو (خەونـەکانی ئـەمڕۆ راسـتییەکانی سـبەینێن). لـە سـۆنگەی دەربڕینـی متمانەی قوڵی خۆی بە رێبازەکەی، دوای سەد ساڵ لە خودی وڵاتەکەی خۆیدا هێشتا وەك (خەون) ماونەتەوەو نەگۆڕاون بـە واقیـع، بـەڵکو لـە هەنـدێ کـات و شـوێندا بـوون بـە خـەونێکی ناخۆشـیش، چـونکە لەچوارچێوەی تێزێکی توندوتیژانەی ئیسلامی سـەلەفیدا بـەکارهێنران،

که دواهەمینیان (داعش)ە. ئەوەش کارەساتی جۆراوجۆری لێکەوتەوە. ئەگــەر (دەوڵــەتی ئیــسلامی) و (پیــادەکردنی فیقهــی ئیــسلامی) و گێڕانــەوەی (خەلافــەتی ئیــسلامی) خــەونی بــەننا و مــەودودیو هاوبیرەکانیــان و جوڵانــەوەی ئیــسلامی نــوێ بووبێــت، بــە حــوکمی ســوتانیان بــە ئــاگری روخــانی ســەڵتەنەتی عوسمــانیو ســوکایەتی ئیستعمارو لاوازیو پاشـکۆیەتی دەسـەڵاتە نێوخۆییـەکانو، نوێگـەری، ئەوا لە ئێستادا (قورسە) ئەو ئامانجانـە وەك (خـەون)یـش بهێڵرێتـەوە، چونکە هێشتنەوەیان وەك (خەون) وا دەکات هەر هـەنگاوێك کـە هێـزە ئیسلامییەکان دەینێن ببێتە (تاکتیك) و (خۆگونجانـدنی ناچـاری) و بـە کـاتی ســەیرکردنی ئــەوەی هەیــە، ئەمــەش وادەکـات نــەتوانن ببنــە پێشەنگی ئەزموونێکی نوێی حوکمڕانی لە کۆمەڵگەکانیاندا.

لەلایەکی ترەوە ئەگەر هەندێ هێز بتوانێت ئەم (خەونانە) لای خۆی بهێڵێتەوە بێ ئەوەی بەرەو توندوتیژی یاخود پاڵ لێدانەوە پـاڵی پێـوە بنێـت، وەك (برایـان) و (کۆمەڵـەی ئیـسلامی پاکـستان) خۆیـان، ئـەوا خەڵکانێك لە ناو خودی ئەوان بـە هاوبەشـی تـەوژمی دەرەوەی خۆیـان تاسەر لەگەڵ شێوازی کارکردنیا ناڕۆنو، بەرگەی بەردەوام دواخـستنی ئامانجە ستراتیژییەکان ناگرنو روو دەکەنە شێوازی توندو رادیکـاڵ بـۆ بەدیهێنانیان.

لەو سۆنگەوە کـە کاتێـك خـەون لەگـەڵ واقیعـدا بەریـەك دەکـەون، دەبێتە هۆی نائومێدی، دەستبەرداریو پاشەکشە، یاخود ملنان بەرەو

توندڕەوی، ئەوانەی دەستیشی پێوە دەگرن دووچاری دەمارگیریو چاولێکەری و چەقبەستوویی دێن.

سەرچاوەیەکی گرنگی توندڕەوی ئیسلامی نوێش لەم خاڵەوە سەرچاوە دەگرێت، واتە لە درێژەدان بە (خەونە) بەدینەهاتووەکانەوە. کە سەری لە نامۆبوونو رەتکردنەوەی واقیعو بەکارهێنانی هێزی کوێرانە دەردەچێت، بۆیە یەکێ لە ئەرکە گرنگە فیکرییەکانی ئەم قۆناغە سەبارەت بە بیرمەندە موسڵمانەکان و هێزە ئیسلامییەکان، دووبارە داڕشتنەوەی ئامانجەکانو (أولويات)ەکانە، بۆ ئەوەی ئەم نەوەش خەونی خۆی هەبێت، نەبێتە سوتەمەنی خەونەکانی پێشوو. لە خەونە مێژووییە سنوردارەکانی وەکو خەونی جوڵانەوەی ئیسلامی نوێوە، بگەڕێتەوە بۆ خەونە ئیسلامییە گەردوونیو ئەخلاقییە گەورەکان لەوێنەی (دادپەروەری)، (دادپەروەریش) لێرەدا بۆیە بە خەون ناودەبەم، لە کاتێکدا بەهایە، چونکە لە ڕوویەکەوە سەبارەت بە واقیعی زۆربەی موسڵمانان خەونە، دووەمیشیان چەمکێکە تا رۆژی قیامەت تیشك دەداتەوەو ئیلهام دەبەخشێتو ئەوپەڕی دیار نابێت. بە مانایەکی تر بە هەر ئاستێ لە دادپەروەری لە دنیادا بگەین، ئەنجا چەندین رەهەندو ئاستی تر ماوە پێی بگەین، گۆڕانکارییە ژیارییەکانیش بە نیمچە بەردەوامی پرسیارو تەحەدای نوێ دەخەنە بەردەم عەقڵی عەدالەتخوازو سیاسەتو ئەخلاقو (حقوق)و هێزو دەوڵەتان.

بۆ ئەوەی ئیسلامییە نوێکانیش ئەم کارە بکەن، واتە خەون‌و ئامانجەکان دابڕێژنەوە، پێویستە لە ڕوانگەی مەبەستەکانی پێش خەونی نەوەی پێشوو داڕێژەرانی بیری ئیسلامی حەرەکی نوێوە، ئەم کارە بکەن. واتە بڵێن: مەبەستی ئەوان لەو دروشمانە، دووبارە بەرپاکردنەوەی (دادپەروەری)و گێڕانەوەی (کەرامەت)و ( ئامادەبوونی موسڵمانان) بووە لە جیهاندا. بەم پێیەش (دەوڵەتی ئیسلامی) و (پیادەکردنی فیقھ) و (گێڕانەوەی قەوارەی نێودەوڵەتی ئیسلام‌و خەلافەت) خۆیان لەخۆیاندا مەبەست نین، بەڵکو ئامرازی بەدیهێنانی ئەو مەبەستانەن.

بە ئەندازەی گۆڕانکاری‌و ڕووداوەکان مەودایان خستنە نێو ئەم ئامرازو مەبەستانە، وە ئەزموون و واقیع بۆی دەرخستین کە دەستگرتن بەو ئامرازانەوە نەك ئەو مەبەستانە ناهێنێتە دی، بەڵکو دەشیان شێوێنن‌و ڕێگای بەدیهاتنیان پڕ کێشەترو دوورتر دەخەنەوە، ئەو کاتە دەستگرتن بە مەبەستەکان‌و گۆڕینی ئامرازەکان، دەبێتە زەرورەتێکی ئیسلامی‌و لۆژیکی پێویستییەکی سیاسی. بەشێ لە کێشەی موسڵمانانیش لەسەر ئاستی تێگەیشتن لە ئەحکامەکانی شەریعەت‌و ئیسلامی‌و فیکری ئیسلامی نوێ، بۆ ئەم خاڵە دەگەڕێتەوە، واتە جیاوازی نەکردن لە نێوان ئامرازو ئامانجەکان و پیرۆزکردنی ئامرازەکان هاوشێوەی مەبەستە باڵاکان!!.

ئەوەی لە ئێستاشدا بەشێ لە بیرمەندانی موسڵمان و ئیسلامییە نوێکان پێوەی سەرقاڵن، ئەوەیە کە ئاماژەمان پێکرد، لەڕێی هەوڵدان

بۆ بوون بە بەشێ لە دنیاو سەردەمو شارستانیەتی نوێ، جۆری ئامادەبوونی ئاین لە کایەی سیاسیو فەزای گشتیو سروشتی پەیوەندی نێوان (ئاین)و (دەوڵەت) و رۆڵی حیزبێکی پاشخان ئیسلامی لەو چوارچێوەدا تاوتوێ دەکەنو تێدەگەن.

چونکە لەوە تێگەیشتوون کە ((پەیوەندی نێوان (دین)و (سیاسەت) شتێکی بڕاوەو کۆتایی پێ هاتوو نییە.. چونکە لەپاڵ رەهەندە پێوانەیی و دەقەکەدا، رەهەندێ مێژوویی بابەتی هەیە، نەوەك ئەوەی بێت، بەڵکو وەك ئەوەی بە کردەوە هەیە بەگوێرەی بەرجەستە بوونە مێژووییەکەی))[1]. ئامادەبوونی ئاین لە بواری سیاسەتیشدا هەروەك پارتی دادو گەشەپێدانی مەغریبی جەختی لەسەر کردۆتەوە .

لەسەر ئاستی (بنەما ئاراستە کەرەکان، گیانێکی جۆشدەر، هێزێك بۆ نەتەوە بە گشتی) دەبێت، لەگەڵ تێبینی کردنی جیاوازییە جۆرایەتییەکانی نێوان هەریەك لە سیاسەت و ئاین[2].

لێرەشەوە ئیسلامییە نوێکان، لە بەیەکەوە گرێدانی نێوان (شەریعەت)و (سیاسەتی شەرعی) یەوە، بەو جۆرەی لە کەلەپوری ئیسلامیدا هاتووەو شوێنی گرتووەو، پێشەنگانی ئایدۆلۆژیاو جوڵانەوەی نوێش لە بەرگێکی نوێ و لە چوارچێوەی چەمکی دەوڵەتی ئیسلامیدا بەرهەمیان هێناوەتەوە، دەگوازنەوە بۆ تێگەیشتن لە

[1] الأسلاميون و الحكم في البلاد العربية و تركيا، ص٦١.

[2] سەرچاوەی پێشوو، لا٦١.

شــەریعەت وەکـو (مبــادئ) و سەرچــاوەی یاســاو هاوکــات جولاَنــەوە بەگوێرەی مۆدێرنەی سیاسیو دیموکراسی[1].

گوتــاری سیاســی ئیــسلامییە نوێکــان بــە هەمانــشێوەی هــەڵگرانی ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ بەوە وازناهێنێ کە بڵێت: ئیسلام و سیاسەت لەگەڵ یەکتردا لە پەیوەندیـدان.. بـێ ئـەوەی دیـدگای خـۆی بـۆ کـاری سیاسیو ئامانجەکانیو چوارچێوە شەرعییەکەی روون بکاتەوە.

تێگەیشتنیان بـۆ دەسـەڵات، وەك شـێوازگەلێك نـین بـۆ رێکخـستنی پیادەکردنی دەسەڵات لە دەوڵەتدا، یاخود بوارێك بۆ کێبڕکێ و رکابەری بەرژەوەندییەکان، نـوێ بۆتــەوە، بـواری سیاسـەت لای ئـەوانیش بۆتـە بوارێك بۆ ململانێو سازانو رێککەوتن.

پەیوەنـدی سیاسـەتیش لەگـەڵ ئاییـندا لـەم جـۆرە تێگەیـشتنەدا هاوســـەنگیو یـــەکتر تەواوکردنـــە، نـــەك جیابوونـــەوە یـــاخود بەناویەکداچوون. ئایین لێرەدا نابێتە ئایـدۆلۆژیا. تـەماحی قـۆرخکردنی فەزای گشتی هەبێت، یاخود چارەسەری کۆتایی بۆ کێشەکان پێشکەش بکـات، بـەڵکو رۆڵـی ئاراسـتەکەرە. ئـاین رەوایـەتی بـەهایی و پاڵنـەرو مەبەست بە سیاسەت دەبەخشێت. لـەم مۆدێلەشـدا سیاسـەت جێگـای دین ناگرێتەوە، سیاسەتیش بە دینی ناکرێت، بەڵکو رێز لە تایبەتمەندی و کایەی هەریەکەیان دەگیرێت، بە یەکەوەش خزمەتی مرۆڤ و کۆمەڵگە دەکەن، واتە پرسـی سـەرەکی لـەم نێوەنـدەدا بـە چەشـنی ئایـدۆلۆژی

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا ٥٧.. هەروەها د.محمد جبرون، سەرچاوەی پێشوو.

ئیسلامی نویٚ، ئەوە نامێنێ، سیاسەت لە خزمەت ئـاینو بانگەوازدایـە، یاخود بە پێچەوانەوە، بەڵکو هەردووکیان دەخرێنە خزمـەت کۆمەڵگـەو ژیانەوە.

ئیـسلامییە نوێکـان، قبـوڵی دەرکەوتـەکانی واقیـع دەکـەنو مامەڵـە لەگەڵ ئەگەرو (ممکنات)ەکانی دەکەن.

هەوڵدەدەن بەها ئیسلامییە باڵاکان بە دامەزراوەیی بکەن، سیاسەت لەم مۆدێلەدا کە تیایـدا ئیـسلامییە نوێکـان مۆدێرنـەی سیاسـیان قبـوڵ کردووە، یاخود زۆر لێی نزیك بوونەتەوە، فەزایەکی کراوەیە بۆ ئـەوانو عەلمانییەکانو دەنگو رەنگو پرۆژە جیاوازەکان.

چونکە لە مۆدێرنەی سیاسیدا بەدیهێنانی کایەیەکی سیاسی هاوبەش بـۆ ئەنجامـدانو پیـادەکردنی گفتوگـۆو رەخنـەو دەربڕینـی نـاڕەزاییو دانوسـاندن لـەڕێی نوێنـەری تـەوژمو رێبـازو بەرژەوەنـدیو پێکهاتەکانەوە، مەسەلەیەکی بنچینەییە[1].

ئیسلامییە نوێکـان لـەوە تێگەیـشتوون کـە سیاسـەت مەیدانێکـە بـۆ دژبەیـەکیو ململانێـی بەرژەوەنـدی نێـوان تـاكو گروپـەکان، لـەم نێوەندەشدا فشارو ئاڵوگۆڕی بەرژەوەندیو ململانێو سازش بەگوێرەی تەرازووی هێزەکان لە ئارادایەو حوکمی کایەکە دەکەن.

هـەر بۆیـە سـەیرکردنی سیاسـەت وەك ئـامرازێکی رووت بـۆ جێبەجێکردنی شەریعەتو ئایین، بەو جۆرەی ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نویٚ

[1] عبدالحكيم أبو اللوز، الفكر السياسي الأسلامي المعاصر نحو قامته القيم و اعادة بنـاء العلاقـة بـين الديني و السياسي، مجلة التسامح، العدد الثامن و العشرون، ٢٠١٠،

مامەڵەی لەگەڵ کردووەو سەیری کردووە، سەرەنجام دەبێتە هۆی سەرلێتێکچوونو شێواندنی ئیسلامو دەستشلکردن لە بەهاکانو بە ئامرازکردنی (ئاین)! چونکە تێڕوانینێکی پێودانگە (معیاری) بۆ سیاسەت، یاخود دیدێکی ناسیاسییانەو ئاینیانەی رووت بۆ سیاسەت، کار لە جەوهەری سیاسەت ناکات، وەك ئاماژەیەك بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ هێزو دەرکەوتەکانیو چۆنیەتی پیادەکردنیو ئاراستەکردنیو دیاریکردنی سروشتی پەیوەندی ئەو بە دادپەروەری و مافو ئازادیو بەڕێوەبردنی جیاوازییەکانو پارێزگاریو رێکخستنی بەرژەوەندی جیاوازیەکانی کۆمەڵگە. ئەوەی لەم نێوەندەدا دەگۆڕێت، خوێندنەوە ئایدۆلۆژیا سادەکانە، کەوتنی چاوەڕوانییە نیازپاکە ئاینییەکانە، کە بەبێ خۆئامادەکردن بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ لۆژیکی سیاسەتو دەرهاویشتەکانی و دەستەبەرکردنی میکانیزمەکانی دەستەمۆکردنو کۆنترۆڵکردنی، دەکەوێت بەسەر شتی چاوەڕوان نەکراوەوە.

چونکە ئەگەر سیاسەت بەو جۆرەی لە زمانی عەرەبیو کەلەپوری پێش مۆدێرنەدا پەیوەست کرابێت بە رامکردنی خەڵكو دەستەبەرکردنی گوێڕایەڵیان و ئاراستەکردنیان، ئەوا لە ئێستادا سنووردارکردنە، چونکە ئەگەر سیاسەت لە دەسەڵاتدا بەرجەستە ببێت، ئەوا دەسەڵاتی رەها لە چوارچێوەی دەوڵەتی نوێدا خراپەو گەندەڵیو تاوانی رەها بەدوای خۆیدا دەهێنێت.

کاتێ سیاسەت وەك کایە دەبێتە شوێنێ بۆ ئامادەبوونو کێبڕکێی نێوان گروپو هێزو دنیا بینیو بەرژەوەندییەکان، دەخوازێت هەر هێزێك

بیـەوێت خـۆ فرێبداتـە ئـەم بـوارەوە دەبێـت خـودان بەرنامـەی روونو ئاشکرای خۆی بێت، توانست (امکانیات) و ستراتیژەکانیشی بەگوێرەی پێگەی لە چوارچێوەی هاوسەنگی هێزەکاندا بگونجێتو رێکبخات.

ئامادەبوون لەم کایەداو بەو سروشتەی پێشەوەش، عەقڵی رێـژەیی، توانـــای هـــەڵکردن لەگـــەڵ بەرامبـــەرو لێبـــوردەییو بەدەستخـــستنی مەرجەکانی پێشبڕکێی دەخوازێت، چونکە ئەو دەبێت هەوڵـدات یـاریو کێبڕکێکە بەرێتەوە، بۆ ئەوەش پێویـستی بـە دەنگـی خەڵکـە، دەنگـی خەڵكو متمانەی ئەوانیش پێویستی بە کرانەوە بەڕوویانداو، تێگەیـشتن لە خەمو ئازارو ئاواتەکانیانو رێزگرتن لە هەستو نەستیانە.

لەچوارچێوەی ئەم دۆخە نوێیەشدا، (ئیـسلامی هەمەلایەنـە) توانـای کێبڕکـێو تەنانـەت ئامـادەبوونی تـا سەریـشی نییـە، چـونکە ئیـسلامی هەمەلایەنە، کە مۆرکی جوڵانەوەی ئیـسلامی نوێیـە، هـیچ هاوبەشـێکی فیکریو سیاسی لە فەزای گشتیو کایەی سیاسەتدا قبـوڵ ناکـات، گـەر قبوڵیشی بکـات بـە کاتییـە، لـەو سـۆنگەوە کـە پـرۆژەی ئـەو پـرۆژەی ســەرلەبەر داڕشــتنەوەی کــۆی ژیــانو کۆمەڵگەیــە، ئــەو ئامانجــەش دەخوازێـت، کەسـی تـر قـسەی لـە جـۆری یاسـاکانو داڕشـتنی بڕیـارو سیاسەتەکانو جۆری پیادەکردنەکاندا نەبێت.

ئیـــسلامییە نوێکـــان لـــەو ســـۆنگەوە، دەســـتەبەرداری گوتـــاری ئایـدۆلۆژیای ئیـسلامی نـوێی هەمەلایەنـە بـەو جـۆرەی لـە ئـەدەبیاتی جوڵانـــەوەی ئیـــسلامیدا هـــاتووە دەبـــن، چـــونکە دەزانـــن یـــەکێ لـــە لاوازییەکانی لۆژیکی سیاسەتکردنی ئیسلامی لە بـیری ئیـسلامی نوێـدا،

ناسازگاری نێوان ئامانج و ئامرازو میکانیزمەکانە. بۆ ئەمەش پێویستیان بە گەڕانەوەیە بۆ مەرجەعیەتی بیری ریفۆرمخوازی ئیسلامی سەدەی نۆزدەو سەرەتای بیستەم، کە دەیویست بنەڕەتەکانی ئیسلام لەگەڵ نوێگەری بیری نوێدا بە یەکەوە ببەستێتەوە.

هەروەها بیر لە دۆزینەوەی فۆرمی نوێ دەکاتەوە بۆ کۆکردنەوەی من و ئەوی دی، لەڕوانگەیەکی هاوشانی و وەك یەکییەوە، نەك خۆ بەکەم زانین و بەزینەوە، چەندەها پرسیار دووبارە لەخۆی دەکاتەوەو وەڵامی نوێیان پێ دەداتەوە، لەوانەش: پرسیاری بوژاندنەوەو پێشکەوتن، تازەگەری و داهێنان، رەسەنایەتی و هاوچەرخێتی، مۆدیرنەو بەهاکانی، ناسنامەو ناسیونالیزم... هتد[1].

کاتێك ئیسلامییە نوێکان لە ڕوانگەی گۆڕانی واقیع و ئەرك و چاوەڕوانییەکانەوە، بە ئاسانی لەوە تێدەگەن کە شێوازە کارکردنە کۆنەکەی ئیسلامییەکان و جۆری پەروەردەو رێکخستن و سەرکردایەتی و گوتارو ئامانج و میکانیزمەکانی، توانای بەردەوامبوونیان نامێنێت، خۆئەگەر هێزێك هەر سوور بێت لەسەر درێژەدان بە ڕەوتە کۆنەکە، ئەوا لەم سێ خاڵە بەدەر نابێت:

(أ) پاشەکشەو پوکانەوەو مانەوە لەسەر پەراوێزی کۆمەڵگەو کایەی سیاسەتدا، یاخود ناچاربوون بە هەندێ هاوپەیمانی و بەشداری سنووردار لەسەر حسابی بەهاو دروشمەکانی.

---

[1] الدكتور جيلاني أبوبكر/ أسئلة الفكر الأصلاحي المعاصر، almoTHaqaF.com

(ب) پەنابردنـە بـەر شـێوازێکی نادیموکراسـییانە بـۆ گرتنەدەسـتی دەسـەڵاتو سـەرەنجام پێـشکەشکردنی نموونەیـەکی ئیـسلامی شـێواو لەچوارچێوەی چەمکی دەوڵەتی ئیسلامیدا، لە وێنەی سودان.

(ج) کەوتنە ناو داوی توندوتیژییـەوە: ئیـسلامییە نوێکـان ئامـاژەو رەمزن بۆ تێپەڕاندنی ئەو ئەگەرانەو داننـان بـە فـەزای گـشتیو کایـەی سیاسەت بەو جـۆرەی مۆدیرنـەی سیاسـی خولْقاندوویـەتی بـە دیـدێکی ریفۆرمخوازانــەوە بـۆ کەمکردنــەوە لــە دەرهاویـشتە نەرێنییــەکانی و رزگـاربوون لـە دۆخـی نیگـەرانیو دڵـەڕاوکێ و خۆیـەکلایی کردنـەوەی فیکریو سیاسی.

بۆ ئەمەش خۆیان بەجۆرێ رێکدەخەنەوە کە لەگەڵ پێویستییەکانی سەرکەوتن لە کێبڕکێـی سیاسـیدا گونجـاو بێـت، جیاکردنـەوەی کایـەی (بانگەوان)و (سیاسەت)یـش دەچـێتە چوارچـێوەی خۆئامـادەکردن بـۆ مامەڵەکردنێکی هۆشیارانە لەگەڵ رێساکانی گەمەی سیاسـی لـە فـەزای گشتی پڕ لە ململانێو کێبڕکـێو بەرنامـەو پـرۆژەو تـەماحو نـاڕەزاییو گوتاری جیاواز.

## فەسڵی دەهەم:
## بیناکردنەوە چەمکی بانگەواز (دعوة)
## لە مەرجەعیەتی ئیسلامییە نوێکاندا

ڕەوتی ئیسلامی لە قۆناغی پاش ئیسلامییدا، سەرلەنوێ چەمکی بانگەواز (دعوة) پێناسەو بینا دەکاتەوە، بەڵکو خودی گۆڕانکارییە فیکریو سیاسیو ڕێکخراوەییەکانو دووبارە بیناکردنەوەو نوێکردنەوەی ناوەرۆکی چەمکی سیاسەتو نزیکردنەوەی لە ناوەرۆکە مۆدێرنە هاوچەرخەکەی، گۆڕان لە چەمکی بانگەوازو پرسیاری گونجاوی نەگونجاوی کۆکردنەوەی لەگەڵ کاری سیاسیدا لە چوارچێوەی ڕێکخراوێکی هاوبەشدا بەدوای خۆیدا دەهێنێت.

لەڕاستیـشدا یـەکێ لـە هۆکارەکـانی ئـەوەی بانگـەواز، بـەو جـۆرە بمێنێتەوە و لەگەڵ کارە سیاسییەکەشدا بە یەکدا بچن، نەبوونی ژیـانی سیاسی بووە لە زۆربەی وڵاتانی ئیسلامیدا. واتە لە نەبوونی دیموکراسی و ئـازادی سیاسـیو مـافی خۆڕێکخـستنو گوزارشـت لـە خۆدانـەوەی ئازادەوە سەرچاوەی گرتووە. لـە زۆر شـوێنو کاتـدا ڕێگـا بـە تـەوژمی ئیـسلامی نـەدراوە حیـزبو مینبـەری فـەرمیو ئاشـکراو یاسـایی خـۆی هەبێت. ناچار بەڕووکردنە ئیشکردنی نهێنیو ژێرزەمینی کراوە.

ئـەوەی لـە ئێـستاشدا لـە هەنـدێ وڵاتـدا دەبینرێـت، دروسـتبوونی رووبەرێکی گشتییە کە ئیسلامییەکانیش دەتـوانن تیایـدا بـبنو چـالاکی ئـــەنجام بـــدەنو کێبڕکـــێ بکـــەنو رەخنـــە بگـــرن. پێویـــستییەکانی خۆگونجاندن لەگەڵ یاساکانی ئەو رووبەرەو تەکنیکەکانی کاری سیاسی هاوچەرخو کرانەوە بەڕووی هاووڵاتیو دەنگدەردا، وای کردووە، پرسـی بانگەوازو رۆڵو پێگەو وەزیفەی ببێتەوە بە بابەتی مشتومڕی فیکریو رێکخراوەیی، واتە ئەگەر تا دوێنێ خەمە گەورەکـە گەیانـدنی بانگـەواز بووبێت، بەو جۆرەی گەڵاڵە کراوە، کە لە ڕاستیدا ئایدۆلۆژیا بووە، ئەوا لە ئێستادا پێویستی دووبارە پێناسـەکردنەوەی نـاوەرۆكو ئاماژەکـانی چەمکەکە هاتۆتە گۆڕێو دەبێت وەڵامـی نـوێی پـێ بدرێتـەوە، چـونکە چـاوەڕوانیو خواسـتە سیاسـیو روحیـەکانی کۆمەڵگـە گۆڕانکارییـان بەسەردا هاتووە، ئەوەش دەخوازێت چەمکەکانی ئـەدەبیاتی ئیـسلامی نوێش دووبارە بینا بکرێنەوە. ئەوەی ئەم پێناسـەکردنەش لـە رابـردوو جیادەکاتـەوە، بیرکردنەوەیـە لـە چوارچـێوەی دەوڵـەتی نـوێ، لەگـەڵ

جیاکردنـەوەی (ئیـسلام) لـە (ئیـسلامییەکان) و ڕەوتـی ئیـسلامی کـە تێکەڵاوکردنیان بە یەکتر بـە یـەکێ لـە سـیما جیاکـەرەوەکانی قۆنـاغی پێشووی ئیسلامییەکانو ڕەوتی ئیـسلامی لـە قەڵـەم دەدرێـت. خـودی بیرۆکـەی هەمەلایەنـەبوونی (ئیـسلام) و ئایـدۆلۆژیای ئیـسلامی نـوێش هۆکـارێکی گرنگـی ئـەو تێکەڵاوکردنـە بـوو. ئەمـە جگـە لـەوەی کـە پێویـستییەکی کـاتی ڕووبەڕووبوونـەوەی خۆرئـاوا و مۆدیرنـە و خۆرئاواگەرایی و ئایدۆلۆژیا نوێکان سەپاندبووی. واتـە تێکەڵاوبوونەکـە بەرهەمی دۆخێکی لەناکاوو هەستکردن بـە لاوازیو بـێ تفـاقی بـووە. هەروەك چـۆن ئایـدۆلۆژیاو ڕەوتـی ئیـسلامی نـوێ هـەر لـە بنەڕەتـەوە کاردانەوە بووە بەرامبەر واقیعی دوای ڕوخانی سەڵتەنەتی عوسمانی.

ئایدۆلۆژیاو ڕەوتی ئیسلامی نوێ پاساوەکانی بوونیو خەسڵەتەکانی لە خـودی ئیـسلامەوە وەردەگرێـت، بـۆ نموونـە لەبـەر ئـەوەی ئیـسلام جیهانییە، دەبێت ڕەوتی ئیـسلامیش جیهـانی بێـت[1]. هـەروەها ئەگـەر ئیـسلام هەمەلایەنـە بێـت، ئـەوا ئایـدۆلۆژیای ئیـسلامی نـوێش دەبێـت هەمەلایەنە بێتو لەبەرگیراوەی ئیسلام بێـت، لەکاتێکـدا واقیـع پێمـان دەڵێت، جیهانی بـوونی هەنـدێ لـە ئایـدۆلۆژیاکانو خـەونی گێڕانـەوەی دەسەڵاتی لەدەستچووی مێژوویی لە پشت ئـەم وەسـفو خوێندنانـەوە بووە، نەك خودی ئیسلام.

---

[1] فتحـي يكـن، أبجـديات التـصور الحركـي للعمـل الـسلامي، انتـشارات مـدين، قـم، ١٤١١ هـ،لا١٣٩.

گەر بە وردیش سەرنج لە ناوەرۆکی ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ بدەین، دەبینین یەکسانە بە ئیسلام لەم سەردەمەدا، واتە لافی نوێنەرایەتییکردنی ئیسلام لە دنیای نوێدا لێ دەدات، هەڵگرانی پێیان وایە نوێنەرایەتی نوسخە پاكو خوایيو ئاسمانییەکەی ئیسلام دەکەن.

بانگەوازیش لە چوارچێوەی ئەم واقیعو لێکدانەوانەدا، خەمی یەکەمی دەبێتە دووبارە پێشکەشکردنەوەی ئیسلام وەك کۆیەکی لە پچڕان نەهاتوو ئایدۆلۆژیایەکی هەمەلایەنە. کە بۆ هەموو پرسیارێك وەڵامو بۆ هەموو کێشەیەك چارەسەری خۆی پێیە، بەجۆرێك هیچ کونوکەلەبەر و پرسێ نییە بکەوێتە دەرەوەی چارەسەری ئیسلامییەوە، هەموو بیرکردنەوەیەکی پێچەوانەی ئەمەش یەکسانە بە تۆمەتبارکردنی ئیسلام بەوەی کەمو کوڕی تیایەو ناتەواوە؟!

بیرۆکەو میکانیزمی رەسەنسازی ( التأصیل)یش لێرەوە سەرچاوە دەگرێت، واتە بۆ ئەوەی بسەلمێت کە هیچ چارەیەکی پێویستی مرۆڤ ناچێتە دەرەوەی بازنەی ئیسلامەوە، دەبێت هەرچی هەیە و بەتایبەتیش سەر بەدەرەوەی ماڵی ئیسلامو شەریعەت، بە مۆڵەت پێدان بێنە ئەم ماڵەوە، ئەوەی ئەم پرسەشی کرد بە یەکێ لە سەرچاوەکانی داخرانی فیکری ئیسلامی نوێ دوو مەسەلە بوو:

(أ) شەریعەتداربوونی ئایدۆلۆژیاو رەوتی ئیسلامی نوێ، لەجیاتی (پەیام مەداربوون) و (ئەخلاق مەداربوون).

(ب) تێکەڵ بوونی پرسی (تأصیل) ەکە بە کەمو کورتی توانێی ئەوانەی ئەنجامی دەدەنو کەتنە ژێر کاریگەری پاشخان فیکریو ئاستی مەعریفیو جۆری چاوەڕوانییەکانیان.

هەرچۆنێك بێت ئەو بابەتێکی ترە، خوا حەزکات لە دەرفەتێکی تردا دێینەوە سەری، سەرنجێکی تر کە پێویستە لێرەدا ئاماژەی پێ بکەینو وەبیری بێنینەوە، ئەوەیە، کە بەشێکی بنەڕەتی ناوەرۆکی چەمکی بانگەواز لە ئەدەبیاتو رەوتی ئیسلامی نوێدا، لەژێر کاریگەری رەتکردنەوەی بانگەشەی عەلمانییەتو لێکجیاکردنەوەی (ئاین)و( دەوڵەت) گەڵاڵە بووەو خەملیوە. واتە خەمێکی گەورەی بانگەوازو ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ، ئەوە بووە، کە چۆن بیسەلمێنی ئەم دووانە نەك هەر لە یەکتری جودا نین، بەڵکو بە جۆرێ بەیەکدا چوون بێ یەك راڤە ناکرێن[1].

ئەمەش پێمان دەڵێت کە ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ بەشێك بووە لە شەڕی دووبارە راڤەکردنو پێناسەکردنەوەی ئیسلام لە سەردەمی نوێدا. هەوڵدان بۆ پەراوێزخستنی ئیسلام لە ژیانی گشتییدا لە پشت ئەم شەڕەوە بووە، ئەو شەڕەی تاکو ئێستاش پاشماوەکانی بەردەوامەو جیهانی ئیسلامیش باجێکی گەورەی لە پێناودا دا، جەنگەکەش پێش ئەوەی (ئاینی) و (کەلامی) بێت، سیاسی بوو، واتە جەنگێ بوو تێکەڵ بە ململانێ سیاسییەکان و کێشمەکێشی مۆدێلو

[1] عبدالقادر عودة، سەرچاوەی پێشوو، لا.

سیستمەکان لەنێو یەکدیدا. ناوبردنی دۆخەکەش بە جەنگ، ئاماژەیە بە نەبوونی ڕێکەوتنو سازان لەنێوان ئایدۆلۆژیاو تەوژمە جیاوازەکاندا، کاتێ ڕێکەوتنێکی لەو جۆرەش نەبێت، دیموکراسییەکی راستیش لە ئارادا نەبێت، پێکدادان دەبێتە بژاردەی سەپاو بەسەر لایەنەکاندا، گیانی بەیەکەوە ژیان بەرەو لاوازی دەچێتو ململانێکان لە (سفر)ی نزیك دەبنەوە. تەنانەت لەو کاتانەشدا بەڕواڵەت بە یەکەوە دەژین (وەك چلەکانی برایانو تەوژمی بەرامبەر لە میسر یاخود دواتر لە سودان) لە یەکتر خانە بە گومانو بۆ یەکتر لە دەرفەتدان. بۆیە هەندێ جار بیانوو دادەتاشرێت بۆ گەرمکردنی ململانێکانو وەدەرنانی هێزو تەوژمێك لە گۆڕەپانەکەو پاکتاوکردنی.

بانگەواز لێرەدا چەند (رحماء بینهم) دروست دەکات، ئەوەندەش دەبێتە کەرەسەی دەستی (اشداء)ەکان بۆ بەرگەگرتن لەو جەنگەداو هەوڵی بردنەوەی، هەر ئەمەش وای لێکردین کە لە کە لە پێشووتردا ئاماژە بۆ ئەوە بکەین، کە ئاسان نییە ئیسلامی بە ئایدۆلۆژی کراو و ئیسلاحی بێت، بەڵکو تەنها رەگەزی لە ئیسلاحی بوون، دەردەگرێت، کە ئەویش پلە پلە بوونە. ئەوەی پلەی کۆتایش دیاری دەکات، بە حومکی بە ئامانجکردنی گرتنەدەستی دەسەڵات، توانای کۆنترۆڵکردنی دەسەڵاتە.

ناولێنانی (بانگەوازیش) بە ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ لێرەوە زۆرتر روون دەبێتەوە. چونکە لە زۆربەی قوتابخانە ئیسلامیو

بانگەوازییەکانی پێشووتری جیا دەکاتەوە[1]. پاساوێکی ئەمەش ئەوەیە کە (ئیسلام) دەسەڵاتی سیاسی لە دەست داوەو دەبێتە خەمی گەورەی موسڵمان دەبێت گێڕانەوەی ئەو دەسەڵاتەو قەوارەی نێودەوڵەتی ئیسلام بێت.؟!.

بۆیە بانگەوازەکە باس لە چاکسازی تاکە کەسی و کۆمەڵایەتی نییە، بەو ئەندازەی هەشبێت ئامرازە بۆ ئامانجە گەورەکە، کە بانگەشەکردنە بۆ ((دەستپێوەگرتنی ژیانێکی ئیسلامی راستەقینە، کە لەسەر بناغەی ئەو کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی تێرو تەواو بەرپا ببێت، کە دەوڵەتێکی ئیسلامی هاوچەرخ ڕێبەرایەتی بکات))[2]. دەوڵەتێك شەریعەتی ئیسلام پیادەکاتو ئوممەتی ئیسلامی زیندوو بکاتەوە و ئاڵاکەی لەسەر زەویدا بچەقێنێ[3].

کەواتە بانگەواز لە ئەدەبیاتی ئیسلامی نوێدا لە جەوهەردا هەڵگری ناوەرۆکێکی سیاسییە، با کەرەسەی ئیسلامیشی تێدا بەکار بێت، چونکە لەسەر ئەو بناغەیە دامەزراوە کە دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی، کە حوکمڕانی بە شەریعەتی خودا بکات و موسڵمانان لەسەر ئیسلام کۆبکاتەوەو لەژێر بەیداخەکەیدا یەکیان بخات، فەرزێکی

[1] جگە لە بانگەشەی وەهابییەتو بانگەوازەکەی محمد بن عبدالوهاب کە نزیکییەکی زۆری لە هەندێ رووەوە لەگەڵیدا هەیەو خوا حەزکات لە داهاتوودا لەسەری دەنووسین.

[2] الدكتور يوسف القرضاوي، الصحوة الأسلامية بين الجحود و التطرف، الطبعة السادسة، ١٩٩٦، ص١٥٧.

[3] هەمان سەرچاوە،ل١٩٩.

سەرشانی ئوممەتی ئیسلامییە و دەبێت بۆی تێبکۆشێت، پێویستە بانگەوازکارانی ئیسلامیش بە هەرچی لە دەستیان دێت بۆ گەیشتن بەم ئامانجە هەوڵبدەنو درێغی نەکەن[1].

ئەگەر دەوڵەتیش بە بانگەوازی رووت دانەمەزرێ و پێویستی بە دەمارگیری (العصبیة) و (تەوژمو رێکخراوو)و (پەروەردە و تێکۆشان)و (داڕشتنی ستراتیژیو بەدەستهێنانی هێز) بێت، ئەوا بانگەواز دەچێتە ئەو چوارچێوەو لانی کەم لەم نێوەندەدا سێ ئەرك ئەنجام دەدات:

١. قەناعەتپێکردنی خەڵك بەئایدۆلۆژیا و رێبازەکە و کۆکردنەوەیان لە دەوری و ئامادەکردنیان.

٢. پەروەردەکردنی تێکۆشەرو موجاهید.

٣. رەوایەتی دان بە هەنگاوو رێکارو پاساودانی سیاسەتەکانو شکستو هەڵسانەوەکان.

ئەم جۆرە تێگەیشتنە بۆ بانگەواز خۆسەرقاڵکردن بە چاکسازی روحیو کۆمەڵایەتی لەچوارچێوەی دۆخی لەئارادابوودا بە پینەو پەڕۆو سەرقاڵکردنی بێ هودە دەزانێت[2]. چونکە دەوڵەتی ئیسلامی و پیادەکردنی شەریعەتی ئیسلامی لەڕێی ئەوەوە بە دەرمانی هەموو دەردێکی کۆمەڵگە دەزانێت، واتە خەبات بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی، کورتکردنەوەی رێگاو هەوڵدانە بۆ چاکسازی هەمەلایەنەو چارەسەرکردنی کۆی کێشەو قەیرانەکانو بەدیهێنانی خواستو

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل٢٢٢-٢٢٣.

[2] سید قطب، معالم في الطريق، ل٢٢،٣٨،٥٠.

داواکارییەکان، (کاتێ ئەم دەوڵەتە بەرپا دەبێت دابینکردنی سەرجەم پێویستیو داواکارییەکانی کۆمەڵگە دەگرێتە ئەستۆ، خوێندن بۆ نەزان، کار بۆ هەموو بێکارێك، بیمە بۆ هەموو پەککەوتەیەك، لانی کەمی ژیان بۆ هەموو ئاتاجێك، دەرمان بۆ هەموو نەخۆشێك، ماف گێڕانەوە بۆ هەموو ستەملێچوویەك، هێز بۆ هەموو زەبوونێك، دەستەبەر دەکات)[1] !

که لەڕاستیدا وێناکردنی دەوڵەتێکی وا بەتایبەتیش لە چوارچێوەی مۆدێلی دەوڵەتی ئیسلامی نوێدا، نیمچە خەیاڵەو دووپاتکردنەوەی هەڵەی کۆمۆنیستەکانە.

لێرەشەوە یەکێ لەو بۆشاییە فیکرییانەی لە ئەدەبیاتی ئیسلامی نوێدا وەڵامی پێویستی نەدراوەتەوە، چارەنووسی بانگەوازە لەدوای دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامییەوە؟ وە پەیوەندی ئەوە بە دەسەڵات لە سایەی ئەم دەوڵەتەدا؟ واتە پرسیارکردن لەوەی ئایا دوای دامەزراندنی دەوڵەت بەو رۆڵەی کە وێنای بۆ دەکرێت، بانگەواز پاساوی دەمێنێ؟ خۆ ئەگەر بە ئەرێنی وەڵامی ئەمە بدرێتەوە، پرسیاری دووەم دێتە پێشەوە کە ئەویش ئەوەیە، گەر پاساوی ما، داخۆ بە هەمان ناوەرۆکی قۆناغی پێش دەوڵەتەوە دەبێت، یاخود هاوشێوەی مۆدێلە مێژووییە ئیسلامییەکە دەسەڵات سەرقاڵی کاری سیاسیو حوکمڕانی خۆی دەبێتو بانگەوازیش دەکەوێتە دەستی زانایانو کۆمەڵگە؟ ئەمەش پرسیاری سەربەخۆبوونو ناسەربەخۆبوونی بانگەوازمان لە

---

[1] دکتور یوسف القرضاوي، سەرچاوەی پێشوو، لا٢٢٢.

قۆناغی دەەوڵەتی ئیسلامیدا لا دەوروژێنێ؟ واتە ئایا پاشکۆی دەوڵـەت دەبێت یاخود لەو سەربەخۆ دەبێت.

ئەزموونی دەوڵەتی ئیسلامی لە کۆماری ئیسلامی ئێران‌و تا ڕادەیەك (سـودان)یـش پێمـان دەڵـێن، کـە دەوڵـەتی ئیـسلامی زۆر ڕێگـا بـە سـەربەخۆبوونی بانگـەواز نـادات بـەو ئەنـدازەی کۆمـەڵێ بـانگخوازو ناوەنـدی ئیـسلامیش لـە بـیری ئـەوەدا بـن‌و بیانـەوێت سـەربەخۆیانە بانگەواز بکەن، بە چاوی گومان و هەندێ جاریش نەیار دەیانڕوانێتـێ و مامەڵەیان لەگەڵ دەکات، چونکە دەوڵەتەکە بە حوکمی ئایدۆلۆژیاکـەی نیمچە هەمەلایەنە و نوێنەرایەتی (ئاین)یش بە سەرچاوەیەکی سەرەکی ڕەوایەتی سیاسی خۆی دەزانێت، ئەوەش وادەکات ئاسان نەبێت قبوڵی ڕاڤـەی جیـاوازو تـەوژمی بـانگخوازی سـەربەخۆی بـەهێزی وا بکـات، پرسـیاری شـەرعی بخاتـە سـەر ئـەو سەرچـاوە ڕەوایەتییـە ئاینییـەی هەیەتی.

هێندەی لە ئـەدەبیاتی ئیـسلامی نوێـشدا سـەرنج دەدەیـن، هەسـت دەکەین سـەرقاڵبوون بـە کـاری خێرخـوازی‌و چاکسازی کۆمەلایـەتی‌و ئـەخلاقی لـە کۆمەڵگـەدا، جێگـرەوەی (بـدیل)ی نـەبوونی دەوڵـەت‌و دەرفەتی ڕاستەقینەیە بۆ خەباتکردن لە پێناویدا، لە سۆنگەی نـەبوونی ئازادی کارو هەڵسوڕان‌و بانگەشەو قەدەغەکردنی یاسـایی ڕاوەدوونـانی ئـەمنی تێکۆشـەرانی ئیـسلامخوازو خێرخـوازو ڕێکخراوەکانیـان، واتـە

ئیشكردن به ڕێسای ئەگەر ئەوەی پێویستە ناكرێت ئەوەی لە توانایدایە و ڕێگری لێ ناكرێت با بكرێت[1].

بێگومان لای كەسێكی وەك (سید قطب) لەو دۆخەشدا پێویست بە خۆسەرقاڵكردن بەو بابەتانە نییەو سەرجەم تواناكان دەبێت لە دووبارە گەیاندنی عەقیدەو پێگەیاندنی تێكۆشەری ئیسلامیدا چڕ ببێتەوە[2].

خودی ئەم كارە خێرخوازیو دەعەوییە گشتییانەش لە قۆناغێكی تردا دەخرێتەوە خزمەت ستراتیژی بنەڕەتی، كە لە دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامیو پیادەكردنی شەریعەتدا خۆی دەبینێتەوە، چونكە لە ستراتیژی ڕەوتی ئیسلامی نوێدا چاكسازی پێویستی بە دەسەڵاتو پیادەكردنی شەریعەت هەیە، واتە دەكەوێتە قۆناغی دوای دامەزراندنی دەوڵەتەوە!

ئەگەر بشوترێت ئەی چی لە (دروستكردنی كۆمەڵگەی موسڵمان) وەك ئامانجی سێهەم لای برایانی موسڵمانو بەنناای دامەزرێنەری بكەین؟ دەتوانین سەرنج بۆ ئەوە ڕابكێشین كە مەبەست لە (كۆمەڵگە) لەوێدا، مانا باوەكەی كۆمەڵگە نییە، بەڵكو دروستكردنی بنكە (قاعدة)یەكی تێكۆشەرو كۆمەڵ (جماعە)یەكی خاوەن دەمارگیریو پێگەیەنراوە، كە توانای ئەنجامدانی ئەركەكانی قۆناغی ڕاپەڕاندن (تنفیذ)ی هەبێت بۆ ئەوەی بگات بە (تمكین) داواكردنی (بەننا) لە

---

[1] دكتور یوسف القرضاوي، سەرچاوەی پێشوو، لا٢٢٣.

[2] سید قطب، معالم في الطريق، لا ٣٨،٥٠.

لایەنگرانی دەخواست (٣٠٠) کەتیبەی پەروەردەکراوی بخەنە بەردەست تا دەریایان پیَ ببڕیَتو ملی هەموو زۆرداریَکیان پیَ بشکیَنیَت[1]. ئەوەش بەشیَ لەوەمان بۆ لیَکدەداتەوە کیَشەی تیَکەڵکردنی کۆمەڵگە (مجتمع) لەگەڵ کۆمەڵ (جماعة)یش لە فیکری حەرەکی نویَدا هەر لەمەدا کورت نابیَتەوە، بەڵکو پەلدەکیَشی بۆ زۆر جیانەکردنەوەی کۆمەڵگە لە دەسەڵات، یاخود کۆمەڵگەی مەدەنی لە کۆمەڵگەی سیاسی، کە تارادەیەك بەهۆی تازەیی ئەم چەمکانە لە دنیای ئیَمەدا هەندیَ عوزریان هەیە، بەڵام ئیسلامییەکانی ئیَستا گەر ئەم جیاکاریانە بکەن کە پرسی پیَویستی جیاکردنەوەی بانگەوازو سیاسەتیش بەشیَکی لیَرەوە سەرچاوە دەگریَت، هیچ پاساویَکیان نییە، بەڵکو دەبیَتە ئاماژە بە دواکەوتوویی فیکری و سیاسیانو دابڕانیان لە واقیعی سەردەم. چونکە سەرهەڵدانی کۆمەڵگەی مەدەنی لە ئیَستادا، دەرفەتی جۆراوجۆر دەخاتە بەردەم ئیسلامییەکان، وایان لیَ دەکات سەرجەم چالاکیو پرسو بابەتەکان لە چوارچیَوەی ریَکخراویَکی هاوبەشی هەمەلایەنەدا کۆنەکەنەوە، بەڵکو بە سوودوەرگرتن لە دەرفەتەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی، سەربەخۆییان پیَ بدەن، بۆ ئەوەی زیاتر گەشە بکەنو نەبنە کیَشەش بۆ یەکترو، نزیکییەکی زۆرتریشیان لە هاوڵاتییەوە هەبیَت.

خودی سەرهەڵدانی چەمکی کۆمەڵگەی مەدەنیش بۆتە فشار بەسەر ریَکخراوی هەمەلایەنەو تیَکەڵاوی بیَپاساوی بانگەوازو کاری سیاسیو

---

[1] مجموعة رسائل،ب. دووەم، لا٣٦

حیزبی. بەجۆرێك ئەگەر رێكخراوە ئیسلامییەكان خۆیان ئەو بڕیارە نەدەن، بەشێ لە كادر و ئەندامانیان ئەنجامی دەدەنو لەناو خۆشیاندا دووچاری چەندین كێشمەكێشو ناكاراییو هەڵوەرین دێن.

ئەم بەسەربەخۆ سەیركردنەی كۆمەڵگەش لە دەسەڵات، پێشینەیەكی ئیسلامی هەیە، جگە لەوەی لەگەڵ ئەو دیدە ئیسلامییەدا كۆكە كە جەخت لە كۆمەڵگەیەكی بەهێزو دەوڵەتێكی سنووردارو لێپرسراو دەكات، ئەزموونە مێژووییە ئیسلامییەكەش پشتی دەگرێت، بە حوكمی ئەوەی لە سایەی دەسەڵاتی ئیمپراتۆرییانەی جیهانی ئیسلامدا، كۆمەڵگە بانگەوازو عیرفانو پەروەردەو دەسەڵاتی یاسادانانی گرتۆتە ئەستۆ. تەنانەت خوێندنو بەدەمەوەچوونی توێژە نەدارەكانو نەخۆشخانەكانیش، كۆمەڵگە خۆی بەڕێوەی بردوون. چڕكردنەوەی هەموو كایەو چالاكییەكان بە دەوری دەوڵەتداو كردنی بە جێگرەوەی كۆمەڵگەو لاوازكردنی كۆمەڵ بەرامبەری، دەگەڕێتەوە بۆ دنیاو فیكری ئیسلامی نوێ، لەژێر كاریگەری مۆدێلی نوێی دەوڵەت لە خۆرئاوادا. لەو رووەشەوە هێنانی مۆدێلە هەمەلایەنە نادیموكراسو سەركوتكەرەكەیە. لەو سۆنگەوە كە دیموكراسی و دەستور سالاری جەخت دەكەنەوە لەسەر دەسەڵاتی سنوردارو، لێكجیاكردنەوەی كۆمەڵگەی مەدەنیو سیاسیو رێزگرتن لە دەستپێشخەرییە كۆمەڵگەییەكان دەكەنەوە. هەر بۆیە كاتێ لە ئێستادا و لە قۆناغی پاش ئیسلامی سیاسی دا هەوڵی دووبارە داڕشتنەوەی چەمكەكانو لەوانەش چەمكی بانگەواز دەدرێت، ئاماژەیە بە هۆشیار بوونەوە

بەرامبەر مەترسییەکانی دەوڵەتی نویێ لە دەرەوەی دەستەبەری‌و میکانیزمەکانی دیموکراسی‌وبوونی کۆمەڵگەیەکی مەدەنی بەهێزەوە.

هەروەها ئاماژەیە بە گەڕانەوەیەکی زۆرتر بۆ پێودانگە ئیسلامییەکان بۆ پێناسەکردنی چەمکی بانگەواز، هەوڵدانیشە بۆ کۆتایی هێنان بە فۆرمی لە پێکەوە گرێدانی بانگەوازو سیاسەت کە تیایدا سیاسەت زاڵە.

بۆ نموونە گەر بانگەواز لە بەرگی ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێدا لای (برایان) بە سیفەتی هەڵگرانی یەکەمی تێزی ئیسلامی بە ئایدۆلۆژیا کراوو هەمەلایەنە، سێ قۆناغی بۆ دیاری کرابێت: ناساندن (تعريف)، رێکخستن‌و پێگەیاندن و خۆسازدان (تكوين) دەست بەکاربوون‌و راپەڕاندنی پرۆژەکەو بە دەسەڵات گەیاندنی (تمكين) یاخود (تنفيذ). یاخود لە شوێنێکی تردا باس لە (ئیمانی قوڵ) و (ئامۆژگاری باش) و (باشترین مشت‌و مڕ)، دیارە ئەمەش لە بنەڕەتدا بۆ بانگکردنی تاکی ناموسڵمان بۆ ئیسلام، نەك موسڵمانان خۆیان، چونکە بە گشتی قورئان وشەی (تذكرة) بۆ دوواندنی باوەڕداران بەکار دێنێت: ﴿**وَذَكِّرْ فَإِنَّ الذِّكْرَىٰ تَنفَعُ الْمُؤْمِنِينَ**﴾[1]. بانگەوازی موسڵمانان بۆ باوەڕهێنانەوە بە ئیسلام نییە، بەڵکو لە پێناو (خشوع)ی دڵ‌و وەلانانی دڵ ڕەقی‌و ئەزموونکردنی و روحی‌و ئەخلاقی ئیسلامە ﴿**أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَنْ تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ الْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا كَالَّذِينَ أُوتُوا**

---

[1] الذاريات/٥٥

﴿الْكِتَابَ مِنْ قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ الْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ ۖ وَكَثِيرٌ مِنْهُمْ فَاسِقُونَ﴾[1]. بیرخستنەوەی باوەڕدارانە بە دۆخی ئاسایی باوەڕداریو ئاستی کارلێکی شایستە بە باوەڕداران، لەگەڵ سەدای بانگی رەهایی ئاسمان.

بۆیە ئەگەر بانگەواز لە بەرکی ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نویدا، تێکەڵەیەك بێت لە پڕوپاگەندە (دعاية) و بانگەواز (الدعوة)، لە سۆنگەی سیاسی بوونی بانگەوازەکەوە، بە پلەی یەکەم بانگەوازەکە لە مزگەوتا بێت و ئاراستەی خەڵکە ئایندارەکە بکرێت، بە مەبەستی دووبارە زیندووکردنەوەی ئینتمای سیاسی بۆ ئیسلام و سەیرکردنی وەك ئایدۆلۆژیایەك بۆ خەباتو تێکۆشانو گەیشتن بە ئامانجەکان، ئەوا لە سایەی فیکرو تێگەیشتنی ئیسلامییە نوێکاندا، بانگەواز تا رادەیەکی زۆر دەبێتەوە بە (بانگەوان)و ئامانج تیایدا ئیسلاحی تاکە کەسیو کۆمەڵایەتی دەبێت، پەیوەندی بە سیاسەتەوە لە ڕاستەوخۆوە دەبێت بە ناڕاستەوخۆ. بە حوکمی ئەوەی بوژاندنەوەی گیانی ئیسلامخوازی لە تاکداو موتوربەکردنی ئایینداری بە هۆشیاریەکی دیندارانەی هاوچەرخو بەها ئیسلامییە باڵاکان، بمانەوێتو نەمانەوێت، کار دەکاتە سەر جۆری رەفتارو هەڵوێستگرتنی سیاسی ئەو تاکەش، بەڵام بەرجەستەکردنی بەهاکان پانتاییەکی فراوانتر بەخۆوە دەگرێت، واتە دوای رێکەوتنی ئیسلامیو عەلمانییەکان لەسەر ناسنامەو پایەکانی سیستمی سیاسی،

---

[1] الحديد/١٦.

لایەنە ئیسلامییەکان دەبێت بیسەلمێنن لە خەڵکی تر بەتواناترن بۆ دژایەتی گەندەڵیو ناعەدالەتیو خزمەتکردنی خەڵكو فەراهەمکردنی ئازادی و خۆشگوزەرانی، دەنا وەك جاران تاکە بژاردەی دەنگدەری باوەڕداری هوشیار نابن.

بانگەواز لەم چوارچێوەداو لە میانەی رێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیدا، گەرچی بە پلەی یەکەم کار لەسەر (ئیمان)و (ئەخلاق) دەکات، بەڵام لە هەمانکاتدا کار لەسەر بەپێوەر کردنی بەها ئیسلامییە باڵاکانیش لەژیانی تاکە کەسیو کۆمەڵگەدا دەکات، لەسەر ئاستی کۆمەڵگەداو بە شێوەیەکی قوڵ کار لەسەر پاراستنی ناسنامەو پیادەکردنی شەریعەتو زیندوێتی روحو بەرزی ئامانجو پەرۆشی بۆ چارەنووسی کۆمەڵگەو هاودڵیو هاوسۆزیو لێبوردەییو ئەخلاق سالاریو عەدالەتو دادپەروەری دەکات، بەڵام نابێتە ئامرازی دەستی دەسەڵاتو هیچ هێزێکی سیاسی، بەڵکو دەبێتە فشار بەسەر هێزە سیاسییەکانەوە لەوانەش ئیسلامییەکان، لەپێناو دەستگرتن بە بەهاکانەوە، لێرەوە ئەوەی لە ئێستادا بەناوی (بانگەواز) لەناو ئیسلامییەکاندا، دوای دروستکردنی هێزی سیاسی نوێو رێکەوتن لەگەڵ تەوژمی عەلمانیدا لەسەر سیستمی سیاسی دەمێنێتەوە، ئاماژە دەبێت بە ئامۆژگاریو وەعزی دینیو پەروەردەیەکی تێکەڵ لە (فیقە)و (سەلەفیەت) و (هەندێ رواڵەتی سۆفی) ئەندامان، لەگەڵ بە مەرجکردنی توندی رواڵەتی ئیسلامی بۆ ئەندامێتی، هیچ کام لەوانەش

لەگەڵ بانگەوازێکی روحیو ئـەخلاقی بـەرفراوانی ئیـسلامی هاوچـەرخدا ناگونجێن.

چونکە ئامانجی (بانگەوان) یاخود (تذکرة) دوور مەودایەو کار لەسەر پەروەردەو پێگەیاندنی مرۆڤ و ئالۆگۆڕی کۆمەڵایەتی دەکات، ئامانجی ئەوەیە مرۆڤ خودای خۆی بناسیو خۆشی بویٚو ئامادەی دیداری بێت[1].

لێرەوە بانگەواز رۆڵـی چـاودێری و دەسـتەبەرکردنی دەگێڕێـت، بـۆ ئەوەی خەڵکی نەبنە دەستو پێوەندی رێکخستنو دەوڵەت. تەفـسیری نەیـــەت ئایـــەتو فـــەرموودەکانی تایبـــەت بـــە گوێڕایـــەڵی بەســـەر شـــوێنکەوتووانیدا بخوێنێتـــەوە، بـــەوەش سەرکێـــشیو لـــەرێ دەرچوونەکانی گەورەتر بنو دەورەبەرەکەشـی زیـاتر وەك خزمـەتکارو بەردەسـتیان لیٚ بێـت[2]. لەکاتێکـدا کـاری بـانگخواز گەیانـدنی دەنگـی ئیـسلامە، وەبیرهێنانـــەوەی پـــەیمانی (فطـــرة)و ئـــەرکو مافـــەکانو بوژاندنـەوەو زیندووکردنـەوەی روحو دڵو دەروونـەکانو، بـەهێزگردنی گیانی چاکەخوازی و دروستکردنی مرۆڤی ئەخلاقییە، گەیاندنی دەنگی هەقو میهرەبانیو دادپەروەرییـە بـە هـەموان، دەنگـی زگمـاکی پـاكو تینوێتی مرۆڤە بۆ خۆشویستی خوداو سۆزو میهرەبـانیو لێخۆشـبوونی ئەو. ئومێدخستنەوە بەر نائومێدەکانو مانابەخشین بـە ژیـان و ئـازارو ناخۆشیو کەمکردنەوەی رەنجو دەردەکانی مرۆڤایەتییە.

---

[1] الـدعوة الى الله مـن تـراث الأمـام و سـيرته (عبدالـسلام ياسـين) www.yassine.net يناير/٢٠١٤

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

ئەمەش لەگەڵ بازنە تەسکەکانی ڕێکخستنو جەبرەکانی سیاسەتدا ناگونجێت، نابێت تێکەڵ بە بەربەستە دەروونییە حیزبیو ناوچەییو گروپیو ئایدۆلۆژییەکان بکرێت.

دەعوە لەبەر ئەوە ((گۆڕینی بانگەواز بۆ جێگرەوە (بدیل)ێکی ڕۆشنبیریو سیاسیو ئابوریو ململانێ کردن لەگەڵ بژاردەو جێگرەوەکانی تر لادانە لە ناوەڕۆکی پەیامی بانگەواز، هەر لە بنەڕەتیشەوە دەبێت جیاوازی لەنێوان بانگکردن بۆ لای خودا و (تذكرة)و چارەسەری ئیسلامی بکەین، چونکە هاو ناوەڕۆك و واتا نین[1].

بانگەواز دەبێت پێویستە بۆ لای خواو ئاینەکەی بێت، نەك بۆ هیچ بەرنامەو ڕێبازو گروپێك[2]. گروپو کۆمەڵە ئیسلامییەکان مافی خۆیانە بانگەشە بۆ خۆیان بکەن، بەڵام دەبێت ئەو بانگەشە بەناوی خۆیانو بۆ لای خۆیان بێت. دەنا تێگەیشتنی سنورداری خۆیان یەکسان دەکەن بە ئیسلامو خۆیان بە نوێنەری ئاینو (وصی) بەسەر خەڵکەوە دەزانن. کە ئەوەش ڕوانگەی ئیسلام قبوڵی ناکات و دەبێتە هەوێنی پرۆژەی دابەشکردنی کۆمەڵگەو بە یەکدادانو شەڕی ناوخۆ[3]. ئەو تێکەڵاوکردنەی ئامارەی پێکرا زیانی گەورەی بۆ خودی تەوژمی ئیسلامیو کۆمەڵگە موسڵماننشینەکان هەبووە.

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[2] مفهوم الدعاية www.Tellskuf.com، ٢/نوفمبر/٢٠١٠.

[3] محمد عابد الجابري، الدين و الدولة و تطبيق الشريعة، ص١١٥-١٢٢.

ئیسلامییە نوێکان هەوڵ دەدەن تەوژمی ئیسلامی نوێ چەمکی بانگەواز لە ناوەڕۆکە وەهابیو سەلەفییەکەی ڕزگار بکەن کە جەخت لەسەر دوو خاڵی بنەڕەتی دەکاتەوە:

١. بانگەواز کۆکەرەوەی مەسەلە ئاینیو سیاسییەکانە لەناوخۆیدا.

٢. پشتگیری بانگەوازی دینییە بە حوکمڕانەکان[1].

کە لە نموونەی وەهابییەکاندا، پشتیوانەکە لە (آل سعود)دا خۆی دەبینێتەوە، بەڵکو هەوڵ دەدات بانگەواز سەربەخۆیی خۆی لە چوارچێوە سیاسییەکانو دەسەڵات بپارێزێت. بەم جۆرە (بانگەواز) چیدی (ئایدۆلۆژیا)یەکی هەمەلایەنە نامێنێ، هەمەلایەنەبوونی ناوەڕۆکێکی ئەخلاقیو بەهاییانە پەیدا دەکات، نەك (فیقهی) و (سیاسی) بەو جۆرەی لە ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێدا خراوەتە ڕوو.

لێرەشەوە بانگەواز یاخود (ارشاد) کە بە پەسەنتری دەزانم بۆ نێو کۆمەڵگەیەکی موسڵمان، دەبێتە هێما بۆ شۆڕشێکی ئیمانیو ئەخلاقیو بەهاییو ڕۆحی، نەك گرتنەدەستی دەسەڵاتو کۆنترۆڵکردنیو سەپاندنی تێگەیشتنێکی دیاریکراو لە (ئاین) و (شەریعەت) بەسەر کۆمەڵگەدا. بەو جۆرەی لە چوارچێوەی مۆدیلی دەوڵەتی ئیسلامیدا وێنا کراوە. بە واتایەکی تر بانگەوازێك دەبێت (پەیامو ئەخلاق مەدار) نەك (فیقە) مەدار، بانگەوازێك دەبێت بۆ ئەوەی کە لە کاتێکدا موسڵمانی هاوچەرخ لەناو شارستانیو سەردەمەکەی خۆیدا دەژیو

---

[1] دعوة شيخ محمد عبدالوهاب /الحركة الأصلاحية للشيخ محمد عبدالوهاب.

بـەگوێرەی پێـوەرە جەوهەرییـەکانی هـەوڵی سـەرکەوتن دەدات، لـە هەمانکاتدا شانازی بە بەرنامـەی موسـڵمانێتی خۆیـەوە بکـاتو رێـز لـە کەسێتی مەعنەوی خۆی بگرێت. کە هەر ئـەوەش جـۆرێ لـە بەیەکـەوە گونجانو هاوسەنگی بۆ ئەو کەسێتییە دەگەڕێنێتەوە، لە گرژیو هەست بە نامۆییو رقو توڕەییو توندوتیژی دەیپارێزن، هەست ناکات ئیـسلام ئەمانـەتێکی قـورسو گرانـە بەسـەر شـانییەوە، پاراسـتنی چـوونە دەرەوەی مێژوو شارستانێتی دەوێت، بەڵکو بـە پێـچەوانەوە ئـەو پـەنا ئـارام بەخـشەیە کـە شـەکەتی ژیـانکردنی لـە نـاو شـەپۆلەکاندا لا کـەم دەکاتەوەو ئومێدو متمانە بە خۆبوونی پێ دەبەخشێت.

# فەسڵی یانزەهەم:
# کێشەو دەرهاویشتەکانی بە تێکەڵ مانەوەی بانگەواز و سیاسەت لە چوارچێوەی رێکخراوێکی هاوبەشدا

**پێشەکی:**

پەیوەندی نێوان بانگەواز (دعوة)و کاری حیزبی یاخود سیاسی، بابەتێکی گەرمی ئەم قۆناغەی نێو ناوەندە ئیسلامیو ئەکادیمیەکەی ناوچەکەو لە هەندێ رووشەوە، دەرەوەی ئەویشە. ئەم پرسەش بە پێچەوانەی هەندێ بۆچوونی سادەو نازانستیو سۆزدارانەوە، پرسێکی دروستکراو و وروژێنراو نییە لەلایەن هەندێ کەسەوە، مەسەلەکە کاریگەربوونی ئەم و ئەویش نییە بە تەوژمە فیکرییەکان، بەڵکو پەیوەستە بە بارودۆخە بابەتییەکانو گۆڕاوەکانی واقیعەوە.

بەشـێکە لــە دەرکەوتــەو بەرکەوتــەکانی ئــەم قۆناغــەی تــەوژمی ئیسلامیو تەحەداکانی. تاڕادەیەکیش دیاردەیەکی نا ناوچەییو جیهانی ئیسلامییە، ئەم مشتومڕە لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلامیدا بە ئاستو شـێوازی جۆراوجـۆرو بەتایبـەتیش بـۆ ڕێکخـراوو هێـزە پاشـخان (اخـوان)ییـەکانو هـەموو ئـەو هێزانـەش بـە بـیروڕاو شـێوازی فیکـرو کارکردنی (ئەبو ئـەعلای مـەودودی)و کۆمەڵـەی ئیـسلامی لـە پاکستان کاریگەر بوون، لە ئارادایە. بەشێ لەم دیاردەیەش پەیوەستە بە جیهانی ئیسلامییەوە بە پلـەی جیـاواز. کـە بـە قۆنـاغێکی ئـاڵوگۆڕی سیاسـیو ئابوریو کۆمەڵایەتیـدا دەڕوات. شـێوازە کۆنـەکانی بیرکردنـەوەو کـارو خۆڕێکخستنی سیاسیو ئابوریو کۆمەڵایەتی بە لەرزە کـەوتوون بـەرەو هەڵوەشـانەوە دەچـن، بـێ ئــەوەی جێگـرەوە تازەکـانی ئـەم قۆناغـە ڕاگوزەرییـە ((لـەدایکبوونێکی نـوێ)) یـاخود (پەرەسـەندنێکی نـوێ)) بەخۆوە دەبینێت، کە لە ڕووی چۆنایەتیو چـەندایەتییەوە لـە ڕابـردوو جیـاواز بێـتو هێزەکـان دووبـارە ناچـاری خۆڕێکخـستنەوە دەکـاتو کۆمەڵێ فۆرمی سەرکردایەتیو رەمزو شێوازی ئیشکردنو چوارچـێوەی حـەرەکی تێدەپـەڕێنێتو زەمینـە بـۆ واقیعێکـی نـوێی جیـاواز خـۆش دەکـات. کـە لـە ئێـستادا سـیماکانی لـە دەرکەوتنـدان، هـەر هێزێکـی ئیـسلامیش، یـاخود تـەوژمی ئیـسلامیش لــە هــەر وڵاتێکـدا توانــای وەڵامدانــەوەی ئـەم تەحـەداو مەیدانخوازیانـەی نـەبێت، لـە سروشـتو ئەرکەکانی قۆناغەکە لەسەر فیکرو کۆمەڵگە تێنەگات، خۆی لەگەڵیانـدا نـەگونجێنێتو قۆنـاغێکی نـوێی کـارکردنی خـۆی بـەو جـۆرەی واقیعـە

نوێیەکەو ئەرك‌و چاوەڕوانییەکانی دەیخوازێت دەست پێنەکات. تووشی ناکۆکی‌و لێکترازان‌و کێشمەکێشی ناوخۆیی دەبێت. کە بەشێکی بەرچاوی ئەو ناکۆکی‌و کێشمەکێشانە پەیوەست دەبن بە خوێندنەوەی واقیعی بەسەرچوو، ئەو واقیعە نوێیەی لە حاڵی شکڵگرتن‌و جێگردنەوەدایە.

ئەم دۆخەش لە هەندێ ڕێکخراوی ئیسلامیدا سەردەکێشێ بۆ لێکترازانی ناڕێکخراوو نامەنهەجی‌و بەرنامە بۆدارێژراو، لەبری ئەوەش ئاماژە بێت بۆ پێنانە ناو قۆناغێکی نوێ وەك کەتبوونێکی حیزبی خۆی دەردەخات[1]. سیماکانیان شکڵی گرتبێت‌و خەملێبن‌و جوان گوزارشتیان لە خۆیان دابێتەوە. کۆمەڵگەی کوردستان‌و بەتایبەتیش کوردستانی باشوور، لە سۆنگەی بوونی پەراوێزێك لە دیموکراسی‌و ئازادی کارکردن و گوزارشت لەخۆدان‌و خۆتاقیکردنەوە و بیروڕا ئەزموونکردن، لەو دۆخە گشتییە بەدەر نییە. ئیسلامییەکانی کوردستانیش، بۆ زیاتر لە (٢٠) ساڵ دەچێت بەشێك لە ژیانی سیاسی‌و جەماوەری هەرێم پێکدەهێنن.

خودی واقیعی کاری ئاشکراو هەوڵدان بۆ بە حیزب بوون‌و دەست‌و پەنجە نەرمکردن لەگەڵ لۆژیك‌و پێداویستیەکانی کاری سیاسی‌و جۆری مامەڵەکردن لەگەڵ تەحەداو چاوەڕوانی‌و بژاردەو پێشهات و دەرفەت‌و ئاستەنگەکان، کارێکیان کردووە، کە مەسەلەی دووبارە

---

[1] الأسلاميون و المسألة السياسية، ص٢٣٨-٢٣٩.

خۆپێناسـەکردنەوەو بیناکردنـەوەی هێزەکـانی تـەوژمی ئیـسلامی لـە کوردسـتاندا، ببێتـە ئـەرکێکی حاشـاهەڵنەگری قۆناغەکـە. مەسـەلەی جیاکردنەوەی وەعز و ئیرشادو بانگەوازی دینیش لە مەسەلە سیاسـیو حیزبییـە نوێکـان، بـە یـەکێ لـە پـرسو بابەتـە جەوهەرییـەکانی هـەر هـەنگاوێکی لـەو جـۆرەو هـەوڵێکی جـدی خۆنوێکردنـەوەی فیکـریو سیاسیو رێکخراوەیی لەقەڵەم دەدرێت. بەجۆرێك کە هەر باسکردنێك لە نوێبوونـەوەو خۆپێشخـستنو دەرگاکردنـەوە بـەرووی گەشـەکردنێکی چـۆنایەتی گـرنگ لەبـەردەم ئـەم تەوژمـەدا، لـە دەرەوەی خەملاندنی دیدگاو بۆچوونێکی بوێرانـەی نـوێ لـەم رەووە بـەبڕوای ئێمـە هـەروەك رابردووش سەلماندی، دەچێتە خانەی کـاتو وزە بـەفیڕۆدانو ئاراسـتە شێوان و لە کاروان بەجێمانو دڵخۆشـکردن بـە شـتانێك کـە شایـستەی دڵپێخۆش کردن نین.

هەر ئەم قەناعەتو تێگەیشتنەشە وای لە ئێمەمانان کـردووە کـە لـە چـەند سـاڵی رابـردووەوە، هـەوڵ بـدەین رۆشـنبیرو سـەرکردەو کـادرە سیاسییەکانی ئیسلامییەکان، لـە سروشـتو بەرکـەوتنی ئـەم قۆناغـە و جیاوازییـەکانی هۆشـیار بکەینـەوەو بیانخەینـە بـەردەم لێپرسـراوێتی ئیـسلامیو ئـەخلاقیو سیاسـی خۆیانـەوە، لـەپێناو ئـەوەی تـەوژمی ئیسلامی کوردستان پاشماوەی زنجیری هەندێ فۆرمی فیکریو شێوازی ئیـشکردنو سـەرکردایەتی قۆنـاغی رابـردوو بپـچڕێنێت، بـە ئومێـدەوە بـاوەش بـۆ ئاسـۆیەکی نـوێی پـڕ ئومێـدترو کۆرپـەی رۆڵێکـی نـوێی شارستانیانی پڕتاو بکاتەوە.

بۆ ئەوەی بتوانێت لە ئایندەدا کۆمەڵێ ئەرکی شارستانیو نەتەوەیی و ئیسلاحیو ئەخلاقیو ئابوریو دیموکراسی لە قۆناغی داهاتوودا جێبەجێ بکات. کە بزوتنەوەی تەقلیدی کوردایەتیو چەپی وڵات لەبەردەمیاندا تاڕادەیەکی بەرچاو شکستیان خواردووە، ئەوەی لێرەشدا دەیخەینە ڕوو، تەواوکەری ئەوەی پێشوومان دەبێت، نیگاکانیشمان بە پلەی یەکەم لەسەر دەرهاویشتەکانی کۆکردنەوەی مەسەلە دەعەویو سیاسییەکان لە چوارچێوەیەکی هاوبەشی ڕێکخراوەیدا، چڕ دەکەینەوە، لەگەڵ فۆرمە پێشنیارکراوەکانی چارەسەرو ئەو گۆڕانکاریانەی پێویستە لەم رووەوە، بەسەر بیرکردنەوەو گوتارو شێوازی کارکردنی ئیسلامییەکاندا بێت.

## رەهەندەکانی کێشەی تێکەڵکردنی بانگەواز و سیاسەت

دوای ئەو پێشەکییەی خستمانە ڕوو، ئێستا دەتوانین وردترو ڕۆشنتر وێنای خواستی سەربەخۆکردنی کاری دەعەویو جیاکردنەوەی لە کاری حیزبیو سیاسی بکەین. وە لەوە تێبگەین بۆچی ئەم داواکارییە بۆتە خواستێکی ئەم قۆناغەو لە هێزەکانی سەر بە قوتابخانەی رەوتو ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ دەخوازێت، وە چۆن پشتگوێ خستنی و فەرامۆشکردنی ئەرکی دووبارە خۆبیناکردنەوەی فیکریو سیاسیو ڕێکخراوەییو دەعەوی، جگە لەوەی جۆرەها کێشە لەناو رەوتەکەدا دروست دەکات، دەشبێتە مایەی بەفیڕۆدانی وزەو تواناکانو سنورداری توانای کێبڕکێی سیاسیو بەشداریکردن لە پێگەیەکی بەهێزەوە، بەڵام

پێش ئەوەی بێینە سەر ئاماژەکردن بەو کێشانەی کە لە بەیەکەوە مانەوەی کاری دەعەوی‌و سیاسی لە چوارچێوەییەك ڕێکخراودا دەکەونەوە، دەخوازم سەرنج بۆ لای ئەوە رابکێشم کە مەبەست لەم پرسە تەنها بە دامەزراوەیی کردنی بانگەواز نییە کە لە نێو هەندێ لە هێزە ئیسلامییەکاندا بە بانگەوازی گشتی ناودەبرێت، بەڵکو مەبەست لە جیاکردنەوەی دەعوەو کاری حیزبی‌و سیاسی‌و رێکخستنەوەیان بە شێوازێکی نوێی بێکێشە ترو بەرهەمدار تر، دووبارە پێناسەکردنەوەی جۆری پێگەیاندن، گوتاری سیاسی‌و راگەیاندن، رێکخستنەوەی پەیوەندییەکان، ئامانجەکان، میکانیزمەکان مەرجەکانی ئەندامێتی‌و چۆنیەتی سەیر کردنە بۆ جۆری پەیوەندی لەگەڵ خەڵکدا.

مەبەست دەستکاری کردنی فەزای ناوەوەو بەشێ لە پێکهاتەی فیکری‌و سۆزداری ئەندام‌و پێوەرەکانی هەڵسەنگاندن‌و داوەریکردنە. واتە رۆشنبوونی ئەو ئامانجەیە، کە تێگەیشتنی ئیسلامییەکان بۆ سیاسەت، دەوڵەت، شەریعەت، حیزب، سیستمی نێودەوڵەتی، دەستوور، فەزای گشتی‌و پەیوەندی ئاین‌و سیاسەت‌و دەوڵەت، بە بەراورد بە قۆناغی پێشوو (ئیسلامی سیاسی) گۆڕانی بەسەردا هاتووە. ریزبەندی ئامانجەکان وەکو پێشتر نەماون، کار بۆ دەوڵەتی ئیسلامی‌و گێڕانەوەی خەلافەت‌و پیادەکردنی شەریعەت لە بەرگی (فیقە)دا بەو جۆرەی لە ئەدەبیاتی ئیسلامی نوێ دا، خراوەتە ڕوو ناکەن، دەستبەرداری ئیسلامی بوون نەبوون، بەڵام ناوەرۆکێکی نوێیان پێ داوەو چوونەتە قۆناغێکی تازەوە، قۆناغێ کە راستییەکانی جیهانی

نویٚ قبـولٚ دەکـەن‌و هـەوڵی هێـزو دەسـەڵات‌و سـەرکەوتوویی دەدەن، بەگوێرەی پێوەرەکانی ئـەم جیهانـە. لـە کاتێکدا دیـدێکی رەخنـەییان بەرامبەر بەشێ لە ڕواڵەت‌و دەرهاویشتەکانی هەیە.

بە واتایەکی تر ئیسلامییەکان، لە شەڕی مێژوو ژیان لـە دەرەوەی مێــژووی نوێــوە، هاتونەتــەوە نــاوی‌و دەخــوازن ســوود لــە هــەل‌و دەرفەتەکانی وەربگرن‌و لە خراپەکانی کەم بکەنەوە. دەیانەوێت لەڕێی لەخۆگرتنی دیموکراسی‌و دەوڵەتی دامەزراوەکان‌وڕێزگرتن لە مافـەکانی مرۆڤەوە، واتایەکی هاوچەرخانە بە دادپەروەری ئیسلامی ببەخشن. ئەم چـەمکە لـە کەرەسـەیەکی ئامۆژگارییـەوە بکـەن بـە دامەزراوەیـەك بـۆ حـوکمڕانی. بـۆ ئـەوەی خــەڵکی بـەش مەینـەت‌و داخکـراوی سـایەی دیکتاتۆریــەت و ســتەمکاری‌و چاوچــنۆکی‌و نالێپرســراوی، لەگــەڵ پارێزگاریکردنی لە ناسنامەی ئیسلامی خۆیانـدا، هەسـت بـە کەرامـەتی ئینسانی‌و ئیسلامی‌و مافی خۆیان وەك هاوڵاتی بکەن.

لـە ئێـستاشدا هـەولٚ دەدەیـن لێـرەدا بـە چـەند خاڵێـك ئامـاژە بـە کێشەکانی بەتێکەڵ مانەوەی کاری دەعوەو سیاسـەت لـە چوارچـێوەی یەك ڕێکخراودا بکەین. بەڵام پـێش ئـەوەی دەسـت بکـەین بـە خاڵـەکان دەخوازم ئاماژە بۆ ئەوە بکەم کە ئەگەر یەکێ لـە ئامانجـەکانی رەوتـی ئیسلامی گێڕانەوەی دینداری بێت بۆ کۆمەڵگە بۆ ئـەوەی دواتـر پـرۆژە سیاسییەکەی خۆی لەسەر بنیان بنێت ئەوا ئەوەی لە ئێستادا دەیبینین ئەوەیە، کـە مەسـەلەی ئاینپـەروەری چوارچـێوە و ئـامرازو دامـەزراوە کۆنەکانی تێپەڕاندووە.

دیاردەی دینداری لە ئێستادا بە شێوەیەکی گشتی، لە دەرەوەی ئامرازو رێکخستن‌و دامەزراوە ئیسلامییە سیاسییە فەرمی‌و نافەرمییەکان، گەشە دەکات‌و پێکدێت. وەك ئەوەی خەڵکی بیانەوێت بڵێن: ((گوتاری ئەم دامەزراوانە، ئامانجە لە پێشینەکانی کارکردنی، وە ئەو مەسەلانەی پێوەی خەریکن، گونجاو نەماون، یاخود بە کەڵکی ئەوە نەماون مامەڵەیان لەگەڵ واقیعێکی نوێی لە حاڵی شکڵگرتندا پێ بکرێت، زۆرێ لە مەبەستەکانیان لەدەست داوە. ئێستا ئێمە بیرو شێوازی نوێمان دەوێت، بۆ ئەوەی لەڕێی ئەوانەوە مامەڵە لەگەڵ واقیعە نوێکەدا بکەین))[1].

رەنگە ئەمەش تا ڕادەیەك ئەو کەم بە پیرەوە هاتنەی ئێستای قوتابیانی زانکۆ بەرەو ئیسلامییەکانمان بۆ شی بکاتەوە، چونکە خوێندکارانی زانکۆ، وەك نەوەی نوێ، شێوازی نوێی ئاینداری خۆیان دادەهێنن‌و ناچنە ژێر باری هەندێ شێوازی دینداری سەپاوی لەوەوپێشوو ترەوە.

دەرك نەکردنی ئەم قۆناغە راگوزەرییە لە ژیانی ئیسلامییەکاندا، کە لە بنەڕەتدا بەهۆی جوان نەخوێندنەوەی واقیعی ئێستاو ئەو ئاماژانەی واقیعە نوێیە چاوەڕوانکراوە کە لەگەڵ خۆیدا هەڵی گرتووە، دەبێتە سەرچاوەی چەندین جۆر کێشەو کێشمەکێش لەنێو رەوتی ئیسلامیدا. ئەو دۆخەش لە نێو هەندێ لایەنی ئیسلامیدا سەری لەبەر

---

[1] هشام جعفر.. أحمد عبدالله، حول الشمول في حركة الأسلام السياسي في الشرق الأوسط،لەچوارچێوەی کتێبی (الأسلاميون و المسألة السياسة)، ص٢٣٨-٢٣٩.

یەکهەڵوەشانەوەی  نامەنهەجی و ناڕێکخراوەو دەردەچێت، واتە ئەگەر ئیسلامییەکان خۆیان بە وردی گۆڕانکارییەکان نەخوێننەوەو و بڕیاری هۆشیارانەی خۆنوێکردنەوەو سەربەخۆکردنی کایەکانو وازهێنان لە هەندێ لە شێوازەکانی کارکردنیان نەدەن، بە حوکمی پێگەیشتنی ئەم ئەرکەی قۆناغەکەو تاسەر چاوەڕێ نەکردنی ئەو بەشە لە کادرو ئەندامان  کە دەکەونە بەر شەپۆلێکی نوێبوونەوەی هۆشیاریو چی تر توانای درێژەدان بە ژیانی سیاسیان لەنێو ڕەوتەکە نامێنێت. دەکەونە بیری دەستپێشخەری و تێپەڕاندنی ئەو بەشە لە سەرکردایەتیو کادرەکانی ڕەوتەکە، کە توانای خۆنوێکردنەوەیان نییە، یاخود جۆرەها وەهم دەخەنە پێش چاوی خۆیان و دەروبەرو ئەوەی پێویستە ئەنجامی بدەن، ئەنجامی نادەن، لە هەمانکاتیشدا دەخوازن بە خواستو بە گوێرەی جیهانبینی و شێوازە بەسەرچووەکانی ئەوان، ڕەوتەکە بەڕێوە ببرێت! کە هەروەك وتمان ئەو دۆخە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی چەندین کێشمەکێشو ناکۆکیو کێشەی جۆراوجۆر، لەوانەش:

١.  **جیاوازی لە نێوان  چەسپاو (پوابت)ەکانی ڕەوتی ئیسلامیو چەسپاوو (پوابت)ەکانی کاری سیاسی** یاخود وەرچەرخان بەرەو کاری سیاسی کە قبوڵکردنی ڕیشەکانی گەمەی سیاسیو کارلێك لەگەڵیاندا دەخوازێت، واتە گۆڕانکارییەکان لە سەردەمی تێکەڵبوونی بەربڵاوی ئیسلامییەکان بە کاری سیاسیو بوون بە هێزێکی سیاسی گەورەو بەشێ لە سیستمی باو، تەنها پەیوەست نییە بە ئاڵوگۆڕی میکانیزمی کارکردنەوە، بەڵکو هەروەك لە پێشتریشدا ئاماژەمان پێکرد، بۆ ئەوەی

توانای لەسەرپێی خۆوەستانو پارێزگاری لە خۆکردنو گەورەبوونو گەشەکردنیان هەبێت، دەخوازێت ملکەچی ئالۆگۆڕێکی هەمەلایەنە، بەبێ ئەم ئالۆگۆڕە فیکرییە کە بە گشتی ئیسلامییەکان سەرەتا لەڕێی کاری سیاسی مەیدانییەوە، شێوازی رابردوو بەجێ دەهێڵن و نوێبوونەوەی سیاسی ناکەوێتە پێش هەنگاونانە سیاسییەکەوە، کە ئەوەش وادەکات هەندێ جار زیادەڕەوی لەخۆگونجاندنو گوێنەدان بە میکانیزمەکان بکەن و لە پراگماتیدا نوقم ببن[1]. ئەمە جگە لەوەی کە هەر هەنگاوێکی سیاسی هاوشانی نوێبوونەوەی فیکری نەبێت قابیلی پاشەکشەیە. ئەگەر (ثوابت)ەکان نوێ نەبنەوە، لەگەڵ (ثوابت)ەکانی کاری سیاسی جۆرەها کێشە دروست دەکەن، هەڵبەت لێرەدا دەبێت ئاماژە بەکێشەی نێو هەندێ لایەنی ئیسلامی بکرێت، کە ئەویش ئەوەیە گەرچی نوێبوونەوەکە لەسەر ئاستی دروشمو ئەدەبیاتو پرۆگرامی حیزبو تاڕادەیەك شێوازەکانی کارکردنیشدا هاتۆتە دی، کەچی بە هۆی قوڵنەبوونەوەی هۆشیاری نوێبوونەوەکە بۆ ئاستی نەست، ئامادە نەبوون بۆ رەخنەگرتن لە قۆناغی پێشوو دووفاقی مەنهەجی پەروەردەییەوە، کە رەمزە بۆ کولتوری جەماعەو ئیسلامی سیاسی، لەگەڵ پرۆگرام، کە ئاماژەیە بۆ ژیانی حیزبی، هەروەها بەهۆی تەقلیدی مانەوەی شێوازی هێنانی ئەندامو سنووورداری لەسەر ئاستی کولتورو گوتاری راگەیاندنو نوێبوونەوەی قوڵی رۆحیەتی ئیشکردن، وای

[1] سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٤٠-٢٤١.

کـردووە، کـە جـۆرێ لـە نیگـەرانی و بەیەکـەوە کۆکردنـەوەی هەنـدێ گوتارو سیمای دژ بەیەکی لێ بکەوێتەوەو، ڕەوتی نوێبوونەوە سـنوردار ببێت بەش بە حاڵی خۆم ئەم دۆخـە لـە یـەکگرتووی ئیـسلامی و دواتـر ئیسلامییەکانی تری کوردستاندا هەسـتپێدەکەم، کـە هێـشتا جـۆرێ لـە ترسیان لە نوێبوونەوەی هەمەلایەنە هەیە.

٢. **جیـاوازی ئامانجـەکان**، ڕوونـە ئەگـەر ئامـانجی بانگـەواز بەدەسـتهێنانی دڵـی خـەڵکو ئاینـدار کردنیـان بێـت، وە کـارکردن بێـت لەسەر ناسنامەو بوژاندنەوەی ئەخلاقی دینیو لایەنی ڕۆحـیو ڕەفتـارو ئـاداب، ئـەوا کـاری سیاسـی کـار لەسـەر بەدەسـتهێنانی ڕای هـاوڵاتی دەکاتو هەوڵی بەدەستهێنانی کورسیو دەسەڵاتو (امتیـان) دەدات تـا لەڕێی ئەوەوە بەرنامەیەك کـە هەڵمـەتی هەڵبژاردنەکانـدا خـستویەتییە ڕوو، جێبـەجێ بکـات، یـاخود لـە پێگـەی ئۆپۆزیـسیۆنەوە ڕەخنـە لـە سیاسەتی حکومەت بگرێت، بە واتایەکی تر (دەعوە) کار لەسەر بواری (عەقیـدە) و (عیبـادەت) (ئـەخلاق و بـەهاکان دەکـات)، لەکاتێکـدا سیاسەت بە شێوازێکی جیاوازتر کار لەسەر بەهاکان دەکـاتو ئامـانجی بەدیهێنانی بەرژەوەندی و چارەسـەرکردنی کێـشە سیاسـیو ئـابوری و کۆمەڵایەتییەکانی خەڵكو باشترکردنی ژیانی ئەم دنیایە.

واتە (دەعوە) بە پلەی یەکـەم کـار لەسـەر ئـاخیرەتی مـرۆڤ دەکـات گەرچی ڕەنگدانەوەی لەم دنیایەشدا هەبێت، بەڵام سیاسەت کار لەسەر ئەم دنیایەو ژیانی ئێـستا و (عاجـل)ی مرۆڤـەکان دەکـات، گەرچـی بـە ناڕاستەوخۆ بۆ ژیانی دواییشیان سوودی هەبێت.

کۆکردنەوەی ئەم ئامانجانەش لەچوارچێوەییەکی ڕێکخراودا کـارێکی ئاسـان نابێـت. چـونکە جۆرەهـا کێـشەی لێ دەکەوێتـەوە وەکـو: کـام ئامانجانە لە ریزبەندی پێشەوەی بایەخپێداندان بن ؟ هەر لەم رووەو لە سـەردەمی بـە سیاسـی بـوونی ئیـسلامییەکاندا دەبێـت ئـەو نموونـە حوکمڕانییەی بۆ کۆمەڵگەی دەخوازن، دەستنیشان بکەن. کە بە گشتی لەئێستادا دیموکراسییە. ئەوەش دەستبەرداربوون لە چەندین گوتـەزای فیکری ئیسلامی نوێ دەخوازێت. کاتـێ باسـی هاوسـەنگی نێوانیـشیان دەکرێت، بەشێکی دەبێت بە قسەی رووت، چونکە پێوەری وردمان لەو رووەوە نییە، هەشمانبێت جەبرەکانی کارکردنی سیاسیو ڕێکخراوەیـی هەندێکیان پشتگوێ دەخات. بەم جۆرەش بەشێ لـە تواناکـان بـەوەوە دەڕوات چۆن هاوسەنگی لە نێوان (دەعوە) و (سیاسەت)دا بکـەین، لـە کاتێکـدا بـە ئـەزموونی دەیـان ساڵەی خـۆم لـەنێو کـاری ڕێکخراوەیـی ئیسلامیدا پێم وایە بەدیهێنانی ئەو هاوسەنگییە نیمچە ئەستەمەو پـێ لەسـەر داگرتنـی مایـەی کـاتو وزە بـەفیڕۆدانو سـەرلەخۆ تێکدانـە، هەندێکی لەو ڕووەشەوە دەوترێتو دەکرێت، بۆ ڕازییکردنو لەخۆگرتن (اسـتیعاب)و تەنانـەت خاوکردنـەوەی رەوتـی نوێکردنـەوەو خۆبیناکردنەوەیە؟!.

٣. **جیاوازی لە میکانیزمەکاندا:** کاری سیاسی و دەعەوی لە ڕووی میکانیزمەکانیشەوە لێکجیاوازن، ئەگەر کاری دەعەوی پشت بە وەعـزو ئیرشادو وانەی تایبەتیو گـشتیو هاوشـێوەکانی ببەسـتێ، ئـەوا کـاری سیاسـی پـشت بـە هەڵوێـست دیـاریکردن، رەخنـەگرتن، چارەسـەر

پێشکەشکردن، کاری پەرلەمانیو حکومی، ناڕەزاییو ڕێپێوان، میدیاو هاوپەیمانێتی بەرەبەندیو جولانەوەی جەماوەر دەبەستێت. کۆکردنەوەی ئەم دوو میکانیزمەش گەر بە ڕواڵەت ئاسایی بێت، لە قولاییدا ئاسان نییە. خەڵکیش بە چاوی ئاسایی سەیری ناکاتو مامەڵەی لەگەڵدا ناکات. حیزبی سیاسی لەڕێی سیاسەتو هەڵوێستەکانییەوە خەڵك بۆ لای خۆی رادەکێشێ، نەك (دەعوە) و (پرسە)و هاوشێوەکانی، ئەو شتەی کە تاکو ئێستا ئیسلامییەکانی کوردستان بەگوێرەی پێویست بە هەندیان وەرنەگرتووە. تاکو ئەم ساتە وەختەشی لەگەڵدا بێت، دەگمەنن ئەو کەسانەی لە رووی قەناعەت بە ڕووە سیاسییەکەی پرۆژەی ئیسلامییەکان ببێتە ئەندامیان. کۆکردنەوەی میکانیزمی (دەعەوی)و (سیاسییەکان) لە چوارچێوەی حیزبدا جگە لەوەی جۆرێ لە دژبە یەکی دەردەخات، وە وادەکات هیچ کامیان وەك پێویست کاریگەر نەبنو توانای بەدیهێنانی ئامانجەکانیان نەبێت.. جۆرێ لە بێ میسداقییەتیش بۆ هێزەکان دروست دەکات.

وێنایەکیشیان لێ دەکێشێ کە هێشتا لە نێوان (تأویل)ی (کۆمەڵەیەکی دینی)و (حیزبێکی سیاسی)دا خۆیان یەکلایی نەکردۆتەوە. کە وەك بە کردەوە دەبینین بۆ ئیسلامییەکان بۆتە خاڵی لاوازی نەك بەهێز، تەنانەت وا دەکات کە نەك هەر نەتوانن ببنە جێگەی لەخۆگرتنی خەڵکانی تر، بەڵکو بەشێ لە وزەو تواناکانی نێو خۆشیان لە سۆنگەی ئەو واقیعو دۆخە ناجێگیرە، بڕوات.

٤. **جیاوازی له سەرمەشقدا:** یەکێ لەو کێشمەکێشەی لە قۆناغی ڕاگوزەری‌و تێکەڵاوبوونی ئیسلامییەکان بە کاری سیاسی مەدەنی دێتە کایەوە، مەسەلەی سەرمەشق بوونە، کە لە قۆناغی پێشتردا کەمتر هەستی پێ‌کراوە، چونکە ڕەوتەکە بە گشتی دەعەوی بووەو سەرکردەکانیشی وەك ئەمیرو داعی بە مانا دینییەکەی سەیریان کراوە بە گشتی ئەندامو ئەمیرەکان پێکەوە لە مزگەوتدا نوێژیان کردووەو چالاکییە ئاینی‌و ڕێکخراوەییەکانیان ئەنجامداوە و بەیەکەوە نانیان خواردووە. وەك یەك ریشیان هێشتۆتەوەو لە شێوازی ژیانکردندا لێکچوونێکی زۆر لە نێوانیاندا لە ئارادا بووە. لەکاتێکدا لەگەڵ پێنانە نێو قۆناغی بە سیاسی بوونەوە بە تێپەڕینی ڕۆژگار بەشی لەم چەمك‌و تێگەیشتنانە بەرەو کاڵبوونەوە دەچن، بە حوکمی ئەوەی سیاسەتکردن‌و بوون لە پێگەی سیاسییدا، گەر لە هەندێ ڕووشەوە بێت جۆرێکی تایبەت لە ژیانکردن لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت، بە مانایەکی تر بەشێ لە شێوازە ژیانە کۆنەکە، بەرهەمی قۆناغی زیندان‌و، ڕاوەدوونان‌و، دووری لە دام‌و دەزگا فەرمییەکان و تێکەڵ بوون بە ژیانی سیاسی بووە. واتە هێندەی شێوە ژیانێکی سەپاو بووە، بەو ئەندازە گوزارشتێکی سروشتی‌و زگماکی لە ئیسلام نەبووە. بەڵام ئەم گۆڕانکارییە لەنێو ڕەوتێکی پاشخان دەعەوی‌و هەڵگری ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ، هەروا بە ئاسانی قوت نادرێت‌و قبوڵ ناکرێت. هەر بەو جۆرەی بە واقیعی خۆمان تیایدا ژیاوین سکاڵای ئەوە دەست پێدەکات، کە سەرکردەکان سەرمەشق نەماون، لە نوێژی جەماعەت حازر نابن،

وەعز ناکەن، هەندێکیان ریش ناهێڵنەوە، بەڵگەی ئایەتو فەرموودە بۆ قسەکانیان ناهێننەوە، دنیاپەرستیان پێوە دیارە..هتد.

ئەم دۆخەش لە هەندێ کاتو شوێندا سەردەکێشێ بۆ هەستکردن بەوەی سیاسییەکان دووچاری جۆرێ لە لادان هاتوون، وازیان لە (ثوابت)ەکانی جەماعەت هێناوە! رێکخستن دەکەن بە پەیژەو بەسەریدا سەردەکەون بۆ دەستکەوتنی پلەو پایەی حکومی و ماددی؟!

بەش بە حاڵی خۆشم ئەم سکاڵاو رەخنانە لەگەڵ ئەوەی بەڕاستیان نازانم، لام پاساودراون، چونکە هێزێك بەبێ زەمینەسازیو نوێبوونەوەیەکی فیکریو رێکخراوەییو سەربەخۆیی کایەکانو دووبارە پێناسەکردنەوەی قۆناغو ئەركو رۆڵەکان، بە هەمان پاشخانو پێوەری کۆنەوە بچێتە ناو کاری سیاسییەوە، ئەو کاتە پەرلەمانتارو وەزیر بوون زۆر ئاساییە ببێتە فۆرمێکی لادانو هێمایەك بۆ دەستبەرداربوون لە ئەخلاقی ئیسلامیو پشتکردنە بیروباوەڕەکانی دوێنێ؟ چونکە گەر راستگۆبین ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ پرۆژەی هەڵکوتانە سەر دەسەڵاتو بەکارهێنانیەتیو جێگەی کاری سیاسی بەو جۆرەی ئێستا لە ئارادایە تێدا نابێتەوە، گەر رێگا بە پەراوێزێك لە کاری ئیسلامییەکان بدات، بە شێوەیەکی تەکتیکییە نەك ستراتیژ.

ئیسلامییەکان لە کوردستاندا دەردەسەریو تەنانەت لەکەداربوونیشیان لەم رووەوە تووش بوو، لە سۆنگەی جیاوازی سەرمەشق بوون لە هەردوو بازنەی دەعوە و سیاسەتدا، سەرمەشق

بوون له بازنەی دەعەویدا جۆرێ له دنیانەویستیو خۆدوورگرتن لەسەر پۆستو پلەو پایە و (امتیاز)ی شەخسی دەخوازێت ئامانجی بانگخواز هەروەك پێشەوا نەورەسی بۆی چووە بە پلەی یەکەم بەستنەوەی خەڵکە بە ئیمان و خوداو دواڕۆژەوە، نەك ململانێ و رقەبەری لەگەڵ دنیاخوازان. بانخوازی تێکەڵە بە میهرەبانیو نەرمیو هەق دۆستی[1].

هەروەها بانگخواز بۆ ئەوەی دڵسۆزیو پاکی دەروونی خۆی لە دەست نەدات، نابێت تێکەڵ بە کاری حیزبیو سیاسی راستەوخۆ ببێت، چونکە ئەو کاتە هەوڵدەدات هەموو شتێكو لەوانەش بانگەوازەکەی بخاتە خزمەتی ئەو لایەنەوە، لەکاتێکدا راستییەکانی ئیمان و خزمەتکردنە پیرۆزەکان دژی ئەوەن بکرێن بە ئامرازی هیچ شتێكو دەبێت تەنهاو تەنها بۆ رەزامەندی خودا ئەنجام بدرێن. لایەنگیری بانگخواز وای لێ دەکات نەتوانێ هەموو کاتو تواناکانی بە بانگەوازەکەی ببەخشێت، هەروەها دەیخاتە بەر مەترسی لە ستەمو ناتەواوی لایەنەکەی[2].

بۆیە بانگخواز دەبێت سەرمەشقێکی رۆحی و ئەخلاقی بێت، خەڵکی سوودی لێ وەربگرن بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان، لەلای پشوویەك بدەن، کاتێك شەپۆلەکانی ژیان شەکەتو بێزاریان دەکات، لەکاتێکدا سەرمەشقی لە کاری سیاسییدا جورئەتو جوان ئیدارەکردنی ململانێو

[1] خديجة النبراوي، دور كليات رئاسل النور في يقضة الأمة، الطبعة الأولى، مطبعة المدني، القاهرة، ١٩٩٨، ل٢٦٨.

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧٠-٢٧٣.

چاونەترسیو گەندەڵ نەبوونو عەقڵی ئیداریو توانای چارەسەرکردنی کێشەکانو گەشەپێدانی تواناکان و وڵات دەخوازێت. ململانێ لەسەر کورسیو قورساییو دەنگو (امتیاز) بەشێکە لە دەرهاویشتەکانی و بە لەکە دانانرێت. مادام لە گەندەڵییەوە نەگلێتو بەرژەوەندییە تاکەکەسیو گروپییەکان نەخاتە پێش بەرژەوەندی گشتییەوە. سیاسی بە حوکمی کارەکەی دەبێت رەچاوی کۆمەڵێ شێوازی ئیشکردنو پرۆتۆکۆڵو رێو رەسمی فەرمی بێت، بۆنموونە تۆقەکردنێکی لەگەڵ رەگەزی بەرامبەر، لای ئەو مەسەلەیەکی پرۆتۆکۆلی، یاخود رۆتینی رووتەو، بیر لەو ئاماژانە ناکاتەوە، کە بۆ تاکێکی سادە باس دەکرێت.

٥. **رەهایی بوونی بانگەوازو رێژەیی بوونی سیاسەت:** هەندێ هێزی ئیسلامی کاتێ دەچێتە نێو کایەی سیاسییەوە، تەرحە دەعەویو ئیسلامییەکە بە پاڵ یەکەوە پارێزگاری لێ دەکات، بێ ئاگا لەوەی کە هەر یەکێکیان داواکاریو مەرجی خۆی هەیە، چونکە لە دوو سروشتی جیاوازن. بانگەواز لەگەڵ (مطلق)دا مامەڵە دەکات، سیاسەت لەگەڵ گۆڕاوەکانی رۆژ، کە زوو زوو گۆڕانکارییان بەسەردا دێت. لە سیاسەتدا رەوتی ئیسلامی لە مەرجەعیەتێکی فیکریو بنەمای گشتیو بانگەوازەوە، دەگۆڕێت بۆ واقیعو دەوڵەتو پیادەکردنو دەستو پەنجە نەرمکردن لەگەڵ مەسەلە کردەییەکانی وەکو پەرەپێدانی ئابووریو بەڕێوەبردنی دامو دەزگاکانی حکومەت، کە ئەوەش دووبارە

پێناسەکردنەوەی (ئیسلامی) و (ئیسلامی بوون) بە دوای خۆیدا دەهێنێت[1].

(راشد غەننوشی) لە دیدارێکیدا، تێکەڵبوونی بانگەوازو کاری سیاسی دەبەستێتەوە بە ناچارییەکانی دۆخی سایەی دیکتاتۆریەتو نەبوونی دەرفەتی کاری سیاسییەوە.

لە میانەی وەڵامی پرسیارێکدا دەربارەی بڕیاری راگەیاندنی (نەهزە) وەك حیزبێکی سیاسیو خۆ دوورخستنەوەی لە ئەرکە دەعەویو ئاینییە رووتەکان دەڵێت: (دوای شۆڕشی سیاسەتکردن، دەرەتانی بۆ پەیدابوو یاخود (حەڵاڵ) بوو. لە سەردەمی دیکتاتۆریەتدا سیاسەت لە پشت پەردەی (حقوقی) و سەندیکایی و دینییەوە ئەنجام دەدرا، ئێستا پاساوی ئەوە نەماوە سیاسەت لەژێر پەردەی هیچ چالاکییەکی تردا بکرێتو ئەنجام بدرێت و بکرێت. ئەوەی کاری سەندیکایی دەوێت دەتوانێت بچێت لەڕێی سەندیکاکانەوە بیکات، ئەوەی بایەخ بە کاری ئاینی دەدات دەتوانێت رێکخراوو کۆمەڵەی ئاینی دروست بکات، یاخود بە سیفەتی بانگخوازو وتاربێژ کار بکاتو خزمەت بکات. لەسەردەمی ئازادی کاری سیاسیو دیموکراسیدا پێویستی بە حیزبی هەمەلایەنە (شمولی) نەماوە[2].

---

[1] هشام جعفر.. أحمد عبدالله، حول الشمول في حركة الأسلام السياسي في الشرق الأوسط،لەچوارچێوەی کتێبی (الأسلاميون و المسألة السياسة)، لا٢٤٤-٢٤٥.

[2] راشد غەننوشی، چاوپێکەوتنی ( BBC.Arabik) ٢٠١٦/١٢/١٦

٦. **کێشەی ناڕوونی و لێڵی فیکریی:** ئەم کێشەیەش بە یەکێك لە کێشەکانی ڕەوتی ئیسلامی دادەنرێت. بەیەکەوەبوونی بانگەوازو سیاسەتیش لەپاڵ یەکدا لە چوارچێوەی یەك ڕێکخراودا یەکێ لە دەرهاویشتەکانییەتی، بەڵکو هەر لە سەرەتاوە هۆکارێکی گرنگی لێڵییە فیکرییەکەیەتی. ئەم حاڵەتە هەندێ جار وادەکات چەسپاو ببێتە گۆڕاوو، گۆڕاویش بە چەسپاو! هەر ئەمەش وای کردووە گۆڕانکاری لەنێو ئیسلامییەکاندا شێوەی هەڵکشان‌و داکشان بە خۆوە بگرێت.

ڕەوتی ئیسلامی لە سایەی نەبوونی دیدێکی ڕۆشندا وادەکات نەتوانێت وێنایەکی روون لە خۆی نیشان بدات. هەندێ جاریش گوتارو ڕەفتاری دژ بە یەکی لێ دەربکەوێت، واقیع خستیەڕوو کە کاری سیاسی ڕێگای بەدیهێنانی دروشمە مێژووییەکەی ڕەوتی ئیسلامی نییە کە (دەوڵەتی ئیسلامی) و (گێڕانەوەی حوکمڕانی ڕاستەقینەی ئیسلام) بوو، هەروەك لە ئەدەبیاتی ڕەوتەکەدا هاتووە، ئەوەی ئێستاش پێویستییەکی دووبارە بیرکردنەوەیە لە دەوڵەت لە هەردوو ئاستی تیۆری‌و کردارییدا، وە لە مەودای نێوخۆیی و ناوچەیی‌و جیهانیدا، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە دووبارە خستنەوە گۆڕی کێشەی (پێگەی سیاسەت لە پرۆژەی ئیسلامیدا) پەیوەستە بە هەل‌و مەرج‌و دۆخێکی بابەتی‌و واقیعەوە[1].

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤٦-٢٤٩.

ڕەوتــی ئیــسلامی بــۆ ئــەوەی ببێتــە خــاوەنی دیــدێکی ڕۆشــنو چوارچێوەداری سیاسیو فیکری، دەبێت مەرجەعیەت و مۆدێلە فیکری و سیاسـییە ئیـسلامییە تەقلیدییەکـە تێپـەڕێنێت، کـە لەسـەر بناغـەی ڕەوایـەتی ئـاین بـۆ سیاسـەتو هەمەلایەنـە بـوونی ئیـسلامو ڕەوتو دەوڵەتی ئیسلامی داڕێـژراوە. لەهەمانکاتـدا بناغـەی فیکـرو مـۆدێلێکی نوێ دابڕێژێت، پێشمەرجێکی هەنگاونانێکی لـەو جـۆرەش ڕزگـارکردنی فیکری ئیسلامییە لەو سنورداریو بازنـە داخـراوەی تێکـەڵی بانگـەوازو سیاسەت بۆی خولقاندووە.

٧. **کێشەی هەڵسەنگاندن**: یەکێ لەو کێشانەی تێکەڵاوی بانگەوازو سیاسەت بۆ هێزێك دروستی دەکات، مەسەلەی هەڵسەنگاندنی (أداء)ی لێپرسـراوانو کاریگـەری سیاسـەتەکان و دروسـتی بڕیارەکـانو ئاسـتی وەدیهـاتنی ئامانجـەکانو بەرهەمدارییـە. چـونکە لـە سـۆنگە جیـاوازی ئامرازی بانگەوازو سیاسەت، پێوەری هەڵسەنگاندنیشیان جیاوازە.

بـە ئـەزموونی خۆمـان لـە نـاو ڕەوتـی ئیـسلامیدا هەسـت دەکـەین، زۆرجار هەوڵ دەدرێ شکستی سیاسـی بـە گـەورەکردنی دەسـتکەوتی دەعەوی پەردەپۆش بکرێت! لەکاتێکـدا کـە هێزێـك وەك حیـزب خـۆی خستەڕوو، شکستو پاشەکشەی سیاسی کاردەکاتە سەر ئاستی ڕۆحی. لەچوارچێوەی کاری سیاسیشدا دەستکەوتی دەعـەوی بەشـێکی باشـی بەو ئەندازە نییە دەخرێتە ڕوو.

لەڕوویەکی ترەوە سروشتی تێکەڵاوبوونەکـە وادەکـات سیاسـییەکان کە زۆرجار لە پشت پاشەکشەکانەوەن، لێپرسراوێتی لە ئەستۆ نـەگرن.

هەندێ جاریش لەبری ئەوەی لێکدانەوەی سیاسیو زانستی بۆ کێشە سیاسییەکانو لەوانەش پاشەکشەو گەڕانەوە بۆ داوەکان بکەن، ڕاڤەی ئاینیان بۆ دەکەن! وەك ئەوەی دەوترێت کە تاقیکردنەوەی خوایە، یاخود ئەوەی ڕوویداوە سزای خوایە لەسەر ئەوەی ئیمانمان لاواز بووە، یاخود وەکو جاران نوێژەکانمان گەرمو گوڕ نین و... هتد، یاخود دەوترێت بۆ ئێمە کورسی و دەنگو چوونە پێشەوە زۆر گرنگ نییە، بەڵکو ئەوەی گرنگە دەستگرتنە بە بیروباوەڕو ڕێبازەوە!

بەم جۆرە هەڵسەنگاندنو بەخۆداچوونەوەیەکی ڕاستەقینە نایەتە دی. بەڵکو لەبری ئەوە کولتوورو عەقڵیەتی پاساوهێنانەوە بۆ لاوازییەکانو دەرفەت لەدەستدانەکان پاڵ بەسەر بیرکردنەوەی سەرکردایەتیو کادرەکاندا دەکێشێ.

٨. **کێشەی دروستکردنی بڕیار:** تێکەڵاوی بانگەوازو سیاسەت وا دەکات کە کێشەی دروستبوونی بڕیار لەنێو ڕەوتی ئیسلامیدا بێتە کایەوە، چونکە لەژێر کاریگەری گۆڕانکارییەکانو خۆدووبارەکردنەوەی ڕەوتە ئیسلامییەکە، کۆمەڵێ لە سەرکردەو کادرەکان لەڕووی سیاسییەوە گەشە دەکەنو زۆرتر سیاسییانە بیردەکەنەوە، گۆڕانکاری بەسەر بۆچوونە ئیسلامییەکانیشیاندا دێت. لەکاتێکدا بەشەکەی تر لە سۆنگەی کەم خوێندنەوەو سنورداری ئاسۆی فیکری و پاشخانی ئایدۆلۆژیو کەم توانایيو خۆنوێنەکردنەوە. یان هەر هۆکارێکی ترەوە، گەرچی بەڕواڵەت لە چوارچێوەی دامەزراوەی نوێی ڕێکخراوەیدا کاردەکات، هەر لەچوارچێوەی بنەماو پێوەرە کۆنەکاندا بیردەکاتەوە.

هەنـدێ جـاریش وەك بەشــی لــەو دژبەیــەکیو (تنــاقض)ە فیکــری و کردارییەی تیایدا دەژی، زیاد لە پێویـست لەگـەڵ واقیـع خۆگونجێنــەرو پراگماتییە، چونکە ئەوەندەی ئەزموونی ئیشکردن پێمان دەڵێت رەوتی ئیسلامیو عەقڵیەتی سیاسـی دەعـەوی تێکـەڵ سـتراتیژی یەکـەمی بـۆ سیاسەت کـردن، خۆگونجاندنـە لەگـەڵ دەسـەڵاتی رۆژدا، دەسـەڵاتیش کاتێـك هەسـتی کـرد لــە سەرەپێـچکدا هەنـدێ سـنوری بەزانــدووە، چەپۆکێکی ئەمنی پیا دەکێشێو یاخود فشارێکی سیاسی لێ دەکات و دەیگێڕێتەوە بۆ قەوارە سروشتییەکەی خۆی.

لەڕاستیشدا پاشخانی دەعەوی بۆ بەڕێوەبردنو ئاراستەکردنی کـاری سیاسی، کێشەی زۆری لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە، چونکە لە هەر شوێنێ سـنورداری سیاسـی هــەبوو، هــەوڵ دەدات بـوونی خـۆی لـە بـوونێکی سیاسـییەوە بکـات بـە بـوونێکی دەعــەوی بـە رواڵــەت سیاسـی، گـەر ئامانجیش دەعوە بێت، ئەوا پێویستە سیاسەت کەشو هەوایەکی ئارامو دوور لە کێشمەکێشو ململانێی بۆ فەراهەم بکات، ئەوەش پێویستی بـە سـڕکردنی ململانێکـانو خۆگونجانـدن لەگـەڵ دەسـەڵاتو وازهێنـان لـە خەونی ریفۆرمی سیاسی هەیە. سەرەنجامیش پێداگرتن لەسەر بانگەواز لە چوارچێوەی کاری سیاسـی دا، نـەك هـەر نابێتـە سەرچـاوەی هێـزو پاراستنی مۆركو رەسەنایەتی رەوتەکە، بەڵکو لەڕووی زانـستییەوە بـە تێپەڕینی رۆژگـار راسـتگۆیی دەخاتـە ژێـر پرسـیارو پـەیامی خـۆی ون دەکاتو هاوڵاتیان بەرامبەری نائومێد دەبن، بە حوکمی ئـەوەی کاتێـك هێزێك بەشداری سیاسی دەکات، ئیتر هاوڵاتیان حـوکم بەسـەر (أداء)ی

سیاســـــیو دەســـــتکەوتەکانی لـــــەم رووەوە دەدەن، نـــــەك رووە دەعەوییەکەی، کە لە ئێستادا هەر لە بنەڕەتەوە پێویستی بە حیـزبو ڕێکخراوی سیاسی نەماوە.

بەکورتی بڕیاری سیاسی پاساوو داتاو راڤەی تایبەت بە خۆی هەیە. ئاراسـتەکردنی کـارێکی دەعـەویش بـە هـەمان شـێوە، تێکـەڵکردنیان دەبێتە هۆی جۆرێ لە سەرلێشێواوی.

٩. **ناهاوسـەنگی لـە هەڵوێـستی سیاسـییدا:** بـە ئـەزموونی کـاری سیاسیمان لـەناو رەوتـی ئیـسلامی ئـەوەمان بـۆ دەرکـەوتووە، کـە لـە سۆنگەی ناڕوونی دیدی سیاسیو ئەو ئاسـۆیەی پێویـستە رووەو ئـەوێ بـڕوات، وا دەکـات هەڵوێـستی سیاسـی تاڕادەیـەکی زۆر رەنگدانـەوەی ستراتیژێکی سیاسی بەرنامە بۆدارێژراوی لە پێشەوە دیاریکراو نـەبێت. هـــەروەها هەڵوێـــستو هـــەنگاوەکان لەچوارچـــێوەی ســـتراتیژێکی هەمەلایەنەدا یەکتری تەواو نەکەنو نەچنە خزمەتی یەکترەوە؟!.

هەڵوێستە سیاسییەکان لەسایەی نەبوونی سـتراتیژو دیـدێکی روونو دیـاریکراوی سیاســیو ئاسـۆکانی ئاینـدەدا، تاڕادەیــەکی زۆر دەبنــە کاردانەوە بۆ رەفتارو هەڵوێستو قسەکردنی بەرامبەر!.

ئەمەش وادەکات هەنـدێك جـار زۆر تونـدو هەنـدێ جـاریش زیـاد لـە پێویـست نـەرم بێـت. بەشـێ لـەم دۆخـەش پەیوەسـتە بـە جیـاوازی سروشتی هەریەك لە بانگـەوازو سیاسـەتو ناسیاسـی بـوونی پاشـخانی زۆرێ لە سەرکردە حیزبییەکان. دۆخێکـی لـەو جـۆرەش دەبێتـە هـۆی شـێواندنی کەسـێتی مەعنـەوی هێـزو رەوتـە ئیـسلامییە سیاسـییەکە.

چونکە هەندێ بەوە تۆمەتباری دەکەن، کە پاشکۆی ئەم هێزو ئەو هێزە، هەندێکی تریش پێیان وایە جۆری هەڵوێستەکانی نیشانەن بۆ ناهاوسەنگیو ناڕوونی سیاسەتەکان، ئەوەی جێگەی سەرنجە هاوڵاتیان هەڵوێستە توندەکانی هەندێ لەم هێزانەش بەرامبەر دەسەڵات زۆر بە هەند وەرناگرن. لەو سۆنگەوە کە بەشێکیان پێیان وایە، کاردانەوەیەکی کاتییەو ئاماژە نییە بە سیاسەتێکی روونو هەڵوێستێکی مەبدەئی. بەشێکی تریش بەوە لێکی دەدەنەوە کە ڕەنگدانەوەی ئازار گەیشتنە بە کادرو ئەندامو بەرژەوەندییەکانی حیزبەکەو ناچێتە خانەی لە سەرهەڵدانی بەرژەوندی گشتیو خەمی هاوڵاتیانەوە.

١٠. **دووفاقی لە پەروەردەو پێگەیاندنی ئەندامدا:** یەکێ لە کێشە حیزبی پاشخان دەعەوی (کە لای من مۆدێلێکە لە نێوان جەماعەتو حیزبدا) کە لە سۆنگەی تێکەڵاوبوونی کولتوری (جەماعەت) واتە بانگەوازو (حیزب) یاخود کاری سیاسی هاوچەرخەوە تووشی دەبێت، بەتایبەتیش لە حیزبە پاشخان (اخوان)ییەکاندا، دووفاقییە لە پێگەیاندن و ئاراستەکردنی ئەندامدا. هەر ئەمەش دەبێتە سەرچاوەی جۆرێك لە کێشەی فیکری لەنێو ریزەکانیدا، بوونی بەرنامەیەکی پەروەردەیی ئیسلامی بۆ پەروەردەکردنی ئەندام، لەسەر هەمان ریتمی مۆدێلی جەماعەتو ئیسلامی سیاسی بە هەندێ دەستکارییەوەو درێژەدان بە پەروەردەی دینی ئەندام. کە لە بنەڕەتدا کاری بانگەوازە نەك حیزب، لەگەڵ پرۆگرامی حیزبدا، وا دەکات، کێشەو دووفاقی لەسەر ئاستی ئەندامو ئاراستەکردندا بێتە کایەوە. لە دۆخێکی لەم

جۆرەشدا (پرۆگرام) نابێتـە چوارچـێوەی یەکـەم بـۆ فیکـرو ئاراسـتەی فیکریی ئەندامان، رەنگە هەندێکیان کۆنگرەی نوێی حیزب بێتو هێشتا پرۆگرامیـان نـەبینیبێ چ جـای بۆیـان راڤـەکرابێتو لەسـەری پـێ گەیەنرابن؟!. تەنانەت هەندێ جار ئەگەر بیرمەندو سیاسییەکی کراوەی ناو حیزبەکە لە داڕشتنی فیکرو گوتاری سیاسی خۆیدا قورسـایی خـۆی بخاتـە سـەر پرۆگـرام، لای بەشـێ لـە کـادرو ئەنـدامان بـە نـامۆ سـەیر دەکرێن!

ئەم دۆخەش جگە لەو دژ بەیەکییەی لە نێوان (پرۆگرام)و پەروەردە دینییەکەدا دروستی دەکات، دەبێتە هۆی جۆرێ لە یەکدابڕانی فیکـری نێوان سەرکردایەتیو کادری ناوەندیو بنکەی جەماوەری حیزبیش. بـە حـوکمی ئـەوەی بنکـە حیزبییەکـە بـە پلـەی یەکـەم لەسـەر بەرنامـە پەروەردەییەکە پەروەردە دەکرێت نەك پرۆگرامی حیزبەکە. ئەمەش وا دەکات، سەرێکی سیاسی و جەستەیەکی دەعوە بێتـە کایـەوە. هەنـدێ جـاریش ئـەو فـەزا دەعەوییـەی بنکـە حیزبییەکـە دژ بـە بانگەشـەکانی نوێبوونەوەو سەربەخۆکردنی کایەکان سوودی لێ وەربگیرێت. هـەروەها کارێ بکات کە ئەوان لە سۆنگەی بۆخوابوونـەوە لـە هـەموو دۆخەکانـدا پابەندی سیاسەتی سەرکرایەتی بنو زۆر نەچنە ناو وردەکاری سیاسیو متمانـەیان بـە سـەرکردایەتی بێـت بـە حـوکمی ئـەوەی کـە ئـەوەی سەرکردایەتی دەیکات ئەوان زۆر لێی تێناگەنو کاری ئەوانیش نییە زۆر قسەی لەسەر بکەن، چونکە کاری بنەڕەتی ئەوان بانگەوازە!.

١١. **نارِازییبوونی هەمووان و لەدەستدانی بەشێ لە تواناكان:** بە تێكەڵ مانەوەی هێزێكی ئیسلامی رەنگدانەوەی بەسەر كۆی چالاكییەكانیدا دەبێت، لە سەردەمی پسپۆڕیو جیابوونەوەی كایەو چالاكییەكانیش لای بەرامبەرەكان، نەك ناتوانێ سەرنجی دەرەوە رابكێشێ، بەڵكو توانای پارێزگارییكردن لە ناوخۆشی لاواز دەبێت. گەر نموونە بە كوردستانی خۆمان بێنینەوە، دەبینین هەر لەناوخۆی ئیسلامییەكانەوە تا دەگاتە جەماوەرێكی زۆر لە دەرەوەی ریزەكانیان، زۆر كەم لە راگەیاندنی ئیسلامییەكان رازین، راگەیاندنی ئیسلامی نە دەتوانێ مامۆستای ئاینی، بەتایبەتیش ئەوەی ئینتیمای سیاسی هەیە رازی بكات، نە جەماوەرەكەی تریش، نە ئیسلامییەكان رازی دەكاتو نە نائیسلامییەكان، لە ناوخۆشدا حیزبەكە نە دەتوانێ بانگخوازو وەفادارانی بە ئەدەبیاتی رەوتی ئیسلامی كۆن رازی بكات، نە ئەو سەركردەو كادرو ئەندامانەش لەڕووی فیكریو سیاسییەوە نوێبوونەوەو چاویان لە كرانەوەو كارایيو دەستپێشخەریەكی زۆرترە. هەندێ جاریش ئەمە دەبێتە سەرچاوەی بەدگومانی بەرامبەر یەكترو یەكدی تۆمەتباركردن.

لە فەزایەكیشدا كە ناتوانێ چاوەڕوانی كەس بە تەواوی بەدیبێنێ، بەشێ لە وزەو توانا فیكری و سیاسی و تەنانەت دەعەویەكەش ریزەكانی رێكخراوە سیاسییەكە بەجێ دەهێڵن، چونكە دوای ئارامگرتنی چەند ساڵێك نائومێد دەبن لەوەی ببێتەوە بەو چوارچێوەی ئەوان ئاواتی پێ دەخوازنو بە گونجاوی دەزانن بۆ وەگەڕخستنی

تواناكانیان، دەعەوییەكان نائومێد دەبن لەوەی رەوتەكە بچێتەوە سەر رێچكە مێژووییە رەسەنەكەی خۆیو لەو لادانە رزگاری ببێت كە بەبڕوای ئـەوان كـاری سیاسـیو سیاسـەتمەدارەكان بۆیـان دروسـت كـردووە. نوێخوازەكانیش نائومێد دەبن لـەوەی توانـای گۆڕانكـاری راسـتەقینەی هەبێتو بانگەوازو سیاسەت لەیەكدی جیا بكاتەوەو قۆناغێكی نوێی پـڕ ئومێد لە كارو تێكۆشانی خۆی دەست پێبكات.

**١٢. مـەرجی ئەنـدامێتیو كێـشەی نێـوان مەرجـەكانی بانگـەوازو پێداویستییەكانی كاری سیاسی جەماوەری:** مەرجەكانی ئەندامێتی لەو حیزبانەدا كە هێشتا كـاری دەعـەویو سیاسـی تیایانـدا بـەپاڵ یەكـەوە ماون، بەپێچەوانەی پەیڕەوە ناوخۆكانیانەوە، تێكەڵن بە مەرجی ئاینی، واتە مـەرجی دیـن بنوسـرێت یـاخود نەنوسـرێت، مـەرجی ئەندامێتییـە، تەنانەت مەرجە دینییەكانی ئەندامێتی لە كۆمەڵە سیاسییە دینییەكاندا، لـە مـەرجی ئیـسلام قورسـترو زۆرتـرن، هـەر بۆیـە بەشـێكی زۆر لـەو خەڵكانـەی موسـڵمانن و ئەركـە ئیـسلامییە گـشتییەكانیان جێبـەجێ دەكەن، لـە ناویانـدا جێگایـان نابێتـەوە! بـە مانایـەكی تـر بـۆ ئـەوەی موسڵمانێك لەناو رێكخراوێكی سیاسی ئیـسلامیدا جێگـای ببێتـەوە، كـە هێشتا فۆرمی ئیسلامی سیاسی تێنەپەڕاندووە، كە یەكێ لـە سـیماكانی بــە تێكــەڵ مانــەوەی كـاری بانگــەواز و سیاســییە لــە چوارچـێوەی رێكخراودا، دەبێـت لـە ئیـسلامی میللییـەوە بگوازرێتـەوە بـۆ ئیـسلامی سیاسی. واتە ئیسلامی وەك ئایدۆلۆژیایەكی سیاسی قبوڵ كردبێـت، لـە كۆمەڵێ رووشەوە پابەنـدی تـەواوی بـە ئەركـە ئاینییەكانـەوە هـەبێت،

لەوانەش جل‌و بەرگ‌و دروشمەکان‌و... ئەم جۆرە ڕێکخراوانەش ئەگەر لەکاتی قەیراندا بازاڕیان هەبێت، ئەوا لە دۆخی ئاسایی‌و کێبڕکێیان مەدەنیدا توانای کێبڕکێی زۆر سنوردار دەبێت، چونکە دەبێت بە ڕێکخراوی خەڵکانێکی دیاریکراوی ناو کۆمەڵگە. لە رووی ژیانی تایبەتی‌و کۆمەڵایەتیشەوە، تایپێکی ژیانکردنی جیاوازیان هەیەو خۆیان لە خەڵکی بە جیاواز دەبینن. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە جگە موسڵمانبوون پابەندیی ئایدۆلۆژیش مەرجی ئەندامێتییە، واتە هەر لەڕێگاوە هەموو ئەو ئافرەتانەی بالآپۆش نین (با نوێژخوێن‌و داوێن پاکیش بن)، هەروەها هەموو ئەوانەی ئەرکە ئاینییەکان یان هەندێکیان جێبەجێ ناکەن، هەر لە سەرەتاوە لە بازنەی بایەخی ئەم هێزانە دەکرێنە دەرەوە و بۆیان نییە ئەندام بن. ئەوانیش زۆر کەم نەبێت، ئەم جۆرە ڕێکخراوانە بە نوێنەری سیاسی خۆیان نازانن‌و متمانەو دەنگیان پێ نابەخشن، چونکە جگە لەوەی ناتوانن لە ناویاندا تێبکۆشن و هەست دەکەن لەسەر بناغەی هەندێ پرسی تایبەت بە بواری ژیانی تاکە کەسی پرسیاریان لەسەر دادەنێت، دەشترسێ لەوەی کە ئەگەر بگەنە دەسەڵات ئەو مۆدێلەی ئێستا لە چوارچێوەی حیزبدا پەیڕەوی دەکرێت، سبەی لە پێگەی دەسەڵاتەوە بەسەر کۆمەڵگەیدا بسەپێنن.

ئەم جۆرە کەسانە بۆ ڕێکخراوی ئیسلامی بابەتن بۆ بانگەواز نەك کەرەسەی کاری سیاسی، چونکە ڕێکخراوی ئیسلامی لەسەر بناغەی کۆبوونەوە بە دەوری پرۆژەیەکی سیاسی گشتی‌و سەرەتای هاوڵاتێتیدا دانەمەزراوە. لەکاتێکدا کاری سیاسی ئەو هەموو کۆت‌و بەندە قبوڵ

ناكات، هەروەها لۆژیكی تێدا نییە خەڵك لەسەر جۆری پۆشینی جلو بەرگو هەندێ ئەركی ئاینی ڕێگایان لێ بگیرێت ببنە ئەندام لە حیزبێكدا، چونكە كاری سیاسی دەنگی لە خەڵك دەوێت، نەك تەقوا، یاخود قەناعەتی دڵ، بۆ تێكۆشەری سیاسی ئەوە گرنگە كە لەكەیەكی ئەخلاقی وای بەدواوە نەبێت حیزبەكە ناشیرین بكات، گەندەڵ نەبێتو كارامەو دڵسۆز بێتو خەمی گشتی هەبێت، دیدێكی ئەخلاقییانەی بۆ سیاسەت هەبێت، بۆیە دەبێت دەرگای حیزبی سیاسی بۆ هەموو ئەو خەڵكانە كراوە بێت كە بڕوایان بە پرۆژە سیاسییەكەی هەیە، دەبێت نوێنەرایەتییكردنی لەسەر بناغەی بۆچوونی سیاسی بێت، نەك پابەندیو مەرجی ئاینی، پێشمان وانەبێت ئەگەر پەروەردە دینییە تەقلیدییەكە نەبێت، مانای وەلانانی ئیسلامو بایەخە گەورەكە بەبێ. وەك هێزێكی رۆحیو ئەخلاقی بەهایی گەورە لە پێگەیاندنی كادرو ئەندامانـدا، بەڵكو تەنها ئەوەندەیە دەبێت بە جۆرێكی تر تەوزیف بكرێتەوە و بەهاكانی بكرێت بە هەوێنی خەملاندنی پرۆژەی سیاسی ئیسلامییە نوێكانو نەفسبەرزیو گیانی عەدالەتخوازی ئەندامان.

ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە، سەبارەت بە حیزبە ئیسلامییە كوردستانییەكانی خۆشمان، لەكاتێكدا وازیان لە دروشمە كۆنە ئیسلامییەكانیان هێناوەو بوون بە بەشێ لە واقیعی سیاسی هەرێم، وە بە زمانێكی سیاسی نزیك لە زمانی هێزەكانی تر قسە دەكەن، هێشتا پێدادەگرن لە سەر بەمەرجگرتنی موسڵمانێتی عەیارە (٢٤) بۆ

ئەندامێتیو وازیان لە شێوازی (کسب الدعوی)یشی بۆ زیادکردنی ئەندام نەهێناوە.

ئەمەش هەمان بیرکردنەوەی بەشی لە هێزە شیوعییەکانە، ئەو بەڵگانەی ئەم هێزانەش بۆ پاساوی درێژەدان بەم دۆخە دەهێننەوە، بەڕای نووسەر لاوازو بێ بناغەیە، بەڵگەشە لەسەر ترسیان لە کرانەوەو بیرنەکردنەوەیان لە ئامانجی گەورەو قایلبوون بە پارێزگاری کردن لەوەی هەیانە! بەشێکیشی رەنگدانەوەی مانەوەی کۆتوبەندە فیکرییە پێشووەکانە، کە هێشتا لە نەستدا کار دەکەنو رێگا دەگرن لە نوێبوونەوەیەکی فیکریی قوڵو هەمەلایەنەو راستەقینەو پێنانە ناو قۆناغێکی تازەی هیوابەخشەوە. جیاکردنەوەی مەسەلەی دەعەویو سیاسییەکانیش لە یەکترو دووبارە بیناکردنەوەی هەردووکیان بە سەربەخۆیی، ئیسلامییەکان لە بەشی لەو کۆتوبەندو لاوازییانە رزگار دەکات، کە ئەم دۆخە بۆی دروستکردوون، کە لە هەندێ رووەوە پاشماوەکانی کاری ژێرزەمینیو تێکۆشانە بۆ دەوڵەتی ئیسلامی، نەك کارکردن لە چوارچێوەی یاساو سایەی دەوڵەتێکی مەدەنیو کێبڕکێی دیموکراسی، یاخود خەباتکردن لە پێناو بەدیهێنانیاندا. پێداگرتن لەسەر بەقورسی هێشتنەوەی مەرجەکانی ئەندامێتی، درێژەدانە بە کولتوری خۆجیاکردنەوە لە خەڵکی تر. ئەم جۆرە بیرکردنەوە کۆمەڵەیەکی ئیسلامی دێرینی وەکو کۆمەڵی ئیسلامی پاکستانی والێکردووە گەشە نەکاتو لە پەراوێزی ژیانی سیاسییدا بمێنێتەوە، سەرکردایەتی کۆمەڵە کە هەموو هەوڵەکانی چاکسازی بۆ سووککردنی

مەرجــــەکانی ئەنـــــدامێتی رەتکـــردەوە، بـــەبیانووی لەدەســـتدانی رەسەنایەتیو مۆرکی ئیسلامیو بوونی بە حیزبێکی جەماوەری وەکو حیزبەکانی تر! بۆ دوای نیو سەدە لە دامەزراندنی ژمارەی ئەندامەکانی لە (٦) هەزار کەس تێنەپەڕین. ئەو ژمارەش هی کێبڕکێی سیاسی نییە، هەربۆیە کۆمەڵەکە لە بازنەیەکی بۆشی چەقبەستوویی سیاسییدا هێشتەوە، هەڵبژاردەکانیش گەواهی ئەم راستییە دەدەن، ساڵی (١٩٨٨) کۆمەڵی ئیسلامی پاکستان (٨) کورسی و هەڵبژاردنەکانی (١٩٩٠) هەمان ژمارە، ساڵی (١٩٩٣) ژمارەی کورسییەکانیان دابەزی بۆ (٣) کورسی، ئەمەش وای کرد نەبێت بە هێزێکی خاوەن قورسایی حساب بۆکراو[١].

١٣. **جیاوازی لۆژیکی بانگەوازو سیاسەتو دەرهاویشتەکانی:** ئەم پرسەش رەنگدانەوەیەکی تری تێکەڵاوبوونی کاری دەعوەو سیاسییە، دەرکەوتەکانیشی لە دوو ئاستدایە:

١. پەروەردەی فیکری و سیاسی.

٢. کێشەی داعیو سیاسی لە نوێنەرایەتی کردندا.

بۆ نموونە ئەگەر بۆ خاڵی یەکەم گەندەڵی بە نموونە بێنینەوە، بانگەواز بەشێوەیەکی گشتی کار لەسەر ئەوە دەکات، موسڵمانو ئەندامی حیزبێکی ئیسلامی گەندەڵ نەبێت. چەند دەتوانێت ئەوە مەسەلەیەکی ترە چونکە هەموو جارێك سەرکەوتوو نابێو گەندەڵیش

---

[١] د. محمد المختار الشنقيطي، معايير النجاح التنظيمي و ثنائياته الكبرى، ضمن كتاب /الحركة الأسلامية رؤية نقدية، ل١٣٢-١٣٥.

تەنها بە پەروەردەی دینی چارەسەر نابێت، واتە لۆژیکی پەروەردەی ئاینیو بانگەواز لەسەر گەندەڵی نەکردنو دەستپاکی کار دەکات.

لەکاتێکدا لۆژیکی سیاسی جگە لەوە پێمان دەڵێت: تەنها ئەوەندە بەس نییە گەندەڵ نەبین، بەڵکو دەبێت بەشێکی زیندوو جیانەکراوەی خەبات دژی گەندەڵیش بین، دەبێت بە ڕووی گەندەڵکاراندا بچینەوەو جەماوەر هۆشیار بکەینەوەو یاسای پێویست دەربکەین، دەزگا چاودێرییەکان بەهێز بکەینو دادگا بێلایەنو کارا بکەینو...هتد. هەڵبەت لە خودی ئیسلامدا ئەو بەهاو هاندانانە زۆرن کە ئیش لەسەر ئەم رووە دەکەن. بەڵام (داعی) و (لۆژیك)ی دەعوە لە توانایاندا نییە، چالاکیان بکەنو وەریبگێڕنە سەر بەرنامەی کارو بیانکەن بە هەوێنی سیاسەتێکی ئیسلاحی رۆشنو چالاكو ئاسۆ روون. ئەوەش بە یەکێ لەو کەموکورتیانە دادەنرێت لە ناو بەشی لە ئیسلامییەکاندا هەیە و ـ سەرەڕای بوونی هەناسەو رۆحیەتێکی بەرچاوی دژە گەندەڵی بوون ـــ نەیانتوانیوە لە ڕووی پەروەردەو پێگەیاندنی سیاسیو سوودوەرگرتنی تەواو لە تەکنیکەکانی سیاسەتکردن خۆیان پێشبخەن، بەڵام زۆرێ لەو حیزبە پاشخان ئیسلامیانەی قۆناغی ئیسلامی سیاسیان تێپەڕاندووە، توانیویانە هەناسە ئیسلامییەکە بکەن بە هەوێنی پرۆژەیەکی چاکسازی نیشتمانی گەورەو لەو رێگایەشەوە چەندین خزمەت بە گەلو وڵاتەکانیان بکەن.

مەسەلەیەکی تریش کە جێی خۆیەتی لە پەیوەندی بەم پرسەوە لێرەدا ئاماژەی پێ بکەین ئەوەیە، کە جورئەتی سیاسی بۆ تێکۆشەری

ئیسلامی لـه دۆخێکـی ناتوندوتیـژدا بەشـێکی بەرچـاوی پەیوەسـتە بـە دووخاڵەوە:

(١) پێگەیاندن‌و پەروەردەی ئیسلامی.

(٢) بە سیاسییکردنی ململانێکان.

مەبەستمە بڵێم بە ئەزموونی کـارکردنی خـۆم گەیـشتوومەتە ئـەوەی کـە ئیـسلامی بـوون، لـە قۆنـاغی دەسـتبەرداربوون لـە دروشـم‌و داوا کۆنەکانیـدا (دەوڵـەتی ئیـسلامی، بـە ئیـسلامی کردنـەوەی کۆمەڵگـە، پیادەکردنی بە زۆری فیقهی ئیسلامی‌و گێڕانەوەی خەلافەتی ئیسلامی) هەندێ جار دەبێتە سەرچاوەی جۆرێك لە سـاردو سـڕی‌و لەشـداهێزانی سیاسی‌و لاوازی گیانی بەشـداریکردنی سیاسـی، بـەجۆرێك کـە بـۆ ئـەو ململانی و بۆنانەی مۆرکی ئـاینی رووتیـان هەیـە (لـە وێنـەی کاریکـاتێر دروستکردن لەسەر پێغەمبەر (د.خ))، یاخود هێرشی نووسەرێك بۆ سـەر پیرۆزییەکی ئیسلامی) دەتوانن هەزاران کەس بێننە سەر شەقام، بـەڵام بۆ مەسـەلەیەکی سیاسـی (کـە لـە جەوهـەردا پەیوەسـتە بـە بـەها بـاڵا ئیسلامییەکان‌و لەوانـەش دادپـەروەری) زۆر بـە زەحمـەت چـەند سـەد کەسێکیان بۆ کۆدەبێتەوە؟!

بەشێ لەمەش پەیوەندی بە پاشخانە فیکری‌و پـەروەردە دەعەوییـە کۆنەکـەوە هەیـە، کـە کۆمەڵگـەو جیهـانی بـۆ دووبـەرەی (ئیـسلامی و عەلمانی، رۆژهەڵات و رۆژئاوا، کوفرو ئیمـان) دابـەش دەکـرد، بۆیـە بـۆ ئەوەی ئەندام چالاك بێتەوە دەبێت دووبـارە بینـای فیکـری بکرێتـەوە، سروشتی ململانێ نوێکانی بۆ پێناسـە بکرێتـەوە، بخرێتـە فەزایەکـەوە،

کە ململانێکان سیاسیین، ئیسلامییبوونیش ڕەنگدانەوەی نوێی هەیە و پێویستە بزانین چۆن بەیانی دەکەین‌و لە پرۆژەی سیاسی‌و نیشتمانی پڕ هیوادا دەیخەملێنین.

هەرچی خاڵی دووەمیشە کە لە ئێستادا بە کێشەیەکی ناو ئیسلامییەکانی کوردستان دادەنرێت، نوێنەرایەتییکردنی بانگەوازکار (داعی)یە بۆ مەسەلە سیاسییەکە، کە بەهۆی دۆخی بابەتی‌و ئاسۆ داخراوی‌و نوێنەبوونەوەی شێوازی کارکردنی خودی ئیسلامییەکان هاتۆتە کایەوە، ئیسلامییەکان لە ئێستادا لە کاتی هەڵبژاردنەکاندا، پەنا دەبەنە بەر پاڵاوتنی هەندێ لە (داعی)یەکان، کە راگەیاندن گەورەی کردوون، ئەمەش بە ئەزموون وا دەکات زۆرینەی دەنگەکان بۆ خۆیان بەدەست بێنن کە ئەوەش نیشانەی ناکامڵی هۆشیاری سیاسی‌و هەڵەبوونی گوتاری ئیسلامییەکان و ناسیاسییبوونی بەشێ لە ڕێکخستن و جەماوەرەکەیانە.

ئەم واقیعەش چەند دەرهاویشتەیەکی لێ دەکەوێتەوە:

١. کۆتایی یاخود نیمچە کۆتایی هاتنی بانگەوازکار، چونکە جارێکی تر خەڵکی بە ڕۆحیەتی پێش خۆکاندیدکردن گوێیان لێ ناگیرێتەوەو وەك ڕەمزی دەعەوی نامێنن.

٢. بە گشتی کەم توانایی بانگەوازکار لە نوێنەرایەتییکردنی سیاسییدا، چونکە لە بنەڕەتدا پێکهاتەی فیکری‌و دەروونی‌و تەنانەت بۆ هەندێکیان ڕۆشنبیریشیان هی کاری سیاسی نییە (هەڵبەت ئەمە بۆ هەندێ کادری تری ئیسلامیش ڕاستە کە لە ڕووی فیکری‌و

ڕۆشنبیرییەوە بە گوێرەی پێویست خۆی نوێ نەکردۆتەوە) بوونی نموونەیەکی پێچەوانە لێرەو لەوێ ئەم ڕێسایە بەتاڵ ناکاتەوەو هەڵیناوەشێنێتەوە.

٣. شکاندن‌و بچوککردنەوەی بەشێ لە سیاسییەکانی ناو ڕێکخراوەکان.

٤. ناردنی پەیامێکی هەڵە کە ئەویش ئەوەیە، (داعی)یەکان دەنگ دەهێنن‌و سیاسییەکان نایهێنن، لەکاتێکدا ئیسلامییەکان دەنگێکی دیاریکراوی نیمچە چەسپاویان هەیەو پالاوتنی ئەوان چەند هەزار دەنگێ زیاتر کەم‌و زیاد ناکات.

٥. وێناکردنی ئیسلامییەکان وەك هێزێکی دینی داخراو و ناسیاسیی، کە ناتوانن بە شێوازە ئاساییەکان، سیاسەت بکەن‌و دەنگی جەماوەر بەدەست بێنن‌و هەموو قورساییەکیان لەسەر (داعی)و سۆزی ئاینداری بەشی لە خەڵکە، نەك هەڵوێست‌و پرۆژە سیاسییەکانیان؟!

هەڵبەت ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە هەندی کەسێتی ئیسلامی زانستی (ناداعی) نەپاڵێورێت، بەڵام بە بڕوای من پاڵاوتنی بانگەوازکار و پەروەرشیاری دینی دەبێت بە وێنەی جولانەوەی یەکتاپەرستی‌و چاکسازی مەغریبی (حركة التوحيد والأصلاح) قەدەغە بکرێت. ئەوان هەموو ئەوانەی لە بواری پەروەردەی ئاینی‌و وەعزو ئیرشاد کاردەکەن، ناهێڵن خۆ بۆ هیچ هەڵبژاردنێك کاندید بکەن بۆ پاراستنی سەربەخۆیی کاری (جەماعەت) و (حیزب) لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە

پارێزگارییکردن له ناوبانگو کاریگەری بانگەوازو کارو دوورخستنەوەی له ململانێ و (امتیاز)ی سیاسیو نەشێواندنی ناوەرۆکەکەی.

له کۆتایی ئەم خاڵەشدا دەمەوێت سەرنج بۆ لای ئـەوە رابکێـشم کـە خودی پێغەمبەر (ﷺ) له هەر شوێنێکدا وەك سەرکردە هەڵسوکـەوتی کردبێتو کارەکانی له سیاسەتەوە نزیك بووبێت، له وێنـەی شـەڕەکان، بە گوێرەی لۆژیکی سیاسەت جوڵاوەتەوە، بـۆ نموونـە لـە لەشـکرەکەی پێغەمبەردا کاتێك بەرەو (ئوحود) رۆیشتن سەدان دووڕووی تێدابوو، كه له نیوەی رێگەدا بۆ روخاندنی لەشکرەکه پاشەکشەیان کردو گەڕانـەوە بـۆ مەدینـە، دواتـریش هێـزی بنـەڕەتی شـەرکەرەکان چـەکدارانی ئـەو خێڵانه بوو که تازە موسڵمان بووبوون، ئەمەش ئەوەمان پێ دەڵێت که کاری سیاسیو سـەربازی لـۆژیکی خـۆی هەیـە، نابێـت جێگـای هـەموو کەسـی تێـدا ببێتـەوە، دەبێـت جێگـای خـەڵکی گـشتی تێـدا ببێتـەوە، چـونکه نوخبـە دەتوانـێ سـەرکردایەتی شـەڕو سیاسـەت بکـاتو ئامانجەکانی دیاری بکات، بەڵام نه شەڕو نه سیاسەت بە دەستبژێرێکی پەروەردەکراو ناکرێت.

١٤. **کێـشەی رەسەنـسازیی (التأصـیل):** بەتێکـەڵ مانـەوەی بانگـەوازو سیاسـەتو دەسـتگرتن بـە فـۆرمی ئیـسلامی سیاسـیو ئایـدۆلۆژیای ئیـسلامی نوێـوە، کـارێ دەکـات مەسـەلە ئیـسلامی و ئاینییەکان ملکەچی پێداویستییە سیاسییەکان بن، چونکە کۆبوونەوەی مەسەلە ئاینیو سیاسییەکان بە دەست دەستەو سـەرکردایەتییەوە لـە کۆتاییدا هەروەك مێژوو سەلماندوویەتی دەبێتە هۆی زاڵبوونی مەسـەلە

سیاسییەکانو دەستبەسەراگرتنی مەسەلە ئاینییەکان لەلایەن گروپ و دەستە سیاسییەکانەوە[1]، هەروەها بە حوکمی فەزای دەعەوی ناو حیزبو ئەو وێنەی بۆ دەرەوە و بەشێ لە کۆمەڵگە دەیخاتە ڕوو، سەرکردەکان هەندێ جار ناچار دەبن بۆ هەنگاوەکانیان پاساوی ئیسلامی بهێننەوە و بە بەڵگەی ئاینی پشت راستی هەنگاوەکانیان بکەنەوە! یاخود لانی کەم وەك ئاماژەمان پێکرد بەرەنجامەکانیان ئاینیانە هەڵسەنگێننو خۆیان لە بەشێ لەو لێپرسراوێتییەی روویان تێدەکات بدزنەوە، هەندێ جاریش (ئاین) و چەمکە ئاینییەکان (نەك بەها باڵاکان) دەبرێتە نێو ململانێ سیاسییەکانەوە، کە سەرلەبەری ئەو دۆخە لەگەڵ رۆڵو وەزیفە و هەیبەتی ئیسلامیدا وەك ئاین ناگونجێت، رۆڵی ئاین دەکات بە رۆڵێکی پاساودەری سیاسی! کە بەداخەوە نمونەی زاڵی پەیوەندی نێوان ئاینو سیاسەت بووە لە مێژووی ئیسلامیدا. هەر ئەوەش وای کردووە زاناو پێشەوا هەرە دیارەکان، رووبەڕووی بووەستنەوە، یاخود لانی کەم رەوایەتی پێ نەدەنو دووچاری زیندانو ئازارو ئەشکەنجەدان ببنەوە[2]. بمانەوێ و نەمانەوێ، کاتێ بانگەوازو سیاسەت تێکەڵاو دەبێت، لە قۆناغەکانی دواتردا کە

---

[1] الدکتور عبدالرزاق أحمد السنهوري، فقه الخلافة و تطورها، ترجمة د.نادیة عبدالرزاق السنهوري، الهیئة المصریة العامة للکتاب، ۱۹۹۳. ل۵۷۰.

[2] زۆرێ لە زانایان، لەوانەش، (ابو حنیفة، مالك، شافعي، ابن تیمیة) لەسەر بیروڕاکانیانو هەڵوێستیان بەرامبەر بەشێ لە سیاسەتی خەلیفەو سوڵتانەکاندا خراونەتە زیندانەوە و ئەشکەنجە دراون.

ئیسلامییەکان زیاتر دەچنە ناو سیاسەتەوە، زۆر لەخۆکردن دێتە پێشەوە، واتە بەزۆر گونجاندنی هەندێ حوکمو دەق، لەگەڵ هەڵوێستی سیاسییدا، کە لە جەوهەردا ناگونجێن، ئەم زۆر لەخۆکردنو نەگونجانە لەو واقیعانەدا زۆرتر زەق دەبێتەوە، کە هێزێکی ئیسلامی پێویستی بە خۆگونجاندنی نیمچە بەردەوامە لەگەڵ واقیعەکەدا.

هەر ئەم بیرۆکەی (تأصیل)ە لە ڕوویەکی ترەوە وادەکات بزاڤی چاکسازیو خۆنوێکردنەوەی فیکری حەرەکیی ئیسلامی بەگوێرەی پێویست گەشە نەکاتو هەمیشە ترسی لەدەستدانی رەسەنایەتی هەبێت! یاخود هەندێ جار، بکرێتە بەربەست لەبەردەم جوڵانەوەی خۆنوێکردنەوەی فیکریو سیاسییدا، لەکاتێکدا (تأصیل)ی کاری سیاسی بە ئەحکامی (فیقهی) و (جزء)ی ناکرێت، بەڵکو پەیوەستە بە بەهاو مەبەستە باڵاکانو بوونو نەبوونی بەرژەوەندی ڕەوا و چاکەی گشتییەوە، وە بواری سیاسی مامەڵە لەگەڵ واقیعی خەڵك و بژاردەکانیاندا دەکات گەرچی لەگەڵ حوکمێکی شەرعیشدا ڕێکنەیەتەوە، لەکاتێکدا بانگەوازکار وا ناکات.. سیاسەت، یانی جیاوازی گفتوگۆو مشتومڕو دواتر بڕیاردان بەو جۆرەی بەرژەوەندییەکانی خەڵك دەیخوازێت[1]. ئەوەش وادەکات کە (تأصیل)ی سیاسەت بە خودی سیاسەت بکرێت، جگە لە ئاستی بەها باڵاکان کە سیاسەتێکی ئەخلاقی دەبێت، پابەند بێت پێیانەوە. لەوانەش بەهای دادپەروەریو هەقو

[1] الفصل بين الدعوي و السياسة ( ٤/٢) نفهوم الفصل و مشروعيته، dazat.com I
٢٠١٦/٦/٧

ئیسلاح.. هتد، نەك (ئاین) و بانگەواز بكرێتە پاشكۆو پاساودەری و بە گۆڕینو هەڵكشانو داكشانو بڕیارو سازشەكان، ئەمیش لە بیری بەڵگەداتاشینو رەوایەتی پێداندا بێت! بەتایبەتیش كاتێك ئیسلامی تۆمەتبار بكرێت كە سیاسەتێكی نائیسلامی پەیڕەو دەكات.

١٥. **كێشەی توندڕەوی**: لەگەڵ ئەوەی كە هەندێ لە هێزە ئیسلامییەكان توانیویانە پابەندی خۆیان بە پەنا نەبردنە بەر تەندوتیژی بخەنە روو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، راستییەك هەیە كە ئەویش ئەوەیە توندوتیژی و توندڕەوی بە ئیسلام پاساودراو، لەڕوویەكەوە بەرهەمی تێكەڵكردنی نادروستی ئاینو سیاسەتو بانگەوازو كاری حیزبییە، بەجۆرێك كە لەچوارچێوەی ئیسلامی میللییدا زۆر كەم نەبێت هەست بەم دیاردەیە ناكرێت، ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێش سەرلەنوێ كاری لەسەر دووبارە بوژاندنەوەی چەمكی (جیهاد) بە ناوەرۆكە (فیقهی)یە كۆنەكەیەوە كردو بانگەشەی بۆ دووبارە بیناكردنەوەی دەوڵەتی ئیسلامیو ئیمپراتۆریەتی لەدەستچوو كردەوە، دۆخێكی لەوجۆرەش كاتێك لەگەڵ ستەمكاری ناوخۆییو ستراتیژی نێودەوڵەتی دژدا، بەرەو ڕووی یەكدی دەبنەوەو بەیەكدا دەدەن، دەرهاویشتەی خراپی لێ دەكەوێتەوە، پێشتر ئاماژەمان بە خراپ بەكارهێنانی چەمكی جیهاد لەچوارچێوەی ئەزموونی سودانی دا، كرد، كە چ زیانێكی لەدوای خۆی بەجێهێشتو چ كارەساتێكی بۆ ئەو وڵاتەو تەوژمە ئیسلامییەكەی بەدواوە بوو؟ سیاسەتكردن بە لۆژیكە هاوچەرخەكەیو لەڕێی ئامرازەكانی خۆیەوە، مامەڵەكردن لەگەڵ چەمكە ئیسلامییەكان لە

پێگەی حوکمڕانییەوە، لەو روانگەوە کە بەشێکی گرنگ لە ناسنامەی نیشتمانی پێکدەهێنن، نەك ئایدۆلۆژیای تەوژمێکی دیاریکراوی سیاسی ناو کۆمەڵ، وە دووبارە گێڕانەوەی ناوەرۆکە قورئانییە بۆ چەمکی (بانگەوان)و داڕنینی لە ئاماژە ئایدۆلۆژیا کۆنەکان، لەپاڵ جوان لەخۆگرتنی بەها دیموکراسییەکان، بەسەریەکەوە، تاڕادەیەکی زۆر سەرچاوەکانی توندڕەوی وشك دەکەن، لانی کەم لە چوارچێوەی بزاڤی ئیسلامی نوێدا، ئەوکات سەلەفیەت دەمێنێتەوە، کە دەکرێت بە هەمووان کاری لەسەر بکرێتو لەڕێی جێکردنەوەو هاندانو گونجاندنی لە کایەی سیاسەتدا ملکەچی گۆڕانکاری بکرێت، وە لە بەرەنجامی کۆتاییدا بە هەمان بەرەنجامی بزاڤە ئیسلامیو یەکەوە بێتە دەرێ، بەوەش سەقامگیریو گەشەکردن بۆ کۆمەڵگە موسڵمانەکان، گەشانەوە و پرشنگدانەوەی زیاتر بۆ ئیسلام و بەهاکانی، وەك سەرچاوەیەکی گەورەی رۆحی و ئەخلاقیو بەهایی، دەستەبەر ببێت.

هەروەك غەننوشیش دەڵێت: ئەزموونە ئیسلامییەکان لە حوکمدا، لە یەمەن، ئوردن، فەلەستین، سودان، عێراق، سۆماڵ، جەزائیر..هتد. بەگشتی سەرکەوتوو هاندەر نەبوون جگە لە ئەزموونی تورکی کە هەر لە بنەڕەتەوە خۆی بە ئیسلامی لە قەڵەم نەدا[1]. لەڕاستییدا ئێمە لە چوارچێوەی ئەزموونی بزاڤی ئیسلامی باو مۆدێلی تێکەڵکردنی بانگەواز و سیاسەتدا، هیچ نموونەیەکی مەدەنی حوکمڕانیمان نییە کە نەك بۆ

[1] عامر محموود/ چاوپێکەوتن لەگەڵ غەننوشی، الفجر نیوز، ٢٠٠٩/١٢/٢٥.

جیهان سەرنجڕاکێش بێت، بـەڵکو بـۆ موسـڵمانان و خـودی گەلەکەشـی هانـدەرو دڵخۆشـکەرو سەرمەشـق بێـت، چـونکە لـە دەرەوەی بـەهاو میکانیزمەکانی دیموکراسییەوە، زۆر قورسە هیچ هێزێکی ئیـسلامی لـەم سەردەمە ئاڵۆزەی دنیاو لە سایەی ئامرازە ترسناکەکانی کۆنترۆڵکردنی دەسەڵات لە دەوڵەتی نوێدا، توانای پێشکەشکردنی نموونەیەکی جوانو دڵخۆشکەری هەبێت، مۆدیلی تێکـەڵاوی بانگـەوازو سیاسـەتیش کـە لـە ئەدەبیاتی بزاڤی ئیسلامی نوێدا خۆی دەبینێتەوە و بەرجەستە دەبێت، کێـشەی لەگـەڵ دیموکراسـییدا هەیـە، بۆیـە پاسـاو هێنانـەوەکان بـۆ درێـژەدان بـەم فۆرمـەو خۆترسـاندنو سەرابخـستنە پـێش چـاوی شوێنکەوتووانی تەوژمی ئیسلامی بەناوی کۆمەڵگەو بارودۆخەوە، جگـە لـەکات بـەفیڕۆدانو زیـاتر پەراوێزخـستنی تەوژمەکـەو نائومێـدبوونی زیاتری نەوەی نوێ، ناچاربوون بە سازشی بێ پاساوو، خزمەتکردن بـە تەوژمی بەرامبەر، هیچی تری لێ سەوز نابێت، وە ئاماژەیە بە خولانەوە لە بازنەیەکی داخراوی فیکـریو بـێ ئاسـۆیی سیاسـیو دەسـتگرتن بـە گوتـاری مانـەوە، کـە لەگـەڵ ڕۆڵـی چـاوەڕوانکراوی ریفۆرمخوازانـەی تەوژمەکەدا ناگونجێت.

## مۆدیلەکانی دووبارە ڕێکخستنەوەی پەیوەندی نێوان بانگەوازو سیاسەت.. لەنێو تەوژمی ئیسلامییدا

سەرەتا دەبێت ئەوە وەبیر بێنینەوە کە کێشەی نێوان بانگەوازو سیاسەت، وەك دەرهاویشتەیەکی بەشداری سیاسی ئیسلامییە پاشخان دەعەوییەکان، لە بنەڕەتدا کێشەی برایان (اخوان)و کۆمەڵی ئیسلامی پاکستانو نموونەی حوکمڕانی ئیسلامی شیعەکانە. کە لەڕووی مێژووییەوە تاڕادەیەکی زۆر لەژێر کاریگەری فیکری (اخوان) و (مەودودی)دا بوونو توانیشیان ئامانجە بنەڕەتییەکەی ئەوان کە (دەوڵەتی ئیسلامی) بوو لە ئێراندا بهێننەدی. بەوەش ببێت بە ئەزموونێك بۆ هەڵسەنگاندنی بنەڕەتی بانگەشەو بیرۆکەکەی لە دنیای نوێدا.

واتە کێشەی هەموو دنیای ئیسلام نییە، گەرچی کێشەی نموونە زاڵەکەیەتی، بەڵام نموونەی وەك تورکیا و مالیزیامان هەیە، کە لە دەرەوەی ئەو مۆدێلەو بە حوکمی بارودۆخی تایبەتی کۆمەڵگە و وڵاتەکانیانەوە، ڕێچکەیەکی جیاوازی گەشەکردنیان بەخۆوە بینیوە، بیروڕا مەشرەب ئیسلامییەکانی دکتۆر مەهاتیر موحەممەد بنیاتنەری مالیزیای نوێو باوکە راستەقینە گەشەکردنەکەی، لای هەموو ئەوانە روونە کە بەدواداچوونیان بۆ گەشەکردنەکانی فیکری ئیسلامی نوێو واقیعی وڵاتانی ئیسلامی هەیە بیروڕا هاوچەرخو ئەزموونی رۆحە کراوەکەی ئەم رێبەرە و هاوڕێکانی توانی لە کۆمەڵگەیەکی فرە ئاینییدا جگە لەوەی گەشەکردنی زانستیو پێشکەوتنی راستەقینەی

تــەکنۆلۆژی‌و خواســتی خۆشــگوزەرانی بــۆ مالیزییــەکان بێنێتــە دی، هەروەها لە بنیاتنانی ئەزموونێکی پێکەوە ژیانی ئاینی‌و نەتەوەیی و سیاسیشدا تاڕادەیەکی زۆر سەرکەوتوو بێت.

بزاڤی مەشرەب ئیسلامی تورکیاش سەرەڕای کاریگەربوونی لە هەندێ رووەوە بە ئەدەبیاتی ئیسلامی نوێ، تاڕادەیەك لە دەرەوەی ئەو کێشەوە سەری هەڵداو گەشەی کرد، تەوژمی ئیسلامی تورکی دوای دەیان ساڵ لە ئامادەبوونی بانگەوازێکی ناحیزبی‌و پەیامەکانی نوور و هەندێ لە رێبازگە سۆفیگەریەکان، لە کۆتایی شەستەکاندا حیزبی خۆی پێکهێنا.

لە ئەزموونی تورکیدا سەرەتا بانگەوازێکی بە مانا بانگەوازو تاڕادەیەکی بەرچاو دوور لە سیاسەت (بەمانا حیزبییەکەی) دەستی پێکردن، واتە شتێ بە ناوی ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نوێ بوونی نەبوو، ریفۆرمەکانی سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی‌و سروشتی رژێمی کەمالی‌و کۆمەڵی تورکیش یارمەتیدەر نەبوون بۆ سەرهەڵدانی ئایدۆلۆژیایەکی لەو جۆرە، بۆیە کاتێك حیزب لەدایك دەبێت بە سروشتی لەدایك دەبێت، لەچوارچێوەی رەوایەتی دەوڵەتی نوێ‌و یاسا کارپێکراوەکان‌و لۆژیکی سیاسەت خۆی پێناسە دەکات‌و دەست بە کارو چالاکی دەکات.

بە واتایەکی تر لەم ئەزموونەدا (بانگەوان) یاخود (جەماعەت) حیزب دروست ناکات، بەڵکو بانگەواز زەمینە دەسازێنی‌و دوای ئەوە سیاسییە مەشرەب ئیسلامی‌و موحافیزکارەکان دێنە ناو کایەی سیاسەتەوە، بەڵام سەرەڕای ئەوە ئەم بزاڤە لە رەوتی گەشەکردنی خۆیدا،

بەتایبــەتیش دوای ســەرکەوتنی شۆڕشــی ئیــسلامیو بڵاوبوونــەوەی شەپۆلێکی ئیسلامخوازی فـراوان لـە ناوچـەکەدا، دووچـاری جـۆرێ لـە کێشەی خۆگونجاندنو یەکلایی نەبوونەوەی فیکریو سیاسی هات، هەر بۆیــە لــە ســاڵی (٢٠٠١)ەوە پــارتی دادو گەشــەپێدان تەنانــەت ئــەو فۆرمەشی جێهێشت، کە بە جۆرێ لـە جۆرەکـان کاریگـەری ئـەدەبیاتی ئیسلامی نوێی بەسەرەوە بوو، بەرەو قۆناغێکی تری کاری سیاسی بـێ کێشەتر و دەستکراوەترو بەهایی ترو هاوچەرختر.

هەرچی پەیوەندی بە ئەزموونی دنیای عەرەبیو ناوچـەکەوە هەیـە، مەسەلەکە جیاواز ترە، چونکە ئـەو بزاڤـە ئیـسلامییەی لـە بیـستەکانی سەدەی بیستەمدا سەری هەڵدا، تاڕادەیەکی زۆر کاردانەوە بوو بەرامبەر روخـانی سـەڵتەنەتی عوسمـانیو بانگەشـەی ئیـسلامێکی هەمەلایەنـەو ئایدۆلۆژیایــەکی ئیــسلامی ســەراپاگیری لەچوارچــێوەی کۆمــەڵو رێکخراوێکدا دەکرد، ئەمەش وایکرد هەر لە سـەرەتاوە کێـشەی لەگـەڵ دەوڵەتی نوێ، ناسیۆنالیزم، دیموکراسیو کاری حیزبیو سیاسی نوێ دا بۆ دروست ببێت، هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد، باڵادەسـتی فۆرمـە پۆلیـسی و سـەرکوتکەرە عەلمانییــە حوکمڕانــە نادیموکراسـییەکانو راوەدوونانی خوێنـاوی رۆڵـەکانی تـەوژمی ئیـسلامی بـۆ مـاوەی دەیـان ساڵ، هێندەی تر پرسی خۆنوێکردنەوەی فیکریو سیاسی ئاڵۆزتر کرد، بـە حـوکمی ئـەوەی نادیموکراسـی بـوونی دەسـەڵات دەرفـەتێکی لـەو جـۆرەی زۆر کـەمکردبۆوە، هەربۆیـە سـەرەتای وروژانـدنی پرسـیاری پەیوەندی نێوان (بانگەواز) و (سیاسـەت)، یـاخود بـە دەربڕینێکـی تـر

(جەماعــەت) و (حیــزب) دەگەڕێتــەوە بــۆ بەشــداریی (اخــوان) لــە هەڵبژاردنەکانی (١٩٨٤)ی میسر لەسەر لیستی حیزبی (وەفد)دا.

لەو سەروبەندەدا (عومەر تەلمەسانی) ڕێبەری گشتی برایان بیرۆکەی دامەزراندنی حیزبێکی خستە بەردەم (مەکتەبی ئیرشاد)ی گروپەکـەی، بـۆ ئــەوەی گوزارشــت لــە بــیرورِا سیاســییەکانیان بکــاتو لەســەر وەدەستهێنانی بەشـێ لـە کورسـییەکانی پەرلـەمانیش کێبڕکـێ بکـات، بەڵام ئەندامانی مەکتەبی ئیرشاد دژی بیرۆکەکە وەستانەوە، بە پاساوی ئــەوەی بیرۆکەیــەکی لــەو جــۆرە دەرچــوونە لــە فیکــری (بــەننا)ی دامەزرێنــەر، کــە هەڵوێــستێکی نــەرێنیو خراپــی بەرامبــەر حیــزبو حیزبایەتی هەبووە.

دوای کۆچی دوایی تەلمەسانی، جارێکی تر بیرۆکەکە لەگەڵ رابـەری گشتی نوێی برایان (محمد حامد نصر)دا تاوتوێ کرایەوە، بەڵام تا ساڵی (١٩٨٩) لـــەم رووەوە نـــەیانتوانی بگەنـــە چارەســـەرو بڕیـــارێکی یەکلاکەرەوە. لـەو سـاڵەدا واتـە (١٩٨٩) برایـان بڕیاریانـدا کـار لەسـەر دامەزراندنی حیزبێکی سیاسی بکەن، بەڵام بیرۆکەکە تا ساڵی (١٩٩٥)ی ویـست بـۆ ئـەوەی بـەجوانی و تـەواوەتی لایـان بخـەملێت، پرسـیاری گرنگیش لەو نێوەندەدا ئەوە بوو کە داخۆ (اخوان) ببێتە حیزب یـاخود حیزبێك دروست بکات وەك باڵی سیاسی و رووکاری سیاسی جەماعەت؟

ئەم بابەتە لەبـەر رێپێنـەدانی دەسـەڵاتدارانی میـسر بـە دامەزانـدنی حیزبێکی لەو جـۆرەو رێگرییـە یاسـاییەکان مایـەوە، تـا سـەرەنجام لـە

ساڵی (٢٠١١)دا (اخـوان) بـه كـردەوه حیزبـی بـۆ (جەماعـەت) دروسـت كرد[١].

بەسـەرنجدانیش لـه ئـەزموونو واقیعـی ئیـسلامییەكانی ناوچـەكه دەتـوانین بڵـێین زیـاد لـه فـۆرمو مۆدیلێكمـان بـۆ مامەڵـەكردن لەگـەڵ كێشەی بانگەوازو سیاسەت لەناو رەوتی ئیسلامیدا له بەردەستدایه كـه له خوارەوه به كورتی ئاماژەیان پێدەكەین:

(أ) بەیەكەوه گرێدانی هـەردووكیان لەچوارچـێوەی حیزبێكـدا واتـه (دەعوه) یاخود (جەماعـەت) لەچوارچـێوەی یاسـای حیزبەكانـدا خـۆی وەك قەوارەیەكی سیاسی رادەگەیەنێتو دەخوازێت كێشەكه بەو جۆره چارەسەر بكات بەبێ پەنابردنه بەر جیاكردنەوەیان.

نموونـەی ئـەم حیزبانـە: ئیـسلاحی یەمـەنی و نـەهزەی تونـسی و یەكگرتووی ئیسلامی كوردستان بـوون، بـەڵام ئـەزموون سـەلماندی كـه ئەم مۆدێلـه كێـشەكه چارەسـەر ناكـات، بـەڵكو بـۆ ماوەیـەك بێـدەنگی دەكـات، دواتـر سـەرهەڵدەداتەوەو دەبێتـه سەرچـاوەی گێروگرفـت بـۆ بانگەوازو سیاسـەتو كـۆی هێـزه سیاسـییەكه و تارادەیـەك دووچـاری جۆرێ له قەیرانی ناسنامه و رۆڵو پەیامو بەفیڕۆدانی تواناكان دەكات، هەربۆیه نەهزەی تونسی و ئیسلاحی یەمەنی دوای مـشتومڕێكی زۆری فیكریو رێكخراوەیی ناوخۆیی گەیـشتە بڕیـاری جیاكردنـەوەی لایەنـە دەعەوییەكه و خۆپێناسەكردنەوەیان وەك حیزبێكی سیاسی نیشتمانی،

---

[١] د. محمـد حبیـب/ الـدعوى و الـسیاسی، www.VeTogoTe.com.. سێـشەممە، ١٧/ یونیو/٢٠١٦

تەنها یەکگرتوو ماوە ئـەو بڕیـارە بـدات، یـەکگرتوو لـە ئێـستادا پـەنای بردۆتە بەر شێوازێك لە پـسپۆڕیی لـە چوارچـێوەی خـودی خۆیـدا، کـە بەبڕوای ئێمە ئەوەش تەنها لە یەککاتدا هەندێ سـوودی هەیـە، ئـەویش ئەوەیە حیزبەکە خرابێتە دۆخێکی راگوزەرییەوە بۆ گەیشتن بە بڕیـاری جیاکردنەوەو دووبارە بیناکردنەوەی کارە سیاسیو دەعەویەکە، بەدەر لـەوە دەبێتـە ئەڵقەیـەکی تـری خولانـەوە لـە بازنەیـەکی بـێ ئاسـۆ و لەدەستدانی دەرفەتەکانو سنوردارکردنی رۆڵەکان.

هەڵبەت لە چوارچێوەی ئەم مۆدێلەدا دەتوانرێت زیاد لە مۆدێلێکمان بۆ چارەسەری کێشەکە هەبێت، بەڵام سروشـتیترینو بـێ کێـشەترینیان بە بڕوای ئێمە ئەزموونی پارتی نەهزەیە، واتە بوون بە حیزبی سیاسـی و کارکردن لەسەر بناغەی هاوڵاتێتی یەکسانو لۆژیکی کاری هاوچەرخو وازهێنـانی پرسـی بانگـەواز بـۆ کۆمەڵگـەو کۆمـەڵی مـەدەنی، لـەبری پەنابردنە بەر دروستکردنی (جەماعـەت)ێکـی هاوتـەریب، چـونکە دوای ئەوەی لە سەرەتاوە (جەماعەت) حیزب دروست نەکات، دوایـی کـە بـۆ چەندین ساڵ بە یەکەوە بوون قورسە (جەماعەت) دروسـت ببێـت، (کـە من بڕوام بە جەماعەت هەر نییە بـەو جـۆرەی لـە هەنـدێ وڵاتـدا هەیـە) بۆیـە شـێوازی گونجـاو دروسـتکردنی تـۆڕێکی کۆمەڵـەکان (جمعیـات)و دامـەزراوەی جۆراوجـۆری دەعەوییـە لەچوارچـێوەی ئـەو دەرفەتانـەی کۆمەڵی مەدەنی لەمڕۆدا خستەویەتییە بەردەست.

(ب) نموونەی مانەوەی (جەماعەت)و دامەزراندنی حیزبێکـی رووکـار (واجهة) کە ڕۆڵی بـاڵی سیاسـی ببینێـتو لـەژێر هـەژموونی جەماعەتـدا

بمێنێتەوە، نموونەی ئەم مۆدێلەش (عێراق، ئوردن، میسر)ە، لەڕاستیدا ئەم مۆدێلە بە کردەوە سەلماوە، شکستخواردووە، چونکە سەرلێشێوان و دووفاقیو ناکۆکیو زۆر شتی تری لێ دەکەوێتەوە، بە حوکمی ئەوەی سەرکردایەتی جەماعەت کە لە بنەڕەتدا، لە جەرگەی ئەزموونێکی کردەیی سیاسییدا قاڵ نەبووەو ئەندامەکانی شارەزاییەکی سیاسی پێویستیان نییە، هەژموون بەسەر کارە سیاسییەکەدا دەکەن.

ئەوەش چەندین دەرهاویشتەی نێگەتیڤی لێ دەکەوێتەوە، لەوانەش:

١. نوێنەبوونەوەی قوڵی فیکری و درێژەدان بە هەمان ئەدەبیاتی ئیسلامی کۆنو بەسەرچوو لە چوارچێوەی جەماعەتدا، کە دەبێتە هۆی هەڵەکردن لە (تقدیر)کردنی هەڵوێستەکانو دیاریکردنی تاکتیكو ستراتیژ و هەنگاوو ئامانجەکاندا، هەروەها وادەکات کارە سیاسییەکە بەرچاو ڕوونانەو هارمۆنیانە بەرەو پێشەوە نەڕوات.

٢. لاوازی رەوایەتی حیزبە سیاسییەکە و گومانکردن لە دروشمو هەڵوێستەکانیو تۆمەتبارکردنی بەوەی کە هەرچی لەو رووەوە دەیکات تاکتیکێکی کاتییە، لەو سۆنگەوە کە جەماعەتێکی لە پشتە تاکو ئێستاش نوێنەرایەتی ئامانجو ستراتیژی رەوتی ئیسلامی دەکات، کە لە زیاد لە رووێکەوە کێشەی لەگەڵ پێویستییەکانی ژیانی سیاسی هاوچەرخداو بەتایبەتیش لە بەرگە دیموکراسییەکەیدا هەیە.

٣. دوای تێپەڕینی ماوەیەك و چاوکردنەوەی سەرکردەو کادرەکانی حیزبو هەستکردنیان بە جیا وازی کاری سیاسیو دەعەویو سنوورە داخراوەکانی (جەماعەت) ناکۆکی نێوان هەردوو لایەن لەسەر رۆڵ و

بڕیاری کۆتایی سەرهەڵدەدات. بە حوکمی ئەوەی سیاسییەکان وەك جاران بڕوایان بە عەقڵو سەلیقەی سەرکردەکانی جەماعەت نامێنێو خۆشیان دەبن بە ڕەمز دەناسرێنو لەڕووی سیاسیشەوە خۆیان لەوان لەپێشتر دەزانن، ئەمە جگە لەوەی مامەڵەی (جەماعەت) لەگەڵ حیزبدا بەجۆرێ لە مشتی ناسینو کولتوری گوێڕایەڵیو توندی بەکارهێنان دەبێت، کە هەموو ئەوەی پێشەوەش دەبێتە هۆی جۆرەها لێکترازانو نائومێدبوونو دەرچوونی تواناکانو سەرقاڵ بوون بە کێشەی ناوخۆییو لە هەندێ کاتو شوێنیشدا پاشەکشەی سیاسی، عێراق نموونەیەکی زەقی ئەو دۆخەیە.

(ج) هەڵاواردن (تمیز) لە نێوان حیزبو جەماعەتدا:

دیارترین نموونەی ئەمە (کۆمەڵی تەوحیدو ئیسلاح) و (پارتی دادو گەشەپێدانی) مەغریبییە.. ئەزموونی ئیسلامییەکان لە مەغریب (لەو چوارچێوەدا) بە چەندین خەسڵەت دەناسرێتەوە، کە لەلایەن ئیسلامییە عەرەبییەکانی تری ناوچەکە جیایان دەکاتەوە، لەوانەش:

(١) ئیلهام وەرگرتن لە ئەزموون و کەلەپوری جولانەوەی نیشتمانیو زانستی وڵاتەکەیان.

(٢) گونجاندنی ئەدەبیاتو کەلەپوری تەوژمی ئیسلامی جیهانی لەگەڵ واقیعی نیشتمانی مەغریبیدا.

(٣) خۆدابڕینو بڕوانەبوون بە چەمکی دەوڵەتی ئیسلامی بەو جۆرەی لە ئەدەبیاتی ڕەوتی ئیسلامی جیهانییدا خراوەتە ڕوو. کە تا

ماوەیەکی دوورودرێژ ناوەرۆکێکی شۆڕشگێڕانەو کودەتاییانەی لای زۆرێ لە رەوتە ئیسلامییەکان وەرگرتبوو.

(٤) سەرقاڵبوون بە بەرپاکردن (اقامة)ی ئاین لە کۆمەڵگەدا لەبری خۆخەریککردن بە بەرپاکردنی دەوڵەتەوە، واتە دەوڵەتی ئیسلامی.

(٥) هەر لە سەرەتاوە بە ئیسلاحی دەستپێکردن و درێژەپێدانی ستراتیژەکەو گەشەپێدانی لە قۆناغە جۆراوجۆرەکاندا، ئەم ستراتیژەش وای لێ کردن کە:

(أ) هەوڵی کارکردن لە ناو دامو دەزگاکانی کۆمەڵگەو دەوڵەتدا بدەن.

(ب) گرتنەپێشی چاکسازیی پلە بە پلەی.

(ج) دانەبڕان لە فیکری بەرامبەرو جیهانی بەبێ هەستکردن بە گرێی خۆ بەکەم زانین.

(٦) گواستنەوە لە رێکخستنی (جەماعەت)ەوە بۆ رێکخستنی پەیامدار (التنظیم الرسالي).

(٧) گواستنەوە لە یەکیەتی رێکخستنەوە (وحدة التنظیم) بۆ یەکیەتی پرۆژە، کە وادەکات ئامانجی سەرەکی بێتە گەیاندنی پەیام نەك کۆکردنەوەی زۆرترین لایەنگر، بەتایبەتیش لە هەندێ قۆناغدا.

(٨) گرێبەستی حیزب لەگەڵ (جەماعەت) لەسەر کۆمەڵێ ئامانجی هاوبەشە لەگەڵ پارێزگاریکردن لە سەربەخۆیی خۆی.

(٩) دیاریکردنی بواری کارکردنی حیزب بە سیاسەت و کایەی گشتی و کۆمەڵگە، بەڕێوەبردنی کاروباری بانگەوازیش بە سەربەخۆ و دوور لە فشار و جەبر و پێویستییەکانی سیاسەت.

**سیماکانی ئەم هەڵاواردنە (التمیز):**

ئەزموونی مەغریبیو پەیوەندی نێوان بزاڤە ئیسلامییەکە و حیزبە سیاسییەکە هەڵگری ئەم سیمایانەی خوارەوەیە:

یەکەم: سەربەخۆیی تەواوەتی دامو دەزگاکان، واتە حیزبو بزاڤ یاخود جەماعەت، کەسیان پاشکۆی ئەویدی نینو لەژێر هەژموونیدا کار ناکات. حیزب چوارچێوەیەکی پاڵپشتی سیاسییە بۆ بزاڤە ئیسلامییەکە، لەسەر ئاستی پرۆژە خاوەنی کۆمەڵێ ئامانجی هاوبەشن، هەروەها چوارچێوەیەکە بۆ ئەوەی ئەندامانی جەماعەت کاری سیاسی تێدا بکەن، بەڵام لەهەمانکاتدا بەرپرسو رەمزو کەسێتییەکانی (جەماعەت) بۆیان نییە لەسەر لیستی حیزب بۆ هەڵبژاردنەکان خۆیان بپاڵێون. بانگخوازو پەروەرشیار دەبێت خۆی یەکلایی بکاتەوە بۆ کارەکەی.

دووەم: بزاڤە ئیسلامییەکە (التوحید و الأصلاح) بایەخ بە کاری سیاسی راستەوخۆ و رۆژانە نادات و خۆی پێوە سەرقاڵ ناکات، بەڵکو بایەخ بە ئامانجە گشتییەکانی کاری سیاسی دەدات، لەوێنەی هاندانی خەڵك بۆ بەشدارییکردن لە هەڵبژاردنەکاندا، هەروەها هاندانی هاووڵاتیانو نوخبەی سیاسی بۆ دەستگرتن بە بەهاکانی روونی (شەفافیەت)و دەستپاکییەوە.

سێهەم: هاوبەشی (شراكة)ی حیزبو بزاڤە ئیسلامییەكە ڕێگا لەوە ناگرێت كە بزاڤە ئیسلامییەكە لەگەڵ بەشێ لە هەڵوێستە سیاسییەكانی حیزبدا ناكۆك بێت.

لەساڵی (١٩٨٨) وەرەقەی پەیوەندی نێوان بزاڤ (حركە)و حیزبیان دەركرد، كە ئەو كاتە حیزبەكە ناوی (بزووتنەوەی میللی دەستووریی دیموكراسی) بوو، بەگوێرەی بەڵگەنامەكە. حیزب لە ڕووی یاساییو كردەییەوە سەربەخۆیە، پەیوەندی نێوانیان: راوێژكردنو هەماهەنگیو هاوكاریكردنە لە چوارچێوەی ئامانجە هاوبەشەكاندا.

هەڵاواردن (تمیز)ی نێوان (بزاڤ )و (حیزب) سێ ئاست دەگرێتەوە:

- گوتار.
- ڕەمزەكان.
- شێوازی كاركردن.

هەردوولایان سوورن لەسەر ئەوەی مینبەرە سیاسی و دەعەوییەكان تێكەڵ بە یەك نەبن، میكانیزمێكیشیان لەم رووەوە بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجەیان و دوورخستنەوەی بانگەواز لە فشارو پێداویستییەكانی كاری سیاسیو بەشێ لە دەرهاویشتە نەرێنییەكانی، قەدەغەكردنی هەموو ئەو ئەندامانەی (جەماعەت)ەكە بەكاری وتاربێژیو وەعزو ڕێنوماییو بانگەواز لە مزگەوتەكاندا خەریكن، لە بوون بە ئەندام لەناو ریزەكانی پارتی (دادو گەشەپێدان) و هیچ حیزبێكی تردا.، هەروەها خۆنەپاڵاوتن لە هەڵبژاردنەكانو خۆدوورخستنەوە لە ململانێی سیاسی

ڕۆژانەو ڕاستەوخۆدا[1]. بە حوکمی ئەوەی گوتاری بانگخوازی لەسەر بناغەی ڕواندنی بەهاو نموونە باڵاکان وەستاوە، لەکاتێکدا گوتاری سیاسی پەیوەستە بە خەمەکانی ڕۆژو باس‌و خواسە گۆڕاوەکان، گوتاری بانگخواز هەوڵی بەدەستهێنان‌و کەمەندکێشکردنی دڵەکان دەدات، لەکاتێکدا گوتاری سیاسی ئامرازێکی کێبڕکێ‌و ململانێیە و هەوڵی سەرکەوتن‌و بردنەوە دەدات‌و هەر لەو چوارچێوەشدا دەڕوانێتە بەدەستهێنانی متمانەی جەماوەر، گوتاری بانگخوازی بە دەربڕینی پێشەوا نەورەسی ئامانجی ڕواندنی ئیمانە، مەبەستی هەرەبنەڕەتی خودی قورئانیش ئەوەیە کە بەرزترین هەستی ئینسانی لە دەروونی مرۆڤدا ببوژێنێتەوە لەمەڕ پەیوەندییەکانی ئەو، واتە مرۆڤ لەگەڵ خواو گەردووندا[2].

لەڕاستیدا ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە بە دەستپێکردن لە کۆتاییەکانی (حسن بەننا)و ئەزموونەکەی لەم بوارەدا دادەنرێت، کە بە ڕێبەرو باوکی ڕەوتی ئیسلامی نوێ لەقەڵەم دەدرێت، بەننا هەروەك لای دەگێڕنەوە لە کۆتاییەکانی ژیانی خۆی‌و لە بەرەنجامی تێکەڵکردنی بانگەوازەکەی بە ململانێ سیاسییەکان‌و ئەو دەرهاویشتە کارەساتبارانەی لای کەوتەوە گەیشتبووە ئەو قەناعەتەی بڵێ: ئەگەر ئەم ئەزموونەی ئێستام هەبووایە نەمدەهێشت (اخوان) تێکەڵ بە کاری

---

[1] سعدالدين العثماني/ التميز بين الدعوى و السياسي،.de https: liar.qanTara ٢٠١٦/٩/٢٠.

[2] محمد اقبال، تجديد الفكر الديني في الأسلام، مركز الناقد، ٢٠٠٨،ل٢٦٢.

سیاسـی ببێـت، چـونکه لـه کۆتـا رۆژەکـانی تەمەنیـدا هەسـتی بـه مەترسییەکانی رۆچوون له کاری سیاسـی لەسـەر پاشـەڕۆی بانگـەوازو تێکەڵکردنیانی کردبوو، بۆیـه بـه شـێخ محمـد غـەزالی بـرادەری وتبـوو: ئاوات دەخوازم بمتوانیایه بانگەواز بگێڕمەوه بۆ سەردەمی (مأثورات)[1].

[1] كمال ناجي القطوبي/ التميز بين السياسي و الدعوي، خطـوة نحـو التخـصص، Islamonline ٢٥/يوليو/٢٠١٦

# سەرچاوەكان

## یەكەم: بە زمانی عەرەبی:

١. القرآن الكريم.

٢. أ محمد جبرون، مفهوم الدولة الأسلامية أزمة الأسس و حتمية الحداثة، المركز العربي للأبحاث و دراسة السياسات، بيروت، ٢٠١٤.

٣. أبو الأعلى المودودي/ نظرية الأسلام و هديه في السياسة و القانون و الدستور، دار الغد، ١٩٦٩.

٤. أبو الأعلى المودودي، الحكومة الأسلامية، ترجمة أحمد ادريس، دار السعودية للنشر و التوزيع، ١٩٨٤.

٥. أبو الأعلى المودودي، نحن و الحضارة الغربية، مؤسسة الرسالة. بێ ئاماژەكردن بە ساڵی چاپكردن.

٦. أبو الحسن علي الحسني الندوي، التفسير السياسي للأسلام، دار البشائر، بيروت، ٢٠١٤.

٧. أسعد مفرّر و لجنة من الباحثين، موسوعة عالم السياسة، تعريف الشامل بالسياسة فيكراً و ممارسةً، بيروت، ج/٢٢.

٨. أنور جندي، سقوط القومية الوافدة، دار الأنصار. بێ ئاماژەكردن بە ساڵی چاپكردن.

٩. بديع الزمان سعيد النورسي، صيقل الأسلام، ترجمة و تحقيق احسان قاسم الصالحي، الطبعة الخامسة، شركة سوزلر للنشر و التوزيع، ٢٠٠٨.

١٠. حسن البنا، مجموعة رسائل، الطبعة الأولى، مطبعة نهضت،طهران، ١٣٧٥ك.هـ.

١١. خيرية عبد الصاحب الوادي، الفيكر القومي العربي في المغرب العربي، دار الرشيد للنشر،١٩٨٢.

١٢. د. توفيق يوسف الواعي، الفيكر السياسي المعاصر عند الأخوان المسلمين، مكتبة منار التلفزيونية، كويت:٢٠٠١.

١٣. د. جاسم سلطان، أزمة التنظيمات الأسلامية، الطبعة الأولى، الشبكة العربية للأبحاث و النشر، ٢٠١٥.

١٤. د. حسن ترابي/ خواطر في الفقه الاسلامي لدولة اسلامية معاصرة، الطبعة الأولى،٢٠٠٥

١٥. د. سعدالدين العثماني، في فقه الدين و السياسة، الطبعة الأولى، الأنتشار العربي، صناعة الفيكر، بيروت، ٢٠١٣.

١٦. د. سعيد بنسعيد العلوي، أدلجة الأسلام بين أهله و خصومه، الطبعة الأولى، رؤية للنشر و التوزيع،٢٠٠٨.

١٧. د. سعيد بنسعيد العلوي، الفيكر الأسلامي في المغرب المعاصر، دار المدار الأسلامي، ٢٠٠٧.

١٨. د. محسن عبد الحميد، المذهبية الأسلامية و التغير الحضاري، الطبعة الرابعة،١٤٢٠ هـ.

١٩. د. محمد سليم العوّا، في النظام الأسلامي للدولة الأسلامية، دار الشروق، ١٩٨٩.

٢٠. د. هبة رؤوف عزت، الخيال السياسي للأسلاميين ما قبل الدولة وما بعدها، الشبكة العربية للأبحاث والنشر، ٢٠٠٥.

٢١. د. يوسف القرضاوي، الأخوان المسلمون (٧٠) عاماً في الدعوة والتربية والجهاد، الطبعة الأولى، مكتبة وهبة، القاهرة، ١٩٩٩.

٢٢. الدكتور رضوان السيد، الأسلام المعاصر مراجعات و متابعات، دار الكتاب العربي، الطبعة الأولى، ١٩٩٧.

٢٣. الدكتور أحمد فهد بركات، محمد رشيد رضا ودوره في الحياة الفيكر ية و السياسية، دار عمّار، ١٩٨٩.

٢٤. الدكتور عبدالاله بلقزيز، الدولة في الفيكر السلامي المعاصر، الطبعة الثانيـة، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ٢٠٠٤.

٢٥. الـدكتور عبـدالرزاق الـسنهوري، فقـه الخلافـة وتطورهـا، ترجمـة د.ناديـة عبدالرزاق السنهوري، الهيئة المصرية العامة للكتاب، ١٩٩٣.

٢٦. الدكتور عبدالوهاب المسيري، الهوية والحركـة الأسـلامية وسـؤال. حـوارات، تحرير: سوزان حرفي، دار الفيكر دمشق، دار الفيكر المعاصر، بيروت، ٢٠٠٩.

٢٧. الدكتور عمـر سـليمان، حكـم المـشاركة في الـوزارة والمجـالس النيابيـة، دار النفائس، عمّان، ٢٠٠٨.

٢٨. دكتـور فـؤاد محمـد النـادي، موسـوعة الفيكـر الـسياسي ونظـام الحكـم في الأسلام، الطبعة الأولى، جامعة صنعاء، ١٩٨٠.

٢٩. الـدكتور محمـد صـالح المراكـشي، الأيدولوجيـة والحداثـة عنـد رواد الفيكـر السلفي، دار المعارف.

٣٠. الدكتور محمد عابد الجابري، الدين والدولة وتطبيق الشريعة، مركز دراسـات الوحدة العربية، ١٩٩٦.

٣١. الدكتور يوسف القرضاوي، التربية الأسلامية ومدرسـة حـسن البنـا، چـاپى يەكەم، نهضت، قم.

٣٢. دكتـور يوسـف القرضـاوي، الحلـول المـستوردة وكيـف جنـت علـى أمتنـا، الطبعة السادسة، مكتبة وهبة، القاهرة، ٢٠٠٦.

٣٣. الدكتور يوسـف القرضـاوي، الـدعوة الأسـلامية بـين الجحـود والتطـرف، الطبعة السادسة، ١٩٩٦.

٣٤. الدكتور يوسف القرضاوي، أولويات الحركـة الأسـلامية في المرحلـة القادمـة، الطبعة الخامسة، ٢٠٠١.

٣٥. الدكتور يوسف القرضاوي، شمول الأسلام، الطبعة الثالثة، مطبعة المـدني، القاهرة، ٢٠٠٣.

٣٦. رفاعة الطهطاوي، مناهج الألباب المصرية في مباهج الآداب العصرية، المجلس الأعلى للثقافة، مصر. بێ ئاماژەكردن به سالّی چاپكردن.

٣٧. سيد قطب / معالم في الطريق، دار الكتاب الأسلامي، قم، الطبعة العاشرة، ١٩٨٣.

٣٨. سيد قطب، المستقبل لهذا الدين، دار الشروق. بێ ئاماژەكردن به سالّی چاپكردن.

٣٩. عبدالاله بلقزيز، الخطاب الأسلامي في المغرب التكوين والمصادر، دار المنتخب العربي، الطبعة الأولى، ١٩٩٩.

٤٠. عبدالرزاق عيد، محمد عبدة امام الحداثة والدستور، معهد الدراسات الأستراتيجية، الطبعة الأولى، ٢٠٠٦.

٤١. عبدالقادر عودة، الأسلام وأوضاعنا السياسية، مؤسسة الرسالة، بيروت، بێ ئاماژەكردن به سالّی چاپكردن.

٤٢. عبدالقادر عودة، الأسلام وأوضاعنا القانونية، مؤسسة الرسالة، الطبعة الثانية، ١٩٦٧.

٤٣. عبدالله ناصح علوان، القومية في ميزان الأسلام، دار السلام. بێ ئاماژەكردن به سالّی چاپكردن.

٤٤. فتحي يكن، ماذا يعني انتمائي للأسلام، مطبعة نهضت، طهران، ١٣٦٩ ك.هـ .

٤٥. فتحي يكن، أبجديات التصور الحركي للعمل السلامي، انتشارات مدين، قم، ١٤١١ هـ.

٤٦. فتحي يكن، العالم الأسلامي والمكائد الدولية خلال القرن الرابع عشر الهجري، مؤسسة الرسالة، بيروت.

٤٧. لؤي صافي، العقيدة والسياسة، المعهد العالمي للفيكر الأسلامي، الطبعة الأولى،١٩٩٦.

٤٨. مجموعة من الباحثين/ جمال الدين الأفغاني عطاؤه الفيكري ومنهجه في الأصلاح، حلقة دراسية، المعهد العالمي للفيكر الأسلامي، ١٩٩٩.

٤٩. مجموعة من الباحثين، الأسلاميون ونظام الحكم الديمقراطي، المركز العربي للأبحاث و دراسة السياسات، بيروت، ٢٠١٥.

٥٠. مجموعة من الباحثين، الأسلاميون والحكم في البلاد العربية وتركيا، مركز الدراسات الدستورية و السياسية، مراكش، ٢٠٠٦.

٥١. مجموعة من الباحثين، الأسلاميون والمسألة السياسية، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت،٢٠٠٣.

٥٢. مجموعة من الباحثين، الحركات الأسلامية في الوطن العربي (مجلدين) اشراف د. عبدالغني عماد، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ٢٠١٣.

٥٣. مجموعة من الباحثين، الحركة الأسلامية رؤية نقدية، الطبعة الأولى، الأنتشار العربي، صناعة الفيكر، ٢٠١١.

٥٤. مجموعة من الباحثين، ترجمة محمد فاضل، الأسلام على مفترق الطريق، رحلة في حياة وفيكر بديع الزمان سعيد النورسي، شركة سوزلر للنشر، ٢٠٠٥.

٥٥. محمد اقبال، تجديد الفيكر الديني في الأسلام، مركز الناقد، ٢٠٠٨.

٥٦. محمد باقر الصدر، الأسلام يقود الحياة، طهران، ١٤٠٣ هـ.

٥٧. محمد قطب، مذاهب فيكرية معاصرة، دار الكتاب الأسلامي، قم. بێ ئاماژەكردن به ساڵی چاپكردن.

٥٨. المستشار طارق البشري، الملامح العامة للفيكر السياسي الأسلامي في التأريخ المعاصر، دار الشروق.

٥٩. مصطفى مشهور، طريق الدعوة، دار التوزيع و النشر الأسلامية، ١٩٨٩.

٦٠. وائل الحلّاق، الدولة المستحيلة، الأسلام و السيادة ومأزق الحداثة الأخلاقي، ترجمة عمرو عثمان، الطبعة الثالثة، المركز العربي للأبحاث ودراسة السياسات، بيروت، ٢٠١٥.

٦١. وجيه الكوثراني، الدولة والخلافة في الخطاب العربي ابّـان الثـورة الكماليـة في تركيا، دار الطليعة، بيروت.

٦٢. خديجة النبراوي، دور كليـات رئاسـل النـور في يقـضة الأمـة، الطبعـة الأولى، مطبعة المدني، القاهرة، ١٩٩٨.

## دووەم: سەرچاوە فارسییەکان:

١. ابـو الأعلـى المـودودي، خلافـت و ملوكيـت، مطبعـة دار العروبـة، لاهـور– منصورة، ١٩٨٣.

٢. ابوالقاسم فنائى، اخلاق دين شناسـى پـژوهى در مبـانى معـرفتى و اخـلاق فقه، نشر نگاه معاصر، تهران، ١٣٨٩ هـ. ش.

٣. عبدالكريم سروش/ فر به تراز أيدئولوژى، چـاپ هـشتم، مؤسـسة فرهنگـى صراط، تهران، ١٣٨٤ هــ ش.

٤. عبدالكريم سـروش/ قـصة أربـاب معرفـت (دفـتر تخـست) چـاپ شەشـەم، ١٣٨٤ ك.هـ.

## سێهەم: سەرچاوە کوردییەکان:

١. ئەبوبەکر عەلی، داعـش لـە نێـوان تونـدڕەوی ئـاینیو شکـستی دەوڵەتـدا، هەولێر، ٢٠١٥.

٢. ئەبوبەکر عەلی، ئیسلامی بوون لە قۆناغی پاش ئیسلامی دا، سلێمانی، ٢٠١٦.

٣. ئەبوبەکر عەلی/ دەوڵەتی ئیسلامی فۆرمێکی شکستخواردووی عـەلمانی ناوچەکە، گۆڤاری خاڵ ژمارە (٧) تشرینی یەکەمی ٢٠١٦.

٤. شـێروان شـەمێرانی، ڕەهەنـدی ئـاینی و سیاسـی لـە کـاری ئیـسلامی دا، سلێمانی، ٢٠١٣.

٥. راشد غەننوشی، چاوپێکەوتنی (BBC.Arabik) ٢٠١٦/١٢/١٦

## چوارەم: ماڵپەڕ و سەرچاوە ئەلیکترۆنییەکان :


١. اخوان سوريا ((أربع استراتيجيات لأعادة الموضع)) جزيرة نت، ٢٠١٦/١٢/٦.

٢. www.fekr_online.com .. اغسطس /٢٠١٤.

٣. أدلجة الأسلام alwaTan.com ، ٣٠ / سبتمبر/٢٠١٦.

٤. الحركات الأسلامية ... و اختزال الأسلام، المجلة. www. Islam .Today. Net

٥. د. محمد حبيب/ الدعوى و السياسي، www.VeTogoTe.com سێشەممە، ١٧/ يونيو/٢٠١٦

٦. د. محمد عبدالجبار الرفاعي، چاوپێکەوتن، مركز الآفاق للدراسات و البحوث،. com qataqenTer ٢٠١٥/٣/٦.

٧. د. هبة رؤوف، ما بعد الأسلاميون: نظرة نقدية، areax.facebook.com

٨. الدعوة الى الله من تراث الأمام و سيرته (عبدالسلام ياسين) www.yassine.net يناير/٢٠١٤

٩. الدكتور جيلانى أبوبكر/ أسئلة الفيكر الأصلاحي المعاصر، almoTHaqaF.com

١٠. سعدالدين العثماني/ التميز بين الدعوى و السياسي،. https: de liar.qanTara ٢٠١٦/٩/٢٠.

١١. سلطان العاقل/ الدين بين الأدلجة و الأيدولوجيا. Aljasad.org ٢٠٠٧/٥/٧ .

١٢. طه جابر العلواني/ الأسلاميون بين الدعوة و الدولة، www.vouyaturIcciyyoh.com

١٣. عامر محمود/ چاوپێکەوتن لەگەڵ غەننوشی، الفجر نيوز، ٢٠٠٩/١٢/٢٥.

١٤. الفصل بين الدعوي والسياسي ( ٢/٤) مفهوم الفصل و مشروعيته، dazat.com I٢٠١٦/٦/٧

١٥. كمـال نـاجي القطـوبي/ التميـز بـين الـسياس والـدعوي، خطـوة نحـو التخصص، ٢٥ Islamonline/يوليو/٢٠١٦

١٦. مابعد الأسلاميون: الأوجه المتغيرة للأسلام السياسي (كتاب) عرض: محمد مسعد العربي. Stadieseqjazeera.net، سێشه‌ممه : ١٨/نوفه‌مبه‌ر/٢٠١٤

١٧. مفهوم الدعاية www.Tellskuf.com، ٢/نوفمبر/٢٠١٠.

١٨. نـادر كـاظم/ أدلجـة الـدين و ادلجـة الحداثـة، الأبـتلاء بـالغرب www.alwasaTnews.com پێنج شه‌ممه.. ١٨/مايو/٢٠٠٦